٢

# پێداچوونەوە

بزوتنەوەی نیشتمانی کورد

لە

کوردستانی ئێران

١٩٤٧ - ١٩٧٨

کەریمی حسامی

# پێداچوونەوە
## بەرگی دووەم

کەریمی حسامی

ستۆکهۆڵم ١٩٩٧

# PEDA CHUNEVE

## RE EXAMINING
## A PERIOD OF KURDISH HISTORY
## IN IRANIAN KURDISTAN
## 1978-1947

**Volyme 2**

**BY**

**KARIM HUSSAMI**

**1997**

**KITAB-I ARZAN**

ISBN 91 88880 23 0

* پێدا چوونەوە بەرگی دووەم (بزوتنەوەی نیشتمانی کورد لە

کوردستانی ئێران ١٩٤٧ - ١٩٧٨)

* کەریمی حسامی

* پیت‌چنین و مۆنتاژ: ناسری ئێبراهیمی

* چاپخانەی کتێبی هەرزان ،چاپی یەکەم ،سوید ١٩٩٧



---

**KITAB-IARZAN**
**Barnarps g 31**
**553 16 Jönköping/Sweden**
**Tele:+46 (0)36 148031**
**Telefax:+46 (0)36 710999**
**Mobil:+46 (0)70 492 69 24**

# پێشەکی

لەسەر بەسەرهات و ڕووداوەکانی نیوسەدەی دوایی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، لەکوردستانی ڕۆژهەلات هیچ شتێکی تێرو پڕوپاپەتی نەنووسراوە. ئەگەر تەک وتوک لەملاولا بەناوی کتێب و یا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا باسێک لەم بوارەدا نووسرابێ، بەشی زۆری پڕوپاگاندەی حیزبی بوە، نەک شیکردنەوەی زانستی ڕووداوەکان وهەڵسەنگاندنی هەڵس وکەوتی تێکۆشان وناکرێ بە مێژوو حیساب بکرێ، چونکە شتێکی حکوومەت و حیزبەکان بەناوی مێژوووبینووسن. دەیکەنە ئامرازی سەلماندنی ئامانجی خۆیان و پەسن و پێهەلاگوتنی کار و سیاسەتیان و چاونووساندنی خەلکی سادە و بێ دەسەلات. هەربۆیەش زۆر لەو نووسراوانەی بەناوی مێژوو لە سەردەمی پاشایەک و یا دیکتاتۆرێک و یا حیزبێکی دەسەلاتداردا نووسراون. دەبینی پاش ماوەیەک کە کابرا لە دەسەلات دەکەوێ، نووسینەکەی ومێژووەکەی هەلدەگەڕێتەوە و دەخرێتە زبلدانی مێژووەوە. لەلایەکی دیکەشەوە زۆربەی نووسەرانی بێگانەش کە لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان دەنووسن، لەگەل ئەوەی کە زەحمەتەکەیان جێگای سوپاس و پێزانینە، بەلام دیسان ناکرێ بۆچوون ونووسینی ئەوانیش بێ کەم وکوڕی دابنرێ. چونکە : یەکەم: لە کوردستان دوورن و لەنێو ڕووداوەکان نین و لە نووسینەکەیان ئاماژە بۆ هیچ سەرچاوەیەکی کوردی ناکەن.

دووەم: شارەزای زمان ونووسرای کوردی نین، ئەوان زۆرترئاگاداری خۆیان لەخەلکی جۆربەجۆر وەردەگرن کە یان ئاگاداری مەسەلەکان نین و یان بەگوێرەی ویستی خۆیان،بۆیان باس دەکەن.*

---

* نموونەی زۆرزەق لەم بوارەدا هێندێ نووسینی ڕۆژنامەنووسی ناسراوی فەرەنسەیی ئاغای (کریس کوچرا)یە کە کراوەتە فارسی وبەکوردیش شێوانووویانە ناوبراو دەنووسی: ..... سالی ١٩٥٦ حیزبی =

سێ یەم: زۆرجار لە بێلایەنی دەردەچن و تارمایی لایەنگری لە سیاسەت و لە لایەنێک لە نووسراوەکانیاندا بەرچاو دەکەوێ.

دەمێک بوو پێوە بووم بەڵکوو دەرفەت بێنم بەسەر بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لە کوردستانی ئێراندابچمەوە. فیداکاری و نیشتمانپەروەری هێندێ کەسی باس نەکراو ونەناسراو بخەمەروو. هەرلەو کاتەشدا بە بۆچوونێکی نوێ وبەشێوەیەکی بابەتی بەگوێرەی توانا بزووتنەوەی ساڵەکانی ١٩٤٢- ١٤٩٦و دامەزرانی کۆماری کوردستان شی بکەمەوە وهێندێ کەم وکوڕی وناتەواوی چەند نووسراوەیەک راست کەمەوە کە بە هەموو تواناوە بۆهێنانە خواری پلەو پایەی کۆماری کوردستان هەوڵ دەدەن و دەیانەوێ ئەم کۆمارەو ئەم تاقە دەسەلاتەی رەسمی کورد لە جوار چێوەیەکی لەق ولۆقی خۆدموختاری داقەتیس بکەن. گوێش نەدەمە هێندێ کەسی لوت بەرزی بەناو روناکبیر کە لەرۆژی تەنگانەی میللەتەکەیاندا بەهەزار رێگای رەواو نارەوادا، فیزماڵکی دەدەنێ و خۆدەگەیێننە ئوروپاو دەدوازدە ساڵ بە ناوی گۆیا وەرگرتنی شەهادەی (دوکتورا) بەزمانێکی ئوروپایی کە قەت کورد تێی ناگا چەندەراستەو چەندە نرخ وبایەخی هەیە فریان سواردەبێ ولایان وایە.... فیلیان شکاندوە بێ ئەوەی بەرهەمێک لە مەڕ دەردو ژانی نەتەوەکەیان ولە سەر جنایەت وزۆرداری دیکتاتۆرەکانی داگیرکەری کوردستان بنووسن لە ئوروپا گەڕدەخۆن ونەگەرکەسێکی دیکەش بێ ئەوەی ئیدیعایەکی هەبێ لە رووی دڵسۆزی وهاودەردی لەگەڵ نەتەوەکەی شتێکی نووسی و بەرهەمێکی پێشکێشی کتێبخانەی کوردی کرد، لە جیاتی ئەوەی هانی بدەن، ژان دەیانگرێ و لە دەرفەت دەگەڕێن تا بە لاتاو و بە فەرمایشتی بێخوێ بەهیچی دابنێن. ! !

---

= دێموکراتی کوردستانی ئێران هەوەڵین بەرنامە پالەراستیدا هەوەڵین (پێشنووسی بەرنامە )ی خۆی پاش بەرنامەی حیزبی دێموکراتی قازی محمد بلاو کردەوە. (١)

• ... ساڵی ١٩٦٩ لەکۆنفرانسی حیزبی دێموکراتی کوردستان کەلەلایەن هێمن وهێندێکی ترلەکادرەکانیاشماوەی حیزب لەکوردستانی عیراق ساز کرابوو. عەولای ئیسحاقی کەئەودەم بەتەواوی لەبەرچاوی بارزانی کەوتبوو، لەحیزب دەرکرا.(٢)

هەرچۆنێک بێ لە ماوەی نێوان بەرهەمهێنانی بەرگی ٩و١٠ی بیرەوەریە کانمداخۆم لە قەرەی ئەو کارەش داو(پێداچوونەوەیەکی) چەند لاپەرەییم لە سەر بزووتنەوەکانی سەردەمی رەزاشاو کۆماری کوردستان ئامادە کرد. هەرچەندە پێم وایە سەبارەت بە نەبوون و دەست پێڕانەگەیشتنی بەڵگەو دۆکۆمێنتی تەواو هێشتا زۆری ماوە ئەم باسە مافی خۆی بدرێتێ و بەداخەوە تەم توانیوە نیشانە بپێکم.

لە ٨٩/٢/١٣ غەنی بلوریان لە نامەیەکدا بۆی نووسیبووم:« من هێندێک بەڵگەی زەمانی ژ.ک لەسوێت هاتوتە دەستم لام هەیە بەڵام ناکرێ بە پۆستەدارەوانە بکرێ ئەگەر کەسێکی جێگای متمانەم دەست کەوێ بۆتی رەوانەدەم». زۆر چاوەروان بووم، دیاربوو کەسی(جێگای متمانە)ی دەست نە کەوتبوو بۆم(رەوانەدا)! تا١٢ی ئەپریلی ١٩٩٥کە بۆ بەشداری لە ئاهەنگی کردنەوەی پارلمانی کوردستان چووبوومە هوڵەند لە لاهە، لە گەرانەوەدا لە گەڵ کاک شێخ عەلی برادەرو دۆستێکی کوردستانی خواروو دەگەڕاینەوە باسی نووسینمان دەکرد. پرسی: «چیت بەدەستەوەیە؟» باسی نووسینەکەی خۆم بۆکرد. گوتی:« هێندێ بەڵگەی کۆمەڵەی ژ، کافم لەلایە و غەنی بلوریان لەلای داناوم و گوتوویە مەیاندە بەکەس.» گوتم ئەگەر وایە من نووسینی ئەم باسەم بەدەستەوەیە تکایە بۆ منیان بنێرە

---

• ....ئەندامەکانی کرنکی، کومیتەی شۆرشگێڕ مریتی بوون لە سلیمان وعەولای موعینی(کورانی وەزیری نێوخۆی کۆماری مەهاباد) ومحەمدامین رونوعبدالرحمان قاسملو(کەئەودەم لەئوروپابوو) ، (٢)

• ... کۆنگرە بەتێکۆشانی عەولای ئیسحاقی قازی محەمدی بەتاوانی(خەیانەت) وپێشکەوتنخوزانی کومیتەی ناوەندی ١٩٥٤ بەتاوانی (کەجرەوی) مەحکوم کرد، (٤)

.... رەحمانی زەبیحی کوری سەوداگەرێکی فەقیربوو لەپۆلی سێیەمی ناوەندی دەست لەخوێندن هەڵگرت وبووبەماموستای منداڵانی خاوەملکە دەولەمەندەکانی ناوچەوئەوخوێندنی زمانی کوردی فێری هەژارکربوە کەپشان لەگەڵ هێمن بوون بەدووشاعیری گەورەی هاوچەرخی کورد. (٥)

.... شێخ ئەحمەد پاش هاتنی بۆنێران لەگەڵ ٦٠٠چەکدار لەدەوروبەری ئەغەدە نیشتە جێ بوو،تاکۆتایی کاری کۆماری مەهاباد هەرلەوێ مایەوە. کیژی یەک لەسەرۆکانی قەرەپەپاخی خواست کەکوردنین وجلی کوردی لەبەردەکەن، (٦)

ئەوانە نموونەی بچوک بوون لەنووسراوەی مێژوو نووسێکی بێگانە کەبێ ئەوەی ئامازە بۆسەرچاوەیەک بکات ریزی کربوون کە هیچیان واتێن وەک باسکراون.

باکەلکیان لێ وەرگرم. بە مامە غەنیش بێژە بۆ قلانکەسم ناردوون. خۆشی کاتی خۆی بەڵێنی دابوو کە بۆم بنێرێ. شێخ عەلی برادەر سەرزارەکی بەڵێنێکی دابەلام لە هەوای زاری دیاربوو وەک ئەو دەمە نەبوو کە ئەندامێکی حیزبی کۆمۆونیستی عیراق و دۆستایەتیمان برایانە بوو، وەک لە نامەیەکدا بۆی نووسیوم و لە بەرگی ١٠ی بیرەوەریەکانمدا بلاو کراوەتەوە، بۆ نووسینی تێزی دوکتوراکەی داوای کتێبی لێکرد بووم، بە دڵەوە بۆم نارد بو. ماوەیەک چاوەڕوان بووم ،شێخ عەلی نەک هەر هیچی بۆ نەناردم بەڵکوو هەرخەبەرێکیشی لێ نەگێڕامەوە. من وەدڵم نەگرت وگلەییم لە هیچیانیشیان نەکرد. ئاخرئەوە نیە ڕۆژگارو سەردەمی یادانەوەیە.!!

هیوایەکی دیکەم بۆ وەدەستهێنانی بەڵگەو دۆکۆمێنت لە سەر کۆمەڵەی ژ.ک وکۆماری کوردستان شادەوان دوکتۆررەحیمی سەیفی قازی بوو. داوام لێکردبوو لە سەر ڕووداوەکانی سالانی ١٩٤٢ــ١٩٤٦ی کوردستانی ڕۆژهەلات شتێکم بۆبنێرێ. لام وایە لە باکو بەڵگەو نووسراوە لە سەرئەم بابەتە وەگیردەکەوێ. بەداخەوە لەوێش هیچم دەستگیرنەبوو هەرچەند بەڵێنیشی دابوو. ناچاریەنام بردە بەرکاک سلیمانی چیرە(هێرش)، ئەودەم لە باکو بوو نە گەل دوکتور رەحیمی قازیش نێوانی خۆش بوو. ئەویش دوای ماوەیەک بەناردنی ئەم نامەیەی خوارەوە ئاوێکی پاکی بە دەستی داکردم. ئەمەش نامەی کاک سلیمانی چیرە:

« برای بەرێزو خۆشەویست کاک کەریم وێرای سلاوێکی زۆردوراودوور چاوەکانت ماچ دەکەم و هیوادارم ساغ وسلامەت بیوچ نارەحەتێکتان نەبێت.. تکایە سلاوی من بەهەموو کارگێران و بەرێوەبەرانی« سەردەمی نوێ » بەتایبەت کاک دوکتور بگەیەنەو داوای سەربلندی و بەختیاریان بۆدەکەم. پێش هەمووشت با ئەوەتان عەرزبکەم کە ئەگەر جوابی نامەکەتان وەدرنگی کەوت سەرەڕای شەرمەزاری بەلام سووکە سەفەرێکم بۆبیرلێن کردو لەوێ نەخۆش کەوتم و لە گەڕانەوەدا لە پایتەختی دنیای ئاشتی بە داخەوە تالان کراین و پاشان کاڵەمان دڕاوچمان پێ نەبڕا. تائەو ڕۆژانە هەرنەخۆش بووم ئێستا هەستاومەوە حاڵم

باشه. له جێکادا بووم که خێزانم چوه پۆستی و دیاریه بەنرخەکانی دامەدەست. ئەگەر راستیت دەوێ نەخۆشی و کلۆلیم له بیر چووەو یەک جێ قیت بوومەوە.

ئای نازانی ئەم دیاریانەت چ حاڵ و هەوایەکی پێدام. هەرلە حەوای بەهەڵپە هەڵپ فوستمنەوە. کاکە گەزگەز تێهەڵچوومەوە و بڕبڕ بوژامەوە. بەراستی دەست و قەڵەمت خۆش. گوتم شەرتە تانەیانخوێنمەوە جوابەکەیان نەنووسمەوە. وابوو ئەوەش خۆی نەختالێک جوابەکەیان وەدرنگی خست.

به هەرحاڵ بژی خۆت و دەستە گەوهەراویەکەت و قەڵەمە گوێتەکەت. هیوادارم بەو زوانە دەستی جلەوی قەڵەمە کوێتەکەت شل نەبێتەوەو پێی ئاوزەنگی لێنکدانت سست نەبێ و تا سالانی ساڵ لە گوڵزاری کەسک وەنگینی کوردەواریدا لە پێناو مافی پێشێلکراوو لەئاست نوژمنانی گەل و نیشتمان. خۆشڕەوانەو سەرکەوتوانە شەرناخێوی پێ بکەیت. تو خواکەی جارو بارهەر وابەسەرمان بکەوەو لە دیاریە بەنرخەکانت بێ بەشمان مەکەن. ئێمەش کە پیاوبین لە چاوماندا دەمێنێ. بۆ ئەو شتانەی کە داواتان کردوە، شەرت بێ بە شەرتی پیاوان ئەوەی لە دەستم بێ دریغی نەکەم. هەر چەندە لە هەوەڵیدا تەواو قەولت پێ نادەم نەکا دوایی شەرمەزار ببمەوە. بەڵام حەولی خۆم دەدەم. هەروەک دەزانی ماودیەک بوو زانکوو مانگو تەعتیل بوون. ئەوا ئەو رۆژانە بەشوێنی ئەوکەسانەدا دەگەڕێم کە لە خاوەر شناسیدا کار دەکەن. رەنگە بتوانین شتێک بکەین. گوتبوت دوو جارم بۆ دوکتور نووسیوە بێجواب ماومەوە. کاکە ئەو دوکتورەش عەجایبە. هەرئێمە دەچینەلای قەت نەبوە جارێک سەرمان لێ وەژووری بنێ. بەهەر حاڵ دەڵێی چی، هاوشاریەو ردێن سپی. ئەگەر چی ماودیەکە لێکدا لێکدا دەچێتە خەستەخانەو ماودیەک لە مەو پێش ئەودیەکی ئەتو سلامەت، لە بەرئەوە نەختالێک وەزعی نە بارنیە. بۆ ئەم کارە سەرێکی لێدەدەم هەرچی بێ ئەویش لەوێ ناسراوە....»

به داخەوە لە لایەن کاک سلیمانیشەوە هیچم بەدەست نەگەیشت. بەناچاری هەربەم کەرەسەو ئامرازە کاڵ وکرچانەی ئامادەم کردبوون. ملم دەبەرناو بەرگی یەکەمی پێداچوونەوەم خستە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێزو کەلێنی کتێبخانەی

کوردی. بێگومان نە پێداچوونەوەو نە ئەو کارەی ئێستاشم وەلامدەری ئەو ڕووداوە گرنگەی مێژووی بزووتنەوەی کوردلەم بەشەی نیشتماندا نین. ئەم نووسراوانەی من بە مێژوو حیساب ناکرێن. لە بەرگی یێکەمی(پێداچوونەوە)دا گوتوومە و دووپاتی دەکەمەوە مێژوو نووسین کاری زانایانی مێژووناسە ولێکۆلینەوەو توێژینەوەی دەوێ . بەلام زاناو خوێنەری ئەوتۆی کوردیش کەم نین کە بەچاوی لوتف وکەرەم و لێبووردن بڕواننە کەم و کوڕی ئەم جۆرە نووسینانە و بە دلێکی فراوانەوە هەلەکانیان بۆ ڕاستکەنەوە. دەکرێ بە قەولی (گابریل گارسیا مارکز) نووسەری بە ناوبانگی کولومبیایی ئەم جۆرە نووسینانە بە ڕاپۆرتی ڕووداوەکان دابنرێن. ناو براو دەلێ:« ڕاپۆرت لە ڕوانگەی منەوە شێوەیەک لە ئەدەبیاتە کە بە داخەوە لە جیهاندا بەرەو نەمان دەڕوات و ئەم کارە من ئازار دەدات. چونکە بۆ من ڕاپۆرت نووسی بەرزترین شکلی ڕۆژنامە نووسی یە و بە واتایەکی ترمێژوویەکی تەواوە. خوێنەر بە خوێندنەوەی ئەو هەست دەکا کە خۆی لە شوێنی ڕووداوەکاندا ئامادەبوە.» با ئێمەش هیچ نەبێ ئەم نووسراوە یە بە ڕاپۆرتی کارەسات و ڕووداوەکان دابنێین کە خوێنەری کورد و بەتایبەت لاوانی تازە پێگەیشتوو لە ڕەوەندی ڕووداوەکانی نیزیک ٥٠سالی دوایی کوردستانی ئێران ئاگادار دەکا. بە هیوای چاوپۆشی لە کەم وکوڕی یەکان.

ئێمە دەبێ باسی ئەوشتانە بکەین کە دەیانزانن، بەلام توانایان نییە دەریان ببڕن وناوێرن ویا نایانەوێ باسیان بکەن.
تۆلستۆی

دیارە خەباتی گەلی کورد لەم بەشەی نیشتمانیشدا هەر وەک بەشەکانی تر بە ڕاستەڕێگاو بە شەقامی بێ خوارە پێچەدا تێنەپەڕیوە. ڕێگای بەردەلان وکەند و کۆسپی سەر ڕێگا ئەوەندە زۆر بوون کە هەلسەنگاندن و لێک هەلاواردن و ساخکردنەوەیان لە ڕادە بەدەر دژوار و ئەستەمە. بەلام وازلێهێنان و خستنە پشت

گۆیی ڕووداوەکانی خەبات و تێکۆشانی ئەم ٥٠ساڵەی دواییش. خۆی کارێکی ڕەواو دڵسۆزانە نیە. بە تایبەت لەم بوارەدا هێندێ شتی هەڕەمە نووسراوە و بابەتی ڕووداوەکان یا خراونەتە پشت گوێ و یان ئاوازوو کراونەوە. خەڵکێکی زۆریش بەم نووسینە ڕەمەکی یانە گۆش کراوە. ئەوەش نەک هەر لە کوردستان بەڵکوو لە هەر وڵاتێکی مێژوو بە دەستی حیزب و حکوومەت و زۆرداران نووسرابێ. کراوەتە ئامرازێک بۆبەرپەرچدانەوەی موخالیفانوبۆ شێواندنی ڕاستی ڕووداوەکان. لەم جۆرە نووسینانەدا زۆر زەحمەتکێشی تێکۆشەر و قارەمان بزر دەکرێن. بیچم ورووخسەری پاک تۆزاوی دەکرێن وبیچم ورووخساری ناپاک وناڕاست دەشۆرێنەوە و مشتومال دەکرێن. ڕووداوەکان سەر مەقولاتیان پێدەدرێ و ئاوەژوو دەکرێنەوە. گابرای نووسەری حیزبی ٢٠٠-٣٠٠ لاپەرە بەباڵگاشەی حیزبەکەی و بەسەرکەوتنی و بە پیرۆزبایی بێگانان ڕەش دەکاتەوە. بەڵام نانووسێ کە جارێکیش نسکۆمان بردوە و هەڵەنگوتووین و ئەمان توانیوە بچینە پێش. ئەگەرلە ڕووی ناچاریش جارێک بڵێ کەم و کوڕیشمان هەبوە، قەت ڕوونی ناکاتەوە کە هۆی هەڵەو کەم و کوڕیەکان چبوەو چەندە چەوت ڕۆیشتووین و ڕێگا چارە چیە. لەم بارەوە بەڵگەی زۆر بەدەستەوەن و پێویستیش بە ڕوونکردنەوەی زیاترناکات. بەو ئیعتیبارە کەسێک بووم لە سەرەتای دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.کافە * وە تا ساڵی ١٩٨٤ لە نێو تێکۆشانی بزووتنەوەدا بووم و لە قۆناخی جۆربە جۆردا بەرپرسیم کەوتۆتە سەرشان، بە ئەرکی نیشتمانی خۆم زانیوە بە گوێرەی توانا تیشکێک بخەمە سەر لاپەڕەکانی مێژووی ئەم ماوەیە و بەرەی تازە پێگەیشتووی نەتەوەکەم تا ڕادەیەک لە ڕووداوەکان ئاگاداربکەم. سەبارەت بە نەبوونی بەڵگەو دوکومێنتی نەنووسراو و

---

* غەنی بلوریان لەنامەیەکدا کەبۆ ڕەخنە لەبیرەوەری یەکانی من بەهاواری کاک حامیدی گەوهەری بەوە هاتوە، دەنووسێ:« تاهاوینی ساڵی ١٩٤٤ لقی کۆمەڵە لەشنۆ ونەغەدە دانەمەزرابوو.» وەک دەزانین نەغەدە ٥٠ کیلۆمیتر لەمەهاباد دوورە. لقی کۆمەڵە لەسلیمانی هەبوە. بەڵام بەقسەی مامەغەنی لەنەغەدەوشنۆ لقی نەبوە. کورد بەخۆڕایی نەیگوتوە: « لەبن خەبەران کەشکەک سلاوەت »!

له بەردەست نەبوو. بە ناچار ناوی خۆم وەک نووسەردێتە گۆڕێ وپشت بە ئاکاداری و بەشداری خۆم لە ڕووداوەکان دەبەستم. هەر وەها لە ئاکاداری و یارمەتی هاوڕێ و هاو خەباتانی ئەم مەودایەی تێکۆشانی سیاسیم کەلک وەردەگرم.

هەر وەک لە بەرگی یێکەمی(پێداچوونەوە)دا باسم کردوە ئەم نووسراوەیەش نابێ بە نووسینی مێژووێ ناودێربکرێ. چونکە من مێژوونووس نیم ولام وایە نووسینی مێژوو بەشێوەی زانستی کاری هەموو کەس نیە . هەل و مەرجی تایبەتی و بەڵگەو دوکومێنتی بڕواپێکراو و نووسەری زاناو لێهاتووی گەرەکە. کەوایوو ئەم نووسراوەیە پێدا چوونەوەیێکە بە ڕووداوەکانی ٣٢ساڵەی ئەم دواییەی تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە پێناو وەدەست هێنانی خودموختاری. واتە وەدەست هێنانی مافێکی سەرەتایی مرۆڤ و ژیانێکی نیمچە ئازاد و هێمنانە. گەلی کوردلەم بەشەی نیشتمانەکەشی هەروەک خەڵکی بەشەکانی دیکەی کوردستان لە پێناو وەدەستهێنانی ئەم مافە سەرەتاییەدا دەیان هەزار شەهیدی داوە. دەیان هەزار بنەماڵەی کورد لەم ڕێگایەدا کوێر کراوەتەوە. مێژوو نووسێک. نووسەرێک، حیزب و ڕێکخراوەیەک، هەرگیز جارێک لێکی نەداوەتەوەو بە ڕاشکاوی نەینووسیوە: کەلۆ هۆی سەرنەکەوتنی ئەم خەباتە خوێناویە چ بوە؟ گەلۆ ئەم شێوە خەباتە لە گەڵ هەل و مەرجی ناوەکی و دەرەکی یەکی کرتۆتەوەو تێکۆشانێکی ڕاست بوە ؟ گەلۆ وەدەستهێنانی خودموختاری لە حکومەتێکی دیکتاتور و سەرەڕۆ بەبێ پشتیوانەیەکی بەهێزی نێونەتەوەیی . جێگای دڵنیایی ومومتمانە بوە؟ گەلۆ خوێندن بەزمانی کوردی، دانانی کاربەدەستی کورد لە ئیدارەکان و لە ژێر چاوەدێری حکومەتی ناوەندیدا، داخوا ئەوەی هێناوە کە دەیان هەزار کەسی بۆ بە کوشت بدرێ و کوردستانی بۆ وێرانبکرێ و سەدان هەزار کەسی بۆ ئاوارە و دەربەدەری هەندەران بکرێ؟. وەڵام نەدانەوەی ئەو هەموو (گەلۆ)یانە و شی نەکردنەوەو لێک نەدانەوە و هەڵ نە سەنگاندنی قۆناخەکانی خەبات و هۆیەکانی سەر نەکەوتن بۆتە هۆی ئەوە کە دوای شکان و بە فیڕۆدانی خوێنی دەیان هەزار

رۆڵەی فیداکارو زەحمەتکێشی کورد، دیسان و جارێکی دیکەش هەر لە سەرهەمان شێواز و ستراتیژی و تاکتیکە سەرنەکەوتوە، خەبات دەست پێ بکرێتەوە و (شۆرش)* هەڵگیرسێنێتەوە و هەر ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە دوێنێ لەم شێوە خەباتەدا سەرنەکەوتوون و شکاون. بێنەوە مەیدان و کۆمەڵانی زەحمەتکێش و فیداکار و ساویلکە و نەخوێندەواری کورد، بۆ مەیدانی کوشتار و قوربانی رابکێشن، بێ ئەوەی چاوێک بەخەباتی رابردوودا بخشێننەوەو دەرسی لێ وەربگرن.

ئەم کاروانە ئێستاش هەربەردەوامە. تا ئەورۆژەش کە نەتەوەکەمان هوشیار نەبێتەوە، پلەی کولتور و تێگەیشتنی کۆمەلانی خەڵک نەچێتە سەر، روناک بیری کورد ئەرکی سەرەکی خۆی لە رێنوێنی و وریا کردنەوەی خەڵک بە چاکی بەجێ نەگەیێنێ و خەرقەی دەروێشی فرێ نەدا، ئەم نەتەوە کەونارایەو خاوەن(مێژووی نەنووسراوی تێکەڵ پێکەڵی چەند هەزار ساڵە) هەر ئاوا دەبێتە دەست خەرۆی تاقمێکی ژێری سواوی هەڵپەرستی بێبار و بە ناو سیاسی. لاوەکان دەبنە گۆشتی دەمی توپ جا چ لە بەرانبەر دوژمنانی کورد و چ لە بەرانبەر شەری نێو هێزە سیاسیەکانی خۆجێیی بۆ سەپاندنی دەسەلاتی نارەوا بە سەر میللەتێکی بندەست و برسی و لێقەوماو و نیشتمانێکی داگیر کراودا.

ئەم نووسراوەیەش بە هیچ جۆر ناتوانێ وەلامی ئەم هەمووگەلۆ و پرسیارو بۆچوونانە بداتەوە، چونکە نووسەر بۆخۆشی ماوەیەکی زۆر بە گوێرەی شوێن و پلەی حیزبایەتی لەم ناتەواوی و هەڵەو کەم و کوریانەدا بەشدار بوە ، لە زۆر مەسەلەشدا وەنەبێ بۆ راست کردنەوەی هەڵەکان تێ نەکۆشابێ. بەڵام

---

* شۆرش مانای زانستی خۆی هەیە. هەموو شێوەیەکی خەبات و راپەرینێکی چەکدارانە مانای زانستیی شۆرش وەرناگرێ. بەبۆچوونی من زاراوی (خەباتی چەکدارانە وسەرهەڵدان و راپەرینی چەکدارانە) لەگەڵ خەباتی گەلی کورد باشتر یەک دەگرێتەوە. هەربۆیەش من لەجیاتی(شۆرش) کەلەکوردستان بۆتە باو وبەهەڵە بەکار دەبرێ وشەگەلی ( راپەرینی چەکدارانە. خەباتی چەکدارانە سەرهەڵدان لەم نووسینەدا بەکار دێنم.

(سانترالیزمی دیموکراتی) که لینین بۆ هەل ومەرجی تایبەتی دوای شۆرشی ۱۹۰۵ دایهێناو بوو بە کوتەکی دەستی ستالین بۆ سەرکوتکردن و لە بەین بردنی ئەندامانی حیزب و خنکاندنی بیروڕای جیاواز و لە ئاخریشدا حیزبە نەتەوەییەکانیش بۆ هەمان مەبەست و ئامانج قۆستیانەوە. رێگای نەداوە کە بیروڕای جیاواز لە حیزبی دیموکرات دا بلاو بێتەوە و رەخنەی داهێنەرانە ببێتە باو و یارمەتی بە هەڵدانی بیرو بۆچوونی جیاواز بکات لە نێو حیزبدا و ئەندامانی حیزب ببنە خاوەنی بیروڕای ئازاد. دیارە ئەوە نابێتە پاکانە و هەڵەکانی منیش بە گوێرەی بەشداری و بەرپرسایەتیم ناشواتەوە. رەنگە ئەرکی ئەم نووسراوەیە هەر ئەوەندە بێ کە هێندێ رووداو و بەسەرهاتی پاس کراو باس نەکراو ونەنووسراو بخاتەروو، یا هێندێ نووسراوەی چەوت و هەڵە راست کاتەوە. . دژی ئەم بۆچوون و فەلسەفە ترسەنۆک وفیلاویەش بوەستێ کە گۆیا ( وەختی گوتنی نەهاتوە و بە قازانجی حیزب نیە)کە بۆ چاو بەستنی ئەندامانی حیزب کراوە تەباو . دان پێدانانی رک وراست بە هەڵەکان، ئاشکراکردنی هۆیەکانی ئەو. شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەم بارودۆخەی کە بوون بە هۆی ئەو هەڵانە. باس و روونکردنەوەی وورد کە بۆ لابردنی هەڵەکان پێویستە ــــ ئاوایە نیشانەی حیزبێکی جیددی. ئاوایە شێوەی بە جێگەیاندنی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی حیزبە. ئاوایە شێوەی فێرکردن و پەروەردەی چین وکۆمەلانی خەلک»

« گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە پێناو ئازادی و دیموکراسیدا قوربانی زۆری داوەو توشی زەرەرو زیانێکی زۆر بوە. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە پێناو خودموختاری ودیموکراسی بۆئێراندا هەزاران رۆڵەی تێکۆشەری خۆی لە دەست داوە. رێزگرتن لە خوێنی شەهیدانی بزووتنەوەی نیشتمانی گەلی کورد، سوپاس بۆ فیداکاری لە رادەبەدەری پێشمەرگان و زەحمەتکێشانی کوردستان، ئەم ئەرکە دەخاتە سەرشانمان کە بە شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی رووداوەکان و روونکردنەوەی بیروڕای کۆمەلانی خەلکی کورد لە گەل بۆچوونی ناراست و غەیرە زانستی کە لەوانەیە چارو بار بێنە نێو بزووتنەوەی کورد خەبات بکەین. بەلکوو ئەم

بیروراو بۆچوونانە یارمەتی بکەن بە راستکردنەوەی هەڵەکان و روونکردنەوەی بیروڕای کۆمەلانی خەلکی کوردستان. بە بڕوای من رەخنەی داهێنەرانەو دۆستانە لە بۆچوون و سیاسەتی نادروست، ئەرکی هەموو خاوەن ڕاو تێکۆشەرانی پێشکەوتوخواز و نیشتمانپەروەرانی کوردستانی ئێرانە» (٧)

## سەرچاوەکان


١ ÷ کریس کوچرا : جنبش ملی کرد، وەرگێرانی برایمی یونسی. تاران. ١٣٧٠ ، ل.٢٣٢

٢ ÷ هەمان سەرچاوە ، ل. ٤٣٠

٣ ÷ هەمان سەرچاوە ، ل.٤٢٩

٤ ÷ هەمان سەرچاوە ، ل.٤٢٨

٥ ÷ هەمان سەرچاوە ، ل.٢٠٥

٦ ÷ هەمان سەرچاوە ، ل.٢١٢

٧ ÷ کەریمی حسامی ، بررسی کوتا دربارە جزوە» بحثی کوتاه دربارە سوسیالیسم » ١٩٨٤ ص ، ٢٩

# قۆناخی یەکـــەم: ١٩٤٧ - ١٩٧٠

## بەشی یەکەم: بوژاندنەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی دوای رووخانی کۆماری کوردستان

بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان دوای روخانی کۆماری کوردستان و هەتا تێکچوونی رێژیمی پاشایەتی لە ئێران بە دوو قۆناخی سەرەتایی و چەند کورتە مەنزلدا تێپەریوە. قۆناخی یەکەم ١٩٤٧___١٩٧٠ قۆناخی دووەم ١٩٧٠___١٩٧٨ دەگرێتەوە.

لە بەرئەوەی لە ماوەی ئەم دوو قۆناخەدا خەباتی کۆمەلانی خەلکی کورد بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەرێوە چوەو جگە لە ناوی ئەم حیزبە هیچ هێزێکی دیکەی نیشتمانیی کورد لە گۆرەپانی خەبات و تێکۆشاندا دیار نەبوە و یا خۆی دەرنەخستوە، نووسین و باسەکەی ئێمەش چالاکی و چۆنیەتی و شێوەی خەبات و تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەم ماوەیەدا دەگرێتەوەدو تیشکی روونتر دەخاتە سەر چالاکی و تاکتیک و ستراتیژی ئەم حیزبە، بەم هیوایەی ئەم نووسراوەیە توانیبێ لەم رێگایەوە خزمەتێکی پچووکی بە ئاگاداری زیاتری کۆمەلانی خەلک و بە لاوانی تازە پێگەیشتو و بە مێژووی خوێناوی نەتەوەکەم کردبێت.

تێکچوونی کۆماری کوردستان.١٩٤٦،نەمانی دام و دەزگای هەوەڵین دەسەڵاتی نەتەوەیی کورد بەشێوەی مۆدێرنی دەوڵەتی. سەرکوتکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی، بۆ گەلی کورد کارەساتێکی داخدار و دڵتەزێن و ڕووداوێکی سامناک و تفت و تاڵ بوو.

بریاری ڕێبەرانی حیزبی دێموکرات بۆ شەڕنەکردن و خۆ بەدەستەوەدانی پێشەوا سەرکۆماری کوردستان، لە لایەک بوو بە هۆی پێشگری لە کوشتار و دەست درێژی بۆ سەر کۆمەلانی خەڵکی کورد، وەک ئەرتەشی ئێران لە ئازەربایجان کردی، بەڵام لە لایەکی تر بوو بە هۆی لە داردانی پێشەواو هاورێکانی و ئیعدامی ئەفسەرانی سوپای میللی کوردستان لە مەهاباد و سەقز و بۆکان. لە سەر شەڕ نەکردن و خۆ بەدەستەوەدانی پێشەو قازی محەممەد گەلێک شت نووسراوەو بیروڕای جیاواز هاتوونە بڵاوکردن. ڕوون کردنەوەی بابەتی ئەم ڕووداوە و بریاری پێشەوا بەلای منەوە هێشتا پێویستی بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە و لە نێو ڕووناکبیرانی دڵسۆز و خاوەن بیروڕا ئەم مەسەلەیە جێگای دم بە دمەو پرس و بەرسیڤە. ئەم ئەرکە بە بۆچوونی من دەکەوێتە سەرشانی مێژوو نووسانی زاناو دوورلە بەستراوەیی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی. شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە زۆر پێویستە کە داخوا لە گەڵ بەربەرەکانی کۆماری کوردستان و ڕۆیشتنی پێشەوا، بارودۆخی نێونەتەوەیی بۆ مانەوەو سەقامگرتوویی کۆماری کوردی لە کوردستانی ئێران لە بار بوو.؟ داخوا شەڕی ساردی نێوان دووبلۆکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کە تازە دەست پێکرابوو، لە وانەبوو لەم هەرێمە نەوتەڵانیەی ڕۆژهەلاتی نێوەراستدا پارسەنگی بەلای مانەوەی دەولەتی سەربەخۆی کوردا قورس ببێنت.؟ یا ئەگەر کۆماری کوردستان بەربەرەکانی کردبایە، ئەم لەشکرە بێ ورەیە و لەق و لۆقەی ئێران دەیتوانی وابەهاسانی بەسەر هێزی فیداکاری کۆماردا زاڵ بێت و کوردستان داگیر بکاتەوە.؟ باوەلامی ئەو پرسیارە بۆ مێژوونووسانی شارەزاو لێکۆلەر بەجێ بێڵین. بەلام بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین پێشەواقازی محەممەد سەرکردەیێک نەبوو کە بۆ رزگاری گیانی خۆی میللەتەکەی لە تەنگانەدا

بەجێ بێڵێ و خۆی دەرباز بکات. «..... لە سەرداوەتی بەرپرسان حیزب.دەستەیەک لە نیزامیەکان کۆبوونەوە لە بارەی رۆیشتن بۆ عیراق و یا بۆ سۆڤیت راوێژو وتووێژبکەن. ئەوان خۆیان بۆ رۆیشتن ئامادە دەکرد. رۆژی ٢٤ی دیسامبر چوونە مالی قازی تا داوای لێ بکەن لە گەڵ ئەوان لە شاری وەدەر کەوێ. قازی پێشنیاری ئەوانی قەبوڵ نەکردو گوتی:«.. هەرچی دەتانەوێ لە گەڵ خۆتان هەڵیگرن و ببەن. من لە گەڵ خەلکی مەهاباد دەمێنمەوە. چونکە سوێندم خواردوە لە گەڵ ئەوان بم و پارێزگاری یان لێ بکەم. حکوومەتی ناوەندی بەقین وتورەیی دەگەڕێتەوە. ئەگەرمن بگرێ قینی خۆی بەمن دەرێژێ و دەست لە خەلک نادات. بۆ ئەوەی خەلکی شار تووشی زەرەرو زیان نەبن. من ناچارم بمێنمەوە» (١)
تێکچوونی کۆماری ساوای کوردستان و لە داردانی پێشەوا و هاورێکانی قین و بێزاری و نەفرەتی کۆمەلانی خەلکی کوردستان لە حکوومەتی داگێرکەری تاران توندو تیژتر دەکات. بوونی بارزانیەکان لە ناوچە کە هێزی سەرەکی پاراستنی کۆماری کوردستان بوون. هێشتا ورەی خەلک بەرزرادەگرێ. حکوومەتی ئێرانیش لە سەر بوونی بارزانیەکان حیساب دەکا و هەتا بارزانی نەمرنەچێ بۆتاران. دەست لە پێشەواو لە رێبەرانی حیزبی دیموکرات نادات. وەک دەزانین ئەرتەشی ئێران رۆژی ١٧ی مانگی دیسامبری ١٩٤٦ دەگاتەوە مەهاباد. رۆژی ٢٠ی دیسەمبر مەلامستەفا چاوی بە سەرلەشکر هومایونی دەکەوێ. ناوبراو پێشنیاردەکات کە مەلامستەفا بچێتە تاران و لە گەڵ بەرپرسانی ئێرانی مەسەلەی خۆی باس بکات و لە گەڵ باڵیۆزخانەی بەریتانیاش پێوەندی بگرێ. «..... ئەودەم بارزانیەکان کلیلی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە بوون کە عەشیرەتە کوردەکان چەک بکرێن، یا شەریان لە گەڵ بکرێ.»(٢)

مەلامستەفا پێشنیاری سەرلەشکرهومایونی قەبوڵ دەکا و رۆژی ٢١ی دیسامبر لە گەڵ میرحاج وعیزەت عبدالعەزیز و نوری ئەحمەدتەها دێتە مەهاباد ولەگەڵ سەرهەنگ غەفاری بەرو تاران دەگەوێتە رێ . پاش رۆیشتنی مەلامستەفا بۆتاران ئەرتەش ئەم بەیاننامەی خوارەوە بلاو دەکاتەوە:

## ئاگاداری :

«... پێویستە بەتەواوی سەرۆک عەشیرەت و تایفەکانی کوردستان رابگەیێنین کە رێزدار مەلا مستەفای بارزانی لەگەڵ هێندێ لەسەرکردەکانی خۆی٢٩ی سەرماوەزی ١٣٢٥ هاتە مەهاباد وگوێرایەکی وفەرمانبەرداری خۆی راگەیاند ولەدەوڵەتی شاهەنشاهی داوای پەنابەری سیاسی کرد. ناوبراوخۆی وتایفەکەی لەژێر ئاسایشی دەوڵەتی شاهەنشاگی دا دەبێ وسوپاش خەریکی زنجیرەیەک کاری پێویست دەبێ بەنیازی ئاسایش وژیانی داهاتووی ئەوان ولەهەموو دەست درێژی یەک دەپارێزرێن. سەرکردایەتی سوپای کوردستان.»(٣)١٧

دوای رۆیشتنی مەلامستەفا بۆ تاران سەرلەشکر هومایونی فەرمانی گرتنی پێشەواو رێبەرانی حیزب و حکومەتی میللی کوردستان دەداو دەگیرێن.

« کاربەدەستانی نیزامی ئێران بۆ نەهێشتن و پاک کردنەوەی شوێنەواری رێژیمی قازی محەممەد بەرنامەیەکیان بەرێوە برد. چاپخانەی کوردی یان داخست. خوێندن و نووسین بەزمانی کوردی قەدەخەکرا. کتێبە کوردی یەکان لە بەرچاوی خەڵک سووتێنران. دەوڵەت بۆ ئەوەی بە عەشیرەتە کوردەکان نیشان بدا کە لە کاری خۆیدا شێلگیرە، یازدە کەسی لە سەرانی دەرەجەدووی عەشیرەتی فەیزوڵابەگی گەورکی سەقەز ئیعدام کرد.»(٤)

ئیعدامکراوەکانی سەقزبریتی بوون لە: «...ئەحمەدخانی فاروقی. حەمەخانی دانشوەر، عبداللەخانی مەتین، ئەحمەدخانی شەجیعی، حەمەبەگی بابەخان بەگ، شێخ ئەمینی کەسنەزان، شێخ سەدیقی ئەسعەدی، عەلیاغای جەوانمەردی، رەسولاغای جەوانمەردی، عەلی فاتحی جهانگیری، حوسێنخانی جەلالی کانی نیاز» لەبۆکانیش عەلی بەگی شیرزادیان ئیعدام کرد. لەمەهابادیش چوار ئەفسەری نیشتمانپەروەری هێزی بەرگری کۆماری کوردستان ئیعدام کران

کەبریتی بوون لە: «...رەسولی نەغەدەیی، محەممەدی نازمی، حەمیدی مازوجی، عبداللەروشنفکر.»

لەهەوەڵی ژانویەی ١٩٤٧دادگای قازی محەممەدو هاوڕێکانی لە دادگای نیزامی لە سەربازخانەی مەهاباد بەنهێنی دەست پێدەکری. ڕێگا نادەن کە بە دڵخوازی خۆیان پارێزەر دیاری بکەن. دادگا ئەفسەرێک بەناوی سەروان شەریفی بۆ پارێزەری قازی یەکان دیاری دەکات. کاتی سازدانی دادگای قازی یەکان بارزانیەکان هێشتا لە کوردستان بوون. زۆربەی خەڵک و عەشیرەتەکان هێشتا چەکداربوون و دەوڵەت پێرانەگەیشتبوو چەک بستێنێتەوە. حکوومەت جارێ نەیدەویست فشارێکی زۆر لە دادگادا بۆ قازی یەکان بێنێ. لە ٢٩ی فێبرالی ١٩٤٧ فەرماندەی لەشکری کوردستان زۆربەی مەلاو گەورەپیاوانی کوردستان وسەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگی کوردی دەباتە تاران بۆکن شا. هەرکەسەش بە گوێرەی پایەی کۆمەڵایەتی و نۆکەریی و خۆفرۆشیی. دیاریی وەک ئەنگوستیلەی ئەڵماس وتفەنگ و میدال و نیشانی ئیفتخارو وەکاز و فەرمانی قەزاوەت لە دەستی حەمەرەزاشاوەردەگرن.

« ... دادکردنی سەرۆکانی کۆماری کوردستان بێگومەن یەک لە دادگە هەرە سەیر و سەرنج ڕاکێشی سیاسی یە کە لە مێژووی سەردەمی ئێراندابێنهاوتبوە، لە بەرانبەر بەڵگەی بڕواپێکراوی دادگادانەوەی تاوانبارکراوەکان نیشانیان دەدا، تەنیا بەڵێن و بڕیار و نامەو وتە و بەیاننامەکانی قوام السلطنەی سەرۆک وەزیر بوو، سەدری قازی کە ئەو هەموو بڕوایەی بە بەڵێنی سەرۆک وەزیر هەبوو، لە ئاخرین کاتیشدا هەرهیوای وابوو کە قوام السلطنە بە وادەو بەڵێنی خۆی وەفادار بێ. هەر ئەو کەسەی کە ١٦ی سەرماوەزی ١٣٢٥(١٩٤٦/١٢/٧)لە مزگەوتی هەباساغا لەمەهاباد گوتبووی:«... دەوڵەتی ئێران قەت نە توانای دانیە لە دوو جەبهەی ئازەربایجان و کوردستان شەڕ بکات. ئێمە لە گەڵ فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان باش دەتوانین هێزەکانی دەوڵەتیی لە بەریەک بڵاو بکەین. قەت نابێ بترسین.» کۆبوونەوەکانی دادگا زۆربەیان تا ١٨سەعات درێژەیان دەکێشا ببوە

مەیدانی دیفاع و رووکردنی نهێنی یەکان. دامەزراندنی کۆماری کوردستان، لە بەرکردنی لیباسی ژەنرالی. سەر کۆماریی کوردستان، کۆڕینی ئالای میللی ئێران و لابردنی شێروخورشید، سەفەری سەرۆکانی حیزب بۆ باکۆ. دیدار لە گەل ژەنرالانی بێگانە، کوشتنی ئەفسەر و سەربازانی ئەرتەشی ئێران. بەڵێنی دانی ئیمتیازی نەوت بە پێی ٥١و٤٩ بە دەولەتانی بێگانە. ئاخرەکەشی بەلگەو روونووسی وتاری تاوانبار کراوەکان لە سەردەمی دەسەلاتیاندا، ئەوانە هەموو بەلگەی گرنگی بەرگری لێنەکراو بوون کە دادگا دەیتوانی بە هاسانی دژی ئەوان بڕیاربدات» (٥)

پێشەواله بەرانبەر ئیدیعانامەی دادستان دا ١٤٠سەعات دیفاع دەکاو هەموو تاوانەکان رەت دەکاتەوە و بەرپرسی هەموو رووداوەکان وەئەستۆ ی خۆدەگرێ و دەلێ :« لە سالی ١٩٤١ ەوە حکوومەتی تاران دەسەلاتی بەسەر کوردستاندا نەماوە. بۆ ئەوەی لەم مەلبەندە نەبێتە هەرکەس هەرکەس. بەیارمەتی سۆفێت حکومەتێک دامەزراوە کە ئاواتی لە مێژینەی گەلی کورد بوە. هەر وەک دەسەلاتە مەزنەکان هەرچی ویستوویانە لە تاران کردوویانە .»(٦)

رۆژی ٢٣ی ژانویە پاش ٧٢سەعات دادگای نیزامی هەرسێک نیشتمانپەروەری کورد بە مەرگ مەحکوم دەکات. بەلام پەروەندەکەیان دەچێتەتاران. ئەو هومێدەش هەر دەبێ کە قازیەکان بۆ دادگای چاو ڕێخشاندنەوە بەرنە تاران ولە وێ دادکایی بکرێن. بەلام بەپێچەوانە لە تەورێزەوە چەند ئەفسەر دەنێرنە مەهاباد وئەوانیش حوکمی دادگا پشت راست دەکەنەوە و پەروەندەکەیان دەنێرنەتاران. لە تاران ئیجرای حوکم وەدوا دەخرێ. «.... لە فێوریەی ١٩٤٧ ژەنرال رەزمارا چوە مەهاباد. بەلگەی ئەوتۆم بەدەستەوە بوو کە لێم یەقین بێت مەئموریەتی زیرەوانی بە سەر ئیعدامی برایانی قازی دا بەو سپێردراوە.» ( ٧)

لە ٣٠ی مارسی ١٩٤٧ فەرمانی راپەراندنی حوکمی ئیعدام دەدرێ بە دادگای نیزامی مەهاباد. « لە گەلکوو دەستووری ئەنجامی حوکمی دادگا گەیشتە فەرمانداری نیزامی مەهاباد بڕیاردرا بۆ پێشگری لە هەموو پێشهاتێک یەکەم

دەبێ هەر ئەو شەوە کە خەڵکی مەهاباد لە خەودان و حکوومەتی نیزامی ڕێکانادا کەس لە ماڵ بێتەدەر حوکمی دادگا بەڕێوەبچێ. دووەم دەبێ ئەرتەش و مەئمورەکان ئیحتیاتی پێویست بکەن. لە لایەکی تر هەیئەتی دادگا کری خۆی تەواو کردوە دەبێ بۆ تەوریز بگەڕێتەوە، فەرماندای نیزامی و هێزی ئەمنیەت پێشەکی خۆیان ئامادە کردبوو، تەواوی دەورو بەری مەیدان و شەقامەکان بە سەربازی شەست تیر بە دەست ئاخنرا بوون. شەوی ٣١ی مارس هەرسێک قازی دوای بەرێوە چوونی تەشریفاتی مەزهەبی لە سێدارە دران.»(٨ )

## بارزانییەکان و چارەنووسیان

بەر لە ڕۆیشتن بۆ تاران سەرۆک بارزانی بریاری دابوو کە ژنو منداڵ و پیرو پەک کەوتەی بارزانیەکان لە گەڵ شێخ ئەحمەدی ڕەحمەتی بچنە شنۆو چەکدارەکانیش لە نەغەدە و لاجانی مامەشان بمیننەوە و چاوەڕوانی هاتنەوەی بارزانی بن.

خەڵکی ناوچەی لاجان و سندوس و شنۆ ئەوەی لە توانایان دا دەبێ بۆ میوانداری و یارمەتی بارزانیەکان دەست ناگێرنەوەو دریخی ناکەن. خەڵک ڕۆچنەیەکی هیواو هومێد لە بوونی بارزانیەکاندا بەدی دەکات. لە تاران پێشنیار بە مەلامستەفا دەکرێ کە بارزانیەکان دەتوانن لە ناوچەی هەمەدان لە بنارەکانی چیای ئەلوەند نیشتە جێ بن و تاشەش مانگانیش دەوڵەت بەخێویان دەکات. بارزانی موافەقەتی خۆی بە مەرجی پرسکردن بە شێخ ئەحمەد ڕادەگەیێنێ. بارزانی ٢٩ی ژانویەی ١٩٤٧ دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان. دوای گەڕانەوەی کە سەرهەنگ غەفاریش بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام لە گەڵی دەبێ. شێخ ئەحمەد دەڵێ: «..هەرچەندە لە چارەنووسی خۆمان دڵنیا نین، بەڵام ئەگەر بەهاردابێ و ڕێ وبان بکرێنەوە، دەچینەوە وڵاتی خۆمان.»

ژەنراڵ هومایونی دژی ئەم وەڵامەیەو ٣ شەرتیان بۆدادەنێ. یەکەم بێ وەستان

لە ئێران دەرکەون و بۆ عیراق بگەرێنەوە. دووەم ئەگەر دەیانەوێ تا بەهار لە ئێران بمێننەوە، دەبێ ئەوچەک و قورخانەی هەیانە بیدەنەوە بە دەوڵەتی ئێران. سێ یەم ئەگەر ئەوانە قبوڵ نەکەن، لە گەڵ ئەرتەشی ئێران بەرەو روو دەبن.

دیارە بارزانیەکان نەیان دەتوانی مەرجی یەکەم و دووەمی ژەنراڵ هومایونی قەبوڵ بکەن. بەم زستانە نە دەرباز دەبوون و نە دەیانتوانی چەک بدەنەوە و بە هیوای بەڵێن و بریاری عەجەمان دەستی خۆیان ببەستن. بەم جۆرە شەرێکی نابەرانبەر و زاڵمانەیان بە سەردا دەسەپێنرێ و تووشی شەڕدەبن. حکومەتی ئێران بۆ شەڕی دژی بارزانیەکان کە ژن و منداڵ و پیرەمێردی پەک کەوتوویان بەستووە بیبو بێ جێ و مەکان لە گوندان و لە سەر ماڵان دەحاوانەوە. بێجگە لە هێزی ئەرتەشی ئاغاو دەرەبەگی کوردیشی چەکدار کردبوون و بۆشەڕ وەپێش لەشکری دەدان. ئەوانیش چەکیان بەسەر رەعیەت و مسکێن دادەبڕی ودەیان بردن دژی بارزانیان شەریان پێبکەن. سەیری گەمەی زەمانەکە٬ ئەو زەحمەتکێشانەی کە بە شانازی و دڵخوازی خۆیان دەهاتن لە ریزی پێشمەرگەی کوردستاندا ناوی خۆیان دەنووسی و بەدڵ لە رێگای پاراستنی کۆماری کوردستاندا فیداکاری یان دەکرد، ئێستا بەزۆری چەکیان پێ هەڵدەگرن کە دژی هێزێکی ئازادیخوازی کوردو پشتیوانی کۆماری کوردستان شەڕیان پێ بکەن. بەڵام نیشتمانپەروەرانی کورد بێجگە لە چەند ئاغایەکی مەنگوڕ وهێندێ مامەشی تایفەی حەمەداغا، نەک هەرخۆیان لە بارزانیان راست نەدەهێنا، بەڵکوو لە بنەوەڕا خەبەریشیان بۆ دەناردن و نەخشەو رێبازی دوژمنیان پێ رادەگەیاندن. باچەند نموونەی زیندوو بۆ مانەوە لە مێژوودا باس بکەین:

سمایل ئاغای کوری حاجی حەمەداغای شێخالی بەچەند سوارێکەوە لە گەڵ گورهانێک سەرباز دەیێنرنە گوندی (ئارنە)ی سندووسی بەو شەرتە تاریک وروونی بەیانی گوندی قەلاتان وجاشێران پەلامار بدەن کە بارزانی تێدابوون. سمایلاغا سەرلە ئێوارێ بە نهێنی پیاوێکی دەنێرێتە کن حەمەداغای مێرگەسووری لە گوندی قەلاتان و نەخشەی دوژمنیان پێ رادەگەیێنی. بارزانی لە نیوە شەودا بەرلەوەی

عەجەم وەخۆکەون بە سەریان دادەدن. ئیتر سمایلاغا و سەرباز تەنیا خۆ دەربازکردنیان پێ دەمێنێ و زۆریشیان لێ دەکوژرێن. رۆژی دوای سمایلاغا دەگرن چەکی دەکەن و ماوەیەکی زۆریش زیندانی دەکەن .

وسیناغای عەلیارلە گەڵ پۆلێک سەرباز و چەند سوارێکی کورد دەنێرنە گوندی (پێبەجگی) بەو خەیالە کە تاریک و روونی بەیانی گوندی (دەربەند) پەلاماربدەن کە بارزانی تێدابوون. شەو موسوڵمانێکی گوندی خەبەریان بۆ دەبا چەند بارزانی بە نێو قوڵایی جۆگەی چیانەدا بەرەوگوندی( پێبەجگ) دێنە پێشیان و لە پڕ لێیان رادەبن. ئیتر بێدەستکردنەوە بەرەو پاش دەگەرێنەوەو خۆ دەگەیێننەوە نەغەدە. لە نەغەدە فەرماندەی لەشکر لە وسیناغا دڕدۆنگ دەبێ. چەکی دەکا و دەینێرێتەوە.

دەپازدە نیشتمانپەروەری خەڵکی ناوچەی شامات لەگەڵ ئەفسەرێک وگورهانێک سەرباز دەنێرنە گوندی( حەڵب وکۆیکان) شەو بارزانی بەسەریان دادەدەن. هێندێکیان لێ دەکوژرێن و ئەفسەرەکە بریندار دەبێ دەیدەن بە کوردەکانی شاماتی کە بیگەیێننەوە نەغەدە. بەلام ئەوان لاشەی بێگیان بەمردوویی دەدەنەوە بە فەرماندەی ئەرتەش لە نەغەدە. ئیترهەموویان چەک دەکەن و دەیان نێرنەوە..

وسێنی کاعەیزی مەنگوڕ، ئاغای گوندی دێبۆکری، لە گەڵ پۆلێک سەرباز دەنێرن کە بە رێگای مەیدان بەڵەکدا بۆ ناوچەی لاجانی مامەشان بچن. بارزانی لە گوندی لکێن و کەڵەکۆکە دەبن،، کاوسێن خەبەریان بۆ دەنێرێ و رۆژو کاتی حەرەکەتی ئەرتەشیان لێ مەعلوم دەکات. بارزانی لە سەر بستووی مەیدان بەڵەکێ خۆیان لێ دەبۆسە دەنێن و لە پڕ لێ یان رادەپەڕن و کوشتارێکی باشیان لێ دەکەن، فەرماندەی گورهان کاوسێن دەگرێ و پاش لێدان و سووکایەتی پێکردن دەینێرێتە مەهاباد و لەوێ زیندانی دەکەن.

سیمان بەگی دەرگەڵەی بە دەسکیسی کاک مامەندی کولیچی لە گوندی قارنێ بە سەر پێگەیەکی لەشکری عەجەمان دادەدا، پەنجاکەسیان لێدەکوژرێ و زۆریش بە دیل دەگیرێن.

قارەمانەتی بارزانی یەکان لە ساردو سەرمای زستان دا، بەبێ کەرستەو بژێوی

ژیان و ماڵ و  منداڵ و خێزانێکی زۆر بە کوڵەوە، بۆیە دەبێ کتێبی لەسەر بنووسرێن و بەداستان بیگێڕنەوە.

ساڵی ١٩٤٧ڕاستە کە گوڵی هیواو ئاواتی کورد سیس ووشک ببوو. پێشەواو یارانی لە سێدارە درابوون و بە قەولی شاعیر( ئەوساڵ بەهارمان لێ بوو بەزستان)، بەڵام بەربەرەکانی و خۆڕاگری بارزانیەکان بە  سەرۆکایەتی بارزانی مستەفا، دژی لەشکری سێ حکوومەتی داگیرکەری تورک وئێران وعیراق تین و هیوایەک دەخاتە دڵ و دەروونی خەڵک . دەنگوباسی شەڕ لە نێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە و چەند ئەوەندە زیاتری پێوە دەنێن و حەماسەی لێ دەخوڵقێنن. حکوومەتی عەجەمیش جارێ زۆر فشار بۆ خەڵک ناهێنێ، بێجگە لە  هێندێ ڕێبەرانی حیزب و  حکوومەتی میللی کوردستان خەڵکی دیکە جارێ زۆر تووشی ڕاونان و گرتن نابن.

هێندێ لەو دەرەبەگ و خاوەن ملکانەی کە سەردەمی کۆماری کوردستان بۆ دژایەتی کردنی بزووتنەوەی کورد ڕادەکەن و دەچنە نێو لەشکری تاران و لە گەڵ ئەو دەگەڕێنەوە، دەست دەکەن بە ئازاردان وجەریمە کردن ودەرکردنی ئەوکەسانەی کە لەحیزبی دیموکرات و لە تێکۆشاندا چالاک بوون و یا ئەو پێشمەرگانەی دوای تێکچوونی کۆمار گەڕابوونەوە سەرماڵ و حاڵی خۆیان. هێندێ لەو دەرەبەگانە چەک و دەرەجەی سەرهەنگی و سەروانی ئیفتیخاری ئەرتەشی وەردەگرن و بێ شەرمانە شانازی پێوە دەکەن.

شەڕی نەڵۆس لە ناوچەی شنۆ کە سەرهەنگ کەلاشی تێدا دەکوژرێ و تەواوی سەربازەکانی بەدیل دەگیرێن، ورەی ئەرتەشی ئێرانی بەجارێک لاوازدەکات. «....لەو سەرمای سەخت و ڕێبەنداندا بارزانیەکان سەفەری خۆیان بەرەو نیشتمان دەست پێکرد. دوو حەوتوو دوای ڕۆیشتنیان لە نەغەدە دەوڵەتی ئێران عەشیرەتی هەرکی دەنگداکە پەلاماریان بدەن. چواردەی مانگی مارس ئەرتەشی ئێران هێرشی دژی بارزانیەکانی دەست پێکرد. لە یێک هەڵبڕژانی ڕۆژانەدا،زیانی ئەرتەش زۆر لەوە پتربوو کە وەئەوان دەکەوت. هێزی هەوایی ئێران لە کاتێکا

بارزانیەکان گەیشتبوونە لێواری سنووری ئێران و ڕێگای خۆیان درێژە پێدەدا.
ئەوپەڕی تێکۆشانی خۆی بەکار دەهێنا.»( ٩)
بەربەرەکانی قارەمانانەی بارزانیەکان و بێکارەیی ئەرتەشی پوشالی ئێران حەمەرەزاشا تووڕە دەکاو لە ١٩٤٧/٣/٢٠ ئەم فەرمانەی خوارەوەی بۆ فەرماندەی لەشکری ٤ و ئەفسەرانی ئەرتەشی ئێران لە کوردستان دەردەکا:
«....ئێوە هەرچەندە هێزی تەواویشتان هەیە کەچی دیسان لە شەڕکردن دەڕدونگن. بەو جۆرەی چاوەڕوان دەکرا هێزەکانتان بۆ خاشە بڕکردنی بارزانیەکان هەنگاوی کاریگەریان نەهاویشتوە. ئاگاداری بارزانی یەکان لە سەر وەزعی ئێوە زۆرباش بوە. لە هەر شوێنێ کە زانیویانە هێزی ئێوە لاوازە، پەلاماریان داوەو سەرکەوتنیان وەدەستهێناوە. لەو شوێنانەی کە هێزی ئێوە قەوی بوە، پاشەکشەیان کردوە. بارزانی یەکان بە دووتوپ توانیویانە ئەلۆس و دەوروبەری نەغەدە توپ باران بکەن و تەنانەت توێنکی ئێوەش لە کاربخەن. لە بەرئەوە پێویستە ئەم کارەساتە ببێتە پەندێک بۆئێوە و جێگای ئەو غەڵەتانە پڕکەنەوە کە لە کارەساتی قاڕنە و ئەلۆس داوویان داوە. پێویستە ئەم دستورانەی خوارەوە بەجێ بگەیێنن:
ا - هیچ پادگانێک کەمترلە گوردان سەربازی لێ نەبێ.
ب - بە فڕۆکە تەواوی ڕێگەو ڕێبازی کۆچ و کۆچباری ماڵی بارزانیان و هەروەها تۆپخانەکەیان بۆمباران بکەن.
ج - لە ڕێگای عەشیرەتانی باوەڕپێکراو، هەمیشە ئاگاداری لە سەر وەزعی بارزانیەکان کۆ بکەنەوە.
د - دەبێ تا ١٥ی خاکەلێوەی ١٣٢٦ شەڕکۆتایی بێت و کارێکی وابکەن کە بارزانیەکان نەتوانن دەرباز بن و لەوە زیاتر ئابڕووی ئەرتەش نەچێ.
هـ - ئاغاکانی مەنگوڕ و مامەش و دێبۆکری کە تووشی زەرەر و زیان بوون. دڵخۆشیان بدەنەوە و مەهێڵن بەو خەسار و زیانە دڵسارد بن و سەریان لێ بشێوێ.
و - بە تایبەت پێویستە بە شەو زۆر وریابن و زۆر بە توندی ئاگاتان لە دالان و

کۆلان و شوێنی هاتوو چۆ هەبێ. چونکە بارزانیەکان بۆ کەلک وەرگرتن لە وەزعی زەوی زۆر کارامەن و لە کەند و کۆسپی سروشتی زەوی ئەو پەڕی کەلک وەردەگرن.»

ز - سێ فەرماندەی ستون بۆ عەمەلیاتی خۆتان دیاری بکەن. یەک لە باکور لە ناوچەی مەرگەوەر. یەک لە گەلی قاسملو و دەوەری. یەکیش لە ناوچەی نەغەدە وسۆفیان کە عەمەلیاتی ستونەکان رێکوپێک و رێنوێنیێ بکەن. » ( ١٠ )

بە دوای ئەم فەرمانەی شاهانەدا بۆمبارانی بارزانیەکان و ژن و منداڵی بێ دیفاع و بێ تاوان بە چەشنێکی وەحشیانە دەست پێدەکرێ. «٢٤ی مانگی مارس بارزانیەکان هێزێکی ئەرتەشیان پەلاماردا. لەو هێرشەدا ستوان امامی و١٢ سەربازدەکوژرێن. ستوان جهانبانی(کوری ژەنراڵ جهانبانی)لە گەڵ ١٥سەرباز بەدیل دەگیرێن. ئەرتەشی زراو چوو پەلاماری دەست پێدەکاتەوە، دیسان ئەفسەرێک و٧ سەرباز دەکوژرێن. لەشکری ئێران لە جیاتی هێرش و پەلامار حالەتی دیفاع بەخۆوە دەگرێ. شا سەرۆکی ستادی ئەرتەشی ئێران رەزمارا دەنێرێتە ورمێ و٣٠٠ نیوپەهلەوی ئاڵتون و ١٩٨میدالی ئازەرئابادەگان و٢٢٠میدالی زێوی ئازایەتی بۆ ئەفسەران و سەرۆک عەشیرەتە خۆفرۆشەکان دەنێرێ.

«.... دوای گەرانەوەی سەرۆکی ستاد بۆ تاران گەلالەو نەخشەیەکی پێشنیاری بە دەست تێوەردانێکی شا بەم جۆرەی خوارەوە پەسند دەکرێ.

ئەلف -١ لە باکور لە ناوچەی مەرگەوەڕ (نرکی - زرکا) هێزەکانی ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ سەردادوەر دەبێ لە بەرگری دابن و لە بەرزاییەکان بورجی زێرەوانی دروست بکەن تا دوژمن نەتوانێ رۆژئاوای ئەوان پەلاماربدا، هێزی سوارەش لە نرکی و لە سیلوانا جێگربن.

٢ -لە ناوچەی باراندوزچایی، ستونی سەرهەنگ فولادوەند بەرزاییەکانی گرگل و دەشتەبێل و قولقولەو بەردە زەرد بگرێ و لە گەڵ ستونی مەرگەوەڕ پێوەندی بەرقەرار بکات.

٣ - ستونی گەلی قاسملو بەفەرماندەیی سەرهەنگ نیساری هەروا

هەڵوێستی دیفاع و بەرگری بپارێزێ.
٤ – ستونی سەرهەنگ مظفری لە شەیتاناوا، دوای گرتنی دەربەند لە هەڵوێستی بەرگری دابێ.
ب – ١ ستونی سەرهەنگ مەجیدی چیای پادار بگرێ.
٢ – ستونی سەرهەنگ ئەنساری بەرزاییەکانی چواربۆت و ستونی سەرهەنگ غەفاری سۆفیان و ئەلۆس بگرن.»
پاش ئەو هەموو تەرتیبات و دانانی نەخشە و پلانە، رۆژی یەکی ئەپریلی ١٩٤٧ هێزەکانی ئەرتەشی ئێران کە دژی هێزی ئازادیخواز و قارەمان و ئاوارە و لێقەوماو و سەدان ژن و زارۆک و پیرو پاتاڵ بە کوڵەوە ، جارِدرابوون، بەمجۆرەی خوارەوە بوە :
«-١ -ورهانێک لە گوردانی ئیسفەهان لە سیلڤانا
٢ – هەنگی سواری فەوزیە و دوو تانگ لە زرکا(بەفەرماندەیی سەرهەنگ پورتەوی)
٣ – دوو گوردان پیادە بە تۆپێک و گورهانێک خومپارە و تانگێک لە نرکن(بە فەرماندەیی سەرهەنگ ٢سەردادوەر )
هەر سێک ستون لە ژێر چاوەدێری راستەوخۆی سەرهەنگ نیساری دا
٤ – گوردانێک پیادە، دەستەیەک تۆپخانە، دەستەیەک خومپارە، لە بەرزاییەکانی سەدیق و نەرەلەر (بەفەرماندەیی سەرهەنگ فولادوەند.)
٥ – گوردانێک پیادە، دەستەیەک تۆپخانە، دەستەیەک خومپارە و تانگێک لە زارگەڵی قاسملو( بە فەرماندەیی سەروان پاشایی)
٦ – هەنگی سواری کوردستان، تۆپێک، دەستەیەک خومپارە و تانگێک لە شەیتاناوا(بەفەرماندەیی سەرهەنگ مظفری )
٧ – گوردانێک پیادە، دەستەیەک تۆپخانە لە وەزنە و خان تاوس( بە فەرماندەیی سەرگورد کەبیری )
٨ – گوردانێک پیادە و دەستەیەک تۆپخانە لە قەلاجوغە و خنخنە ( بە

فەرماندەیی سەرگورد زرنیوش )

٩- گوردانێک پیادە، دەستەیەک خومپارە، دەستەیەک تۆپخانە لە نەغەدە (بە فەرماندەیی سەرهەنگ مەجیدی )

١٠- دوو گوردان پیادە، و شەست تیر لە نەغەدە ( بە فەرماندەیی سەرگورد موحسنی )

١١ - دەستەیەک تۆپی ١٠٥ی درێژ و دەستەیەک تۆپی ١٠٥ی کورت و دوو تانگ لە نەغەدە.

١٢ - گروهانێک پیادە لە قارنێ

١٣ - دوو گروهان پیادە، دوو دەستە شەست تیر، دوو تانگ. لە بەرزاییەکانی چواربۆت(بە فەرماندەیی سەرگورد مساوات )

١٤ - گوردانێک پیادە لە گەڵ گروهانێک سوار و دوو تانگ و دەستەیەکی تۆپخانەی ١٠٥ی کورت لە سۆفیان( بە فەرماندەیی سەرهەنگ ئەنساری )

١٥ - ٢٥٠ تفەنگچی مەنگور بە سەرپەرستی(ستوان دووەم نوبەهار)لە جەڵدیان ئەو مەنگورانە دەبنەپ پێشقەرەوڵی ئەرتەش و بەرەو گوندی سینگان دەکەونەرێ، پێش ئەوەی بگەنە سسینگان، لە گوندی نەرزیوێ بارزانی لێی یان رادەپەرن، ١٣کەسیان لێ دەکوژرێ و ئەوانی دیکەش بەراکردن دەرباز دەبن.

١٦ - دوو گروهان پیادە و گروهانێک تۆپی ٣٧ لە ورمێ (بەفەرماندەیی سەرگورد نولو )

کۆمەڵێک چەکدار لە دەورو بەری ستونگەلی ناوبراو بۆ یارمەتی ٧ فرۆکەی هایند وتاگرموس .. » ( ١٠ )

لێ وردبوونەوە لە چاردانی ئەو هەموو تواناو هێزی هەوایی و زەمینی و تۆپخانە و چەکداری غەیرە نیزامی بۆسەر ١٥٠٠ بارزانی بێ دەرمتان وبێ پەناگا. مرۆڤ دەگێڕێتەوە بۆ شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە کە داخوا کۆماری کوردستان بەو سوپاو پێشمەرگەو هێزی قارەمانی بارزانی و پشتیوانی و فیداکاری کۆمەڵانی خەڵکی کوردیشەوە. نەیدەتوانی لە بەرانبەر ئەرتەشی پوشاڵی حکومەتی ئێراندا

بەربەرەکانی بکاو مێژووی خەباتی گەلی کورد جۆرێکی دیکە هاتبا نووسین وباسکردن و لێکۆڵینەوە .؟"

لەشکری ئێران سەرەرای ئەو هەموو ئیمکاناتە کە دەبینێ چاری بارزانیان ناکات، رۆژی ١٩ی مارسی ١٩٤٧ سەرلەشکرهومایونی لە حاجی ئۆمەران چاوی بە عەلی حجازی ئامیرهێزی لەشکری عیراق دەکەوێ داوای هاوکاری لێدەکات. ئامیرهێزی عیراق شوێنی پادگانەکانی خۆی لە بافتیان و مێرگەسور کە ١٥گوردان سەربازیان تێدایە بە هومایونی نیشان دەدا. هەروەها رادەگەیێنێ کە١٢فرۆکەی (ئان سن ) لە فرۆکەخانە موسڵ و کەرکوک ئامادەن و لە کاتی پێویست دادێنە یارمەتیتان، سەیدعەلی حجازی شەپۆلی دەزگای بێسیم و سەعاتی کاریان بۆ راگرتنی پێوەندی دەدا بە سەرلەشکرهومایونی تا لێکتر ئاگادارین.

هەرچەندە بارزانیەکان زۆرباش بەربەرەکانیان دەکرد. بەڵام پەلاماری توندو درندانەی ئەرتەش بۆمبارانی ١٢فرۆکە ورەی ژن و مێرانی کزکردبوو. ( ١١ ) خوالێ خۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزانی لە ١٩٤٧/٤/٨نامەیەک بۆ سەرهەنگ نیساری فەرماندەی ستونی عملیاتی مەرگەوەر دەنووسێ تێ یدا دەڵێ: « «....فرۆکەکانی ئێوە بەپێچەوانەی یاسای نێونەتەوایەتی و ئینسانیەت و دیانەت هەموو رۆژێ پەلاماری ماڵ و خێلات و ژن و منداڵی ئێمە دەدەن. هەموو رۆژێ لێمان دەکوژرێ. داوادەکەین فرۆکەکانتان وازلە بۆمبارانی ئێمە بێنن»

بەڵام سەرهەنگ نیساری وەڵامی نامەی شێخ ئەحمەدی بەتوندکردنی بۆمباران دایەوە، لە وەڵامی نامەی شێخ ئەحمەد دا بۆی نوسیبووە:« پەلامار بە توندی درێژەی دەبێ .»(١٢ )

فەرمانی حەمەرەزاشا نەیتوانی ورەی ئەرتەشی شاهەنشاهی بەرزکاتەوە ولە هەموو ناوچەکانی شەر زەبری توندیان وێدەکەوت.

هەرچەندە بارزانیەکان کەوتبوونە گەمارۆی لەشکری سێ حکوومەتی دیکتاتۆری دوژمنی کورد و لە سنووری هەریەک لەم وڵاتانە لە هەموو لاوە دەکەوتنە بەر هێرشی تۆپخانە و بۆمبارانی فرۆکە .بەڵام لە لایەن خەڵکی بەشەرەف و

زەحمەتکێشانی فیداکارەوە بە دڵەوە پێشوازیان لێ دەکرا. «.... ئێمە لەو حەرەکاتی پارتیزانی یەی کە لەئێران و عیراق و تورکیا کردمان میللەتی کورد شعور و حسیات و ئیخلاسی نهێنی خۆی بە ئاشکرا نیشان داین کە ئەوەش لەو وەختانەی کە دێهاتی و رەئیسە وەتەنپەروەرەکانی کورد بە روحێکی زۆر پڕ ئیخلاس و برایەتی و صەمیمیەت پێشوازی یان لێدەکردین وە بەرێ یان دەخستین وە لە فرمێسکی ژن و منداڵی کوردلە وەختی بەرێکەوتنماندا زۆر بەئاشکرائیخلاس و محبەتی کورد بۆمان مەعلوم دەبوو. لە هەموو ئەو رێگای سەخت و ناخۆشی جیاکانمان کە پێدا تێدەپەڕین، میللەتی کورد بەبێ ئەوەی ئەهمیەتێک بداتە ترس و زوڵم و جنایەتی دوژمن بە هەزاران دێهاتی و رەئیس و گەورەی وەتەنپەروەر خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە گەڵ ئەرزاق و نان و جل و بەرگی کە بۆیان مومکین دەبوو، بۆیان دەهێنایین. وە لە ئەترافی ئەو رێگا سەختانەی کە پێداتێپەردەبووین پێشوازی یان لێدەکردین. وە لە پاش ئەوەی سڵاوی میللەتی کوردیان پێ رادەگەیاندین ونان و ئەرزاق و جل و بەرگیان تەسلیم دەکردین، بە دەنگێکی بەرز هاواریان دەکرد : « «...بەسلامەتی برۆن، ئێوە بەخودا دەسپێرین. موفەقیەتی ئێوەمان دەوێت. لە وەختێکی زۆر نیزیکدا بۆ رزگاریمان چاوەڕێتان دەکەین.» (١٣) بەڵێ ئەو قارەمانانە بەنێو ئەم میللەتە بەشەرەفەدا خۆیان لە ئابلوقە رزگارکرد و لە ١٥ی یونی ١٩٤٧ دوای شەڕێکی خوێناوی لە ئاوی ئاراز پەڕینەوە.
رۆژی ٢٧ی جۆزەردان(١٩٤٧/٦/١٧)رادیو بی.بی.سی. لە هەواڵێکدا رایگەیاند:« «....پاش شەڕێکی گەورە لە نێوان سوپای ئێران و کوردەکان لە سنووری روسیا. سەرکردەی کوردەکان ژەنراڵ بارزانی توانی لە گەڵ٨٧٠ کەس لە ئاوی ئاراز بپەڕێتەوەو بگاتە رووسیا .هەموو سەردارانی سەربازیی جیهان لەم کارە سەریان سوڕماوە.» (١٤) (سەرچاوەکانی دیکە هاوڕێیانی بارزانی بە ٥٠٠ کەس لەقەڵەم دەدەن، ) دانەر.

هەواڵی پەڕینەوەی بارزانیەکان لە ئاراز و وەرگرتنیان لە لایەن دەوڵەتی ئەوسای سۆڤیەتەوە بۆ کۆمەلانی خەلکی کوردستان دوو لایەنی هەبوو. لە لایەک

شادی بوو کە لەو ئابلوقە و شەڕ و ئاستەنگیە رزگاریان بوە و پەنادراون. لایەنێکی دیکە خەم وخەفەت بوو چونکە هومێد و هیوای بەرهەڵستکاریی حکومەتی ئێران لە گەڵ پەڕینەوەی ئەوان بەئاوی ئارازدا چوو. نەمانی بارزانیەکان لە مەیدانی خەبات و بەرهەڵستکاری دەستی ئەو دوو حکومەتەی لە جنایەت و زۆرداری دژی گەلی کورد بە جارێک والا کردەوە.

لە عیراق هەرچەند ماوەیەک بوو چوار ئەفسەری ئازادیخوازی کورد( عیزەت عبدالعزیز، مستەفا خۆشناو، محەممەد مەحمود قودسی و خەیروڵاعبدولکەریم) کە لە گەڵ سەرۆک بارزانی هاتبوونە کوردستانی ئەم دیو و لە سوپای کۆماری کوردستاندا چالاکانە بەشداریان کردبوو. دوای تێکچوونی کۆمار گەڕابوونەوە بۆ عیراق گیرابوون، حکومەتی عیراق تامانەوەی بارزانیەکان لە سنوورەکانی تورکیەو ئێران وعیراق، زاتی نەکردبوو ئیعدامیان بکات. بەڵام هەردوو رۆژ دوای بڵاو بوونەوەی خەبەری پەڕینەوەی بارزانیەکان لە چۆمی ئاراز. رۆژی ١٩/ژوئینی ١٩٤٧هەر چوار ئەفسەری ئازادیخوازی کورد لە بەغدا ئیعدام دەکرێن.

لە ئێرانیش دوای پەڕینەوەی بارزانیەکان لە ئاوی ئاراز ئەرتەش و ژاندارم لە خەڵکی وەخۆ دەکەون. دەست دەکرێ بەگرتن و راونانی ئازادیخوازان . بەتایبەت ئەو کەسانەی کە زۆڵە کوردەکان دەست نیشـنیان دەکردن. راوو رووتی ژاندارمە لە گوندەکان بە بیانووی جۆربەجۆر لافاوی تورەیی و بێزاری خەڵکی پترلەحکوومەت دژی دەرەبەگ و ئاغایانی سەر بەحکوومەت دەخاتە رێ. داغ و کەسەری روخانی کۆماری کوردستان و ئیعدامی پێشەواو هاورێکانی بڵێسەی ئاگری خەبات لە ناخی ئازادیخوزاندا دەگەشێنێتەوە.

لە لایەکی تر هەرچەندە لە دنیا دەنگی دابووە کە مستەفابارزانی لە گەڵ ٥٠٠ کەسیتر لە ئاراز پەڕیوەتەوە و گەیوەتە خاکی سۆڤێت. بەڵام ترسی گەرانەوەی بارزانی دڵەراوکە دەخاتە هەناوی حکوومەتە کۆنەپەرستەکانی ئێران و عیراق ولە نێو کۆمەڵانی خەڵکیشدا دەبێتە جێگای باس و هومێد بە دوا رۆژی خەبات. بێجگە لەوە لە بەڵگە نهێنی یەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی حکوومەتی بەریتانیا

دەردەکەوێ کە باڵیۆزخانە و مەئمورەکانی ئینگلستانیش لە مەسەلەی گەڕانەوەی بارزانی خافڵ نەبوون. «... عەمەلیاتی دژ بە مەلامستەفا کە وەک بەشێک لە کاری ڕێکخستنەوەی سەرلەنوێی ئازەربایجان، لە لایەن دەسەلاتداریەتی ئێرانەوە بەڕێوە چوو، پێشتربە کورتی باسکرا. سەرەڕای ترسێکی دایمی کە لە گەڕانەوەی بارزانیەکان و ئاژاوەنانەوەیان لە عیراقدا هەیە، وادیارە بارزانیەکان خۆیان لە ئەزموونی ئێران و ئەو زیانەی لە ئەرتەشی ئێرانیان دی، دەرسێکی باشیان وەرگرتبێ، بەشێکی بەرچاویان لە ۱۹٤۷دا دەستیان کرد بەگەڕانەوە بۆ عیراق و ئەو نموونەیەی کە بۆ گەڕانەوەی بێ مەرج وشەرت دایانمەزراند لە لایەن ئەوکەسانەشەوە کە دواتر دەگەڕانەوە ڕەچاوکرا. دەسەلاتداریەتی عیراق، بەرنامەیەکی وشیارانەی بۆگەڕانەوەی ئەوان پێکهێنابوو کە لێبووردنی بەدوا دادەهات و ئەو لێبووردنەش بەبێ ڕەخنەی ڕۆژنامەکانی بەغدا نەچوە سەر. وازانرا کە ژمارەیەکی زۆری چەک، لە سەرسنوور و پێش گەڕانەوەی پەنابەرەکان بە قاچاخ براون، یا لە کار خراون، نیزیکەی شەش هەزار پیاو و ژن و منداڵ لە گەڕانەوەدا خۆیان ناونووس کرد، چوار ئەفسەرەکەی ئەرتەشی عیراقیش تەسلیم بوون، ئینجادادگایی ولەنۆزدەهەمی مانگی جوون دائیعدام کران.

۱۹٤۸ : ١٦- بەدرێژایی پاشماوەی ساڵی ۱۹٤۷وهەمووساڵی ۱۹٤۸بارودۆخی کوردستانی عیراق هێمن بوو. چاوڕاو لە مەڕ گەڕانەوەی خێرای مەلامستەفا، زیاترلە سەرەتای ساڵدا دەبیسراو شانسی ئەوەی کە ڕەنگە مەلا لە سەر قالبوونی ئەرتەش بەشەڕو هەرای فەلەستینەوە کەلک وەرگرێ، نیگەرانی حکوومەتی زیاتردەکرد...هەر چۆنێک بێ حکوومەتی عیراق لە مانگی مایس دابەشێوەیەکی ڕاستەقینە، لە چاوو ڕاوی گەڕانەوەی زۆر زووی مەلا مستەفا ئاگادار کرایەوە بەلام وادیاربوو ئەو هەواڵەش زەمینەیەکی نەبووبێ وساڵ بەبێ ترسی زیاترکۆتایی هات.

۱۹٥۰: ١٨- لەنێوان مانگی ئاپریل وجوون دا،داستانی پێوەندی گرتنی مەلامستەفا بە ژمارەیەکی زۆری سەرەک هۆزەکانەوە هەروەها بە قاچاغ هاتنی

چەک لە ئێرانەوە بۆعیراق بڵاو بۆوە. لە مانگی جولایدا هەواڵی ئەو حکایەتەش لەلایەن پۆلیسەوە گەیشت کە گوایە مەلامستەفا هەوڵی وەرگرتنی ئیجـازەیداوە بۆتێپەڕبوون بەخاکی ئێراندا. راپۆرتەکە ئەوەشی لێ زیاد کرابوو کە پێی گوتراوە، خۆی و دەوروبەرەکەی دەبێ بەبێ چەک بچنەخاکی عیراقەوە بەڵام ئەو مەرجەکەی قەبوڵ نەکردوە. گومانێکی کەم لەوەداهەیە کە مەلامستەفا پێوەندییەکی دایمی لە گەڵ دۆست و کەس وکاری خۆی لە عیراقدا هەبێت. بەڵام خەیاڵات لەمەر گەڕانەوەی بۆ عیراق، گرنگایەتیەکی زیاتری لەساڵانی پێشوونییە.» (١٥)

وەک دەبینین دوای پەڕینەوەی بارزانییەکان بەدرێژایی ٢ساڵیش دەوڵەتی بەریتانیاو حکومەتە دەستنێژەکانی عیراق و ئێران گەڕانەوەی مستەفابارزانیان بۆ بۆتە گیرو گرفتێکی گرنگ و نەیانتوانیوەئەو مەسەلەیە لە بیرو کردەوەی خۆیان دوور خەنەوەو خەوی پێوە نەبینن.

پاش ئەوەی بارزانییەکان دەگەنە خاکی سۆڤێت لە١٩٤٧/٩/٢٩هەموو بارزانییەکان دەبەنە باکۆ ولە ئۆردوگایەک پێداویستی ژیان وخوێندن وفێربوونی مەشقی نیزامی یان بۆ ئامادە دەکەن. بارزانی ئەمرکە نەیویستوە لەئاوارەیی و دەربەدەریشدا واز لە تێکۆشان بێنێ و بحەسێتەوە لە ١٩٤٨/١/١٩هەموو کوردەکانی عیراقی و ئێرانی کە ئەو دەم لە باکۆ دەژیان کۆ دەکاتەوەو رێکخراوێکی سیاسی پێک دێنێ. لەم کۆبوونەوەیەدا لە نێو کوردەکانی ئێران و عیراق ئەم کەسانەی خوارەوە بۆ رێبەرایەتی ئەم رێکخراوەیە هەڵدەبژێردرێن.

لەکوردستانی عیراق :

١ ــ مستەفا بارزانی سەرۆک
٢ ــ شێخ سلیمان بارزانی
٣ ــ عەلی محمد صدیق
٤ ــ میرحاج احمد عقراوی
٥ ــ سێمان بەگی دەرگەلی
٦ ــ عبدالرحمن مفتی

٧ ـــ محمد نجیب بڕواری

لەکوردستانی ئێران

٨ ـــ سەید عەزیز سەید عبداللە

٩ ـــ رەحیمی قازی

١٠ ـــ مستەفا شەڵماشی

١١ ـــ حەسەن حسامی

١٢ ـــ رەحمان گەرمیانی

١٣ ـــ سەید کەریم ایوبی

١٤ ـــ کاک مراد ( دەبێ مراد رەزم ئاوەر بووبێ ـــ دانەر )

لە کۆبوونەوەدا بڕیار دەدەن کە لە رادیۆی باکو ئازەربایجانی سۆڤێتی ،بە زمانی کوردی وتار بڵاو بکەنەوەو رۆژنامەیەکی کوردیش دەربکەن، لەو کۆبوونەوەیەدا مەلامستەفا بە درێژی باسی رابردووی خەباتی دووروودرێژی کورد دەکا و بزووتنەوەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان روون دەکاتەوە و دێتە سەرباسی بزووتنەوەی کوردستانی ئێران ودەڵێ:

«... هەشتەم : لە پاش ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٤١دا حوکمی منحوسی رضاشا تێکدرالە ساڵی ١٩٤٥ لە ژێر رەبەری قاضی محمد داحاکمیتی دیموکراتیکی کورد دامەزرا. لە دیکامبری ساڵی ١٩٤٥هەموو رئیس و گەورەکانی کورد لە گەڵ قوای میلیشیای بارزانیان کە قسمێکی کوردستانی ئێرانیان لە عناصری فاشیست و کلکەکانی رضاشاهیان پاک کردەوە لە ژێر رەبەری قاضی محمد داحکومەتی دیموکراتی کوردیان دامەزراند. لە پاش ئەوەی کە ساڵێک ئەم حکومەتی دیموکراتیکی کورد دەوامی کرد وە لە مدەی ئەم ساڵەدا بەرعلیە ارتجاعی تاران لەشکری ایمە لە گەڵ لەشکری برا ازربایجانیەکانمان بەیەکەوە مبارزەی سەختمان کرد.

نۆیەم : لە ١٢ی دیکابری١٩٤٦دا قوام السلطنەی خاین ئەو پەیمان و قسەی شەرەفی کە بە ازربایجان و کوردستانی دابوو تێکدا وە بە لەشکرێکی زۆرگەورەی

ارتجاعی هیرشی بۆ سەر ازربایجان و کوردستان هێنا. لە پاش مدتی شەش مانگی تەواوی شەردا کە لەشکری ایران لە مقابل لەشکری قارەمان و نەبەزیوی ایمەدا مغلوب بو وە خەریکی هەلاتن بو، ارتجاعی ایران بە پشتیوانی انگلیز و ئەمریکای ئاغایان و لەشکری ارتجاعی تورکیا و عیراقیش هاتنە مەیدانی ایمە و جگە لەوەش وطن فروش و جاسوسەکانی امریکا هەر وەکو رەوشت و پیشەی هەمیشە گیان لە جبهەکانی ایمە بە فعالیەتێکی زورەوە دەستیان بە خەیانەت کرد. نقطەی هەرە ضعیفی ایمە لەوەدا بو کە ژن و مال و مندالمان لە گەل ایمە لە جبهەدا لە ژێر رحمتی گولە باران وبومبای دوژمندا بون. ئەوە بو کە دوژمن ئەم نقطە ضعیفەی لە ایمە دوزی یەوە و بە بێ رحم و انصاف بە وەحشی یانە مال و مندالانی ایمەیان بومباردومان دەکرد وە لە نەتیجەی ئەوەدا قسمیکی لەشکرەکەمان کە لە بەینی لەشکرەکانی عراق و تورکیەدا محاصرەکران لەپاش کوشتاریکی زور اسیرکران، لە پاش ئەم حادسەیە ایمە مقاومتی منظمی خومان بە حرکاتی پارتیزانی عوض کرد کە وا ایستاش ایمە هەر ئەو مبارزەیەدا دەوام دەکەین.

لە پاش ئەوەی کە ارتجاعی تاران کوردستانی اشغال کرد دەستیان کرد بە ئەو جنایەتە وەحشی یانەی کە حتا لە عصوری ناونجی دا ئەو نەوعە جنیەتانە نەبینراون و هەتا کە ایستاش هەر لە ارتکابی ئەو جنایەتانە ناکشێنەوە. هەموتان دەزانن کەرهبری خوشەویستی ایمە قاضی محمد خوی وبراکانی لە١٤ی دیکابری ١٩٤٦دالە شاری میان دواب مقابلەی سەرکردەی خائین وجنایەتکاری ایران همایونی یان کرد وە پەیمانی ئەمان یان لە همایونی وەرگرت و بە قسەی شەرەفی همایونی یان باوەر کرد تسلیم بون. بەلام همایون کە لە شەرەف زور زور بێ بەش بوو لە گەل وەحشی و جنایەتکارانی تری ایرانی رهبری خوشەویست ومحبوبی ایمەیان لە گەل براکانی لە شاری مهاباد بە خائنانە اعدامیان کردن.»

پاشان بارزانی ئەمردیتەسەر :«... باسێکی مختصر لە وضعیتی سیاسی و اقتصادی و اجتماعی کوردستانی ئەمڕۆمان » وەدەلێ :

١ ـــ اولا: کوردانی تورکیە لە ژێر زوڵم و فشاری وەحشی یانەی تەبەقەی حاکمی فاشیستی تورکیادا لە ژێر تهدید و ترسێکی بێ نەزیردەژین. دەتوانین ئەوان وەکوو لە حەپسخانەیەکی تاریک کە هیچ رووناکی یان بۆنانچێ وە لە لایەن درندەی وەحشی فاشیزم محافەزە دەکرێن حسابیان بکەین. لە ناو ئەواندا هیچ نەوعە تەشکیلاتێکی نهێنی و یا عەلەنی نیە. بەڵام ئەو جەواتانەی کورد کە وەختی خۆی لە تورکیەوە بۆ سوریا هیجرەتیان کردوە وە لە سوریادا حیزبی دیموکراتی کوردیان تەشکیل داوە توانیویانە بەعزێ ئەفکاری سیاسی خۆیان لە کوردستانی تورکیادا وە بەتایبەتی لە مەنتیقەی دیاربەکردا لە بەینی خوێندەواران ورئوسای کوردا بڵاو بکەنەوە.

هەروەها «حیزبی ئازادی» کە لە بارزان تەشکیل کراو «حیزبی دیموکراتی کوردستان» کە لە ئێران تەشکیل درا توانیویانە بەعزێ ئەفکاری سیاسی لە ناو کوردستانی تورکیا کە نیزیکی سەرحەدی کوردستانی ئێران و بارزانە بڵاو بکەنەوە. لە نەتیجەی حوکمی فاشیزمی تورکیا و ئەو جنایەتە وەحشی یانەی تورکیا کە لە کوردستان کردوویەتی وە بەئیجباری هەزاران کوردیان بۆ وڵاتانی دووری تورکیا تەبعید کردون ئێستا لە تورکیادا تەبەقەیەکی تازەی کورد لە کارگەران و خوێندەواران لە ناوکوردی تورکیادا هاتۆتە وجود کە ئەم تەبەقەیە هەمیشە وە لە هەموو لەحزەیەکدا زۆر بەئیحتیاقەوە چاوەڕێی فرسەت دەکەن کە بۆ نهزەتی کورد تەشکیلاتی وەتەنی و دیموکراتی خۆیان دامەزرێنن.

٢ – دووەم:حالی کوردانی عیراق تا دەرەجەیەک لەحالی کوردانی تورکیا و ئێران باشترە. سەبەبی ئەمەش ئەوەیە کە لە لایەکەوە ئەو ترس و تەهدیدەی کە هەمیشە حیزبەکانمان بەرعەلەیهی حکوومەتی عیراقی نیشان داوە. لەلایەکی دیکەشەوە لە نەتیجەی ئەو کۆمەگ و یارمەتیەی کە ئەحزابی کۆمونیست و دیموکراتی وەتەنی عەرەب کە لە عیراق و عەرەبستان تەشکیل کراون بۆ تەئییدی تەڵەباتی ئێمەو نەهزەت و پێشکەوتنی کورد بەرعەلەیهی ئیستعماری بێگانە نیشانیان داوین. لەو حیزبانە کە هەمیشە کۆمەگیان پێکردووین دەتوانین ناوی

حیزبی کۆمونیستی عیراق و حیزبی دیموکراتی وەتەنی و حیزبی میللەت ویەکیتی کارگەران و سائیرە بینین کە لە نەتیجەی ئەم سەبەبانە حکوومەتی عیراق و ئاغا ئینگلیزەکانیان بۆ هەڵخەڵەتاندنی بەعزێ ئینسانی سادەو بۆ سڵکت کردنی ئەعسابی کورد تا دەرەجەیەکی موعەیەن تەسهیلاتیان نیشانی میللەتی کورداوە.

جگە لە مانە لەکوردستانی عیراق ئەحزاب و تەشکیلاتی سیاسی نهێنی و عەلەنی هەنە کە لە مانەش لە تەشکیلاتی عەلەنی وەکوو حیزبی دیموکراتی وەتەنی و یەکێتی کارگەران کە لە شارەکاندا تەشکیل کراوە وە تەشکیلاتی خەڵقی عیراق. وە لە تەشکیلات و ئەحزابی نهێنی وەکوو حیزبی دیموکراتی ئێمە کە لەم زەمانی ئاخرەدا لە گەڵ حیزبی کۆمونیستی کورد بوون بەیەک حیزب و حیزبی رزگاری کوردە. ئەم هەموو حیزبانەش لە ئەوەڵین مەرحەڵەی مبارەزەی خۆیانداهەموویان یەک ئامانج و یەک غایەیان هەیە کە ئەوەش نەهزەتی میللەتی کورد وە بەرعەلەیهی ئیستعمار مبارەزە کردنە.

٣ ــــ سێی یەم : کە بێینە سەر حاڵی کوردستانی ئێران دەبینین کە لە پاشی تەواوبوونی شەری ئاخریمان کە زیدی ئیرتجاعی ئێران بوو ئەوجنایەتی وەحشی یانەو تیرۆرەی کە دەوڵەتی ئیرتجاعی تاران لە کوردستان کردی وە دەیک هەت دەرەجەیەک کوردستانی ساکت کردوە. بەڵام دەبێ زۆر چاک بزانین کە ئەو جنایەت و تیرۆر و ئیعدام و حەبس و تەبعید و تالانەی کە دەوڵەتی ئیرتجاعی ئێران لە کوردستاندا دەیکا وەئەو عەلەنی تەبلیغاتەی کە جاسوس و خائینانی وەتەن فرۆش بە وەسیلەی دۆلار و زێری ئەمریکاوە دەیکەن روحی مبارەزەی کوردی ئێرانی سەت قات زیاتر کردوە وە ئەو هەموو دیهاتی و کرمانج و عالم و رەئیس و گەورەی وەتەنپەروەری کوردی ئێران چەک و سیلاحی خۆیان لە چیاکاندا شاردۆتەوە وە زۆر بە ئیشتیاقەوە بەرعەلەیهی ئیستبداد و زاڵمی ئێران وە لە پیناوی نەهزەت و پێشکەوتنی کورد بۆمبارەزەیەکی قەتعی چاوەرێی فرسەت و رۆژی مبارەزە دەکەن کە نەمجارە بۆ وەرگرتنی ئینتقامی عادلانە لە گەڵ ئیستعماری جنایەتکار و ئیرتجاع هیچ جۆرە مجامەلەیەک و رحم ناکەن.

به تەبیعەت ئاشکرایە کە لە دنیادا هیچ میللەتێک نیە چەند کەسێکی وەتەن فرۆش و خاینی تێدا هەڵنەکەوێ. هەر وەها لە کوردستانیش ئەمثالی عەمەرخانی شکاک و نوری بەگ و مام عەزیز و عەلی ئێلخانی و محمەدئاغای عەباسی خاین و وەتەن فرۆش هەڵکەوتوە. بەڵام ئەمانە لە بەرامبەر کرمانج و دێهاتی و رەئیس و گەورەی وەتەنپەروەری کورد دا جائیزی هیچ جورە ئەهمیەتێک نین.

هەمووتان دەزانن کە کوردستانی ئێستای ئێمە لەم تەبەقاتەی خوارەوە تەشکیل دەبێ:

١ - دێهاتی و کرمانجی کوردی کە گەورەترین تەبەقەی میللەتی کورد تەشکیل دەکەن.

٢ باسەواد و خوێندەواران کە ئەمانەش لە عالمانی دینی و معلم و تەلەبەو مەئمورینی گچکەی حکومەت عبارەتن تەبەقەیەک تەشکیل دەکەن.

٣ - کارگەرانی کورد کە لە شارە گەورەکانی کوردستاندا وەک کرمانشا و دیاربەکر و وان و موسڵ دەژین تەبەقەیەکی کەم تەشکیل دەکەن.

٤ - ساحیبی سەنعاتی گچکە کە ئەمانەش تەبەقەیەکی زۆرکەم تەشکیل دەکەن.

٥ - ئاغاو رئوسای عەشایری کورد کە ئەمانەش تەبەقەیەک تەشکیل دەکەن.

٦ - تجارو بەقاڵەکان کە ئەمانەش تەبەقەیەک تەشکیل دەکەن.

بەمجۆرە قسمێکی گەورەی کوردستانی ئێمە لە مەرحەلەی دەرەبەگ و فئوداڵدایە و قسمی دووەمیشی لە مەرحلەی بۆرژوازی دایە. بە عمومیەت میللەتی کوردی حالی حازر بەکوللی تەعەسوب و ئیحترامی عەنعەنات و عاداتی قەومی خۆی دەگرێ. لەو بابەتەوە کورد ئیحترامی رەئیسەکانی خۆیان و بەتایبەتی بە ئیخلاس و ئیحترامەوە ئیتاعەی ئەو رەئیسانەیان دەکەن کە لەرێی کوردستاندا فیداکاری یان کردوە وە سەریان لە بەر دوژمن نەچەماندوە. وە محافەزەی پاکی ئەخلاقی ژن دەکەن وە ئیحترامی میوان دەگرن، وە زۆر بەتوندی محافەزەی ناو و شەرافەتی عائیلە و قەبیلەی خۆیان دەکەن وە دیفاعی لێدەکەن. وە

عادات و عەنعەنەی خسوسی میللەتی کوردیش لەوە دایە کە هەمیشە دەیەوێ بە روحێکی ئازادو مەرد بژیت وە لە پاش ئەودی کە خۆی لە سەر ئیشێک بەحەق زانی بێ حەق سەر ناچەمێنێ. وە بۆ ئەو قسە حەقانە کە دەیکا و ئەو پەیمانانەی کە دەیدا هەتا مردن ئیخلاسی نیشان دەدا وە بەعناد دیفاعی لێدەکا. وە بەرعەلەیهی ئەو کەسانەی خاین و مەسلەحەتی کورد لە پێناوی مەسلەحەتی شەخسی خۆیان لە ژێرپێ دادەنێن وە دروژنن نەفرەت و کەراهیەت نیشان دەدا. ئەمانەن کە لە روحیەت و ئەخلاقی میللەتی کورد مهمیترین وە یەکەمین جێگا دەگرنەوە کە زۆر پێویستە ملاحەزە بکرێن. میللەتی کورد بە کوللی بە تەبیعەتی خۆی مایلی قانوونی دیموکراسی یە.»

پاشان بارزانی ئەمر باسی ئامانجی سیاسی ئەو ریکخراوەیە دەکات کە بناغەی دارژابوو، دەڵێ:

**ئامانجی سیاسی :**

١ - لە گەل ازاد کردنی کوردستانی ایران جمهوریتیکی دیموکراسی دادەمەزری وە لە لایەن مجلسیکی میللی کە بە ازادی و بە هەلبژاردنی دەنگی نهینی هەلدەبژیررین ادارە بکری.

٢ - دەستی برایەتی و یەکیەتی بدەینە دەست فرقەی دیموکراتی ازربایجان و بەیەکەوە برعلیە ارتجاعی ایران و استعماری بیگانە مبارزە بکەین وەهەت وەکو خلقی ایران بە ازادی حقیقی و قانونی خوی دەگات مبارزەکەمان بە یەکەوە دوامی پیدەدەین.

٣ - ئەو جمهوریتە کوردیەی کە لە کوردستانی ایران تشکیل دەبی، دەبیتە استنادگاە بو ازادکردنی هەمو کوردستانی گەورە. وە ئەم جمهوریتە کوردی یە لە عراق و تورکیادا هەولی تشکیل داتی احزابی دیموکراسی دەدا وە لەو جیگایانە حرکاتی ازادی بە هیز دەکا وە تا وەکو هەمو کوردستان لە زنجیری اسارەت و نفوزی بیگانە ازاد دەبی پی ویستە مبارزەی خوی دوام پی بدا.

٤ - حزبی ایمە لە گەل همو احزاب و تشکیلاتی دیموکراسی و پروگریسیو کە

له شرقی ناوەنجی دا هەنە وەکو دوست و برای هەرە نیزیکمان حزبی دیموکراتی ازربایجان و حزبی توده و احزابی دیموکراتی عرب و تورک علاقەیەکی محکم پەیدابکا و کومگی متقابلیان پی بکا تا وەکو لە شرقی ناوەنجی دا نفوزی استعمار و ارتجاع وە روحی فاشیزم محوو نابود دەکا بە یەکەوە لە گەل ئەوان مبارزە دەکا.

٥ - بەستنی پەیمانێکی سیاسی و ئیقتسادی لە گەل حکوومەتی میللی ئیران و حکوومەتی میللی ئازەربایجان بۆ یەکێتی جەبهەی مدافعە بەرعەلەیهی فشاری خاریجی متقابل لە پەیماندا.

٦ - بەستنی پەیمانێکی دۆستایەتی سیاسی و ئیقتسادی لە گەل حکوومەتانی دیموکرات کە حکوومەتی شورەوی لە پێش هەموویان دێت.

٧ - بە گوێرەی وەزعی ئێستای کوردستان بۆ دەوام پێدانی حاکمیەتی موتلەقی دیموکراتی لە کوردستاندا پێویستە هەموو تەبەقەکانی کورد وە ئەو خەلقانەی کە لە کوردستاندا دەژین بە بێ فەرق و جودایی بە رێگای هەلبژاردنی ئازاد لە حوکمدا ئیشتراک بکا.

بارزانی ئەمر لەم بارو دۆخە پەرێشانە و لە ئاوارەییدا، ئامانجی ئابووری رێکخراوەکەیان و ژیان و بژێوی خەلکی کورد دێنێتە بەر باس و دەلێ:

٨ - پێوویستە حالی میلەتی کورد بەتایبەتی دێهاتی و کرمانجی کورد چاک و خۆش و مەدەنی بکرێ.

٩ - هەموو جەنگەلەکان و رووبارەکان ورێگاکان ومەعادنی ژێرعەردوبانگەکان وکوێستانەکان وپاوانەکان دەبێ ملکی عمومی میللەت بن.

١٠ - ئەو ئەرازی یانەی کوردستان کە لە لایەن دەولەتە ئیشغالگەرەکانەوە داگیرکراوە وە کراوە بە خالیسە، پێویستە لە سەر کرمانج و دێهاتی فەقیر تەوزیع بکرێ.

١١ - بۆ ئەوەی لە کوردستان تەبەقەی کارگەران ئیجاد بکرێ و کوردستان لە مەرحەلەی دەرەبەگی یەوە بە زوویی بچێتە مەرحەلەی بورژوا پێویستە لە مەوادی

خامی کوردستان ئیستفادە بکرێ و تەشجیعی سەناعەت بکرێ وە بەتایبەتی تەشجیعی سەنعەتی ئالات و ماشینی زەراعی بکرێ.

١٢ - بۆ ئەوەی محافەزەی حقوقی دیهاتی و کرمانج بکرێ، پێویستە بەپێی قانون عەلاقەی بەینی کرمانج و ساحیب ملک موعەیەن بکرێ کە بە هۆی ئەو قانوونەشەوە دیهاتی و کرمانج مقابل بە زەحمەتی خۆیان قسمێکی کافی مەحسولەکەیان بۆ خۆیان هەڵگرن. وە هەر وەها پێویستە بۆ کارگەرانیش قانوونی کار دابنرێ کە حقوقی کارگەر محافەزە بکرێ و حەقی زەحمەت و مدەتی ئیشی تێدا دیاری بکرێ.

١٣ - پێویستە بە قەتعی لە کوردستاندا شرکاتی ئەجنەبی و ئیستیسمارچی قەدەغە بکرێن، وە پێویستە عناصری ئیحتکارچی و ئینحسارچی لە کوردستاندا مەحو وە نابود بکرێ، وە لە جێی ئەوان بە گوێرەی مەسڵەحەتی میللەت وە لەژێر نەزارەتی حکوومەتی میللی شرکاتی کۆپراتیف دروست بکرێن.

١٤ - بانگێکی مەرکەزی تەئسیس بکرێ بۆ ئەوەی کرمانجی کورد لە فائیز وقەرز رزگار بکرێ. بانگێکی زەراعیش پێویستە دروست بکرێ.

١٥ - تجارەتی داخلی وە لە گەڵ دەوڵەتانی دیموکراتی تجارەتی خاریجی و مەسنوعاتی وەتەنی و ئیشی کوپراتیف پێوۆستە تەشجیع بکرێ.

١٦ - هەموو مەعادنی ژێر عەرد وە بەتایبەت مەعدەنی نەوت پێویستە ئیستیحسال بکرێت.

١٧ - دەبێ جەنگەڵەکانی کوردستان و زەراعەت لە کوردستاندا، وە بە تایبەت زەراعەتی توتن لە سەر رێ و شوێنی فەننی تازە چاک بکرێ وە لە پێناوی مەنافیعی میللەت دا ئیستفادەی لێ بکرێ.

١٨ - پێوویستە فیکر بدرێتە زۆر کردن و چاک کردنی جنسی مەر و ماڵاتی کوردستان.

١٩ - تەکالیفی دەوڵەت دەبێ لە گەڵ مەعیشەت و وارداتی میللەت موتەناسیب و عادلانە بێت.

پاشان دێته سەرباسی ئامانجی کۆمەڵایەتی ودەڵێ :

٢٠ - پێویسته له کوردستاندا تەرەقی به عیلم و سەواد بدرێ وه هەتاکو سینفی شەشەم خوێندن دەبێ ببێته ئیجباری وه بۆ تەربیەتی منداڵان دەبێ باغچەی منداڵان بکرێنەوه. وه بۆ ئەوەی ژن له حەیاتی ئیجتماعیدا ئیشتراک بکا پێویسته مەکتەبی کچان بکرێنەوه و باسەواد بکرێن. هەر وەها پێویسته له کوردستاندا مەکتەبانی عالی بکرێنەوه بۆ خوێندن و عیلم وەرگرتن بۆ وڵاتانی دیموکراسی زۆر تەلەبه بنێردرێن. وه دەبێ رۆژنامه بەزمانی کوردی بێت و ئەهمیەت بدرێته ئەدەبیاتی زمانی کوردی.

٢١ - پێویسته بەرعەلەیهی روحی دەرەبەگی و ئاغایەتی و عەشیرەتی ومیللەتچیەتی، وه بەرعەلەیهی ئیختلافاتی مضر وەکو ئیختلافاتی مەزهەبی و قەومی و دینی وه سائیره مبارەزەیەکی قەتعی بکرێ.

٢٢ - پێویسته له کوردستاندا زۆر نەخۆشخانه بکرێنەوه، وەدەبێ نەخۆشخانەکاندا نەخۆشی به خۆرایی تەداوم بکرێن .وه هەروەها پێویسته بۆ ئەو نەخۆشی یانەی که له کوردستاندا زۆرن نەخۆشخانەی عالی یان بۆ بکرێتەوه، به تایبەتی بەرعەلەیهی نەخۆشی مالاریا پێویسته زۆر مبارەزه بکرێ.

٢٣ - پێویسته له ژێر نەزارەتی حیزبی ئێمەدا تەشکیلاتی جەوانان دروست و تەشجیع بکرێ.

٢٤ - پێویسته له ژێر نەزارەتی حیزبی ئێمەدا تەشکیلاتی یەکێتی کارگەران وه یەکێتی دێهاتی و تەشکیلاتی ئیجتماعی که پێویست بێ دروست بکرێ.

٢٥ - پێوویسته به گوێرەی مەدەنیەتی عصری تازه وه بۆ نمونه دێهاتی مەدەنی تازه له کوردستاندا دروست بکرێ.

٢٦ ــــ پێویسته زمان و قەڵەم و دین و معتقدات جگه له فاشیزم، ئازادبێت.

٢٧ ــــ پێویسته تەشکیلاتی تەربیەتی بەدەنی و سینەما و تیاترۆ دروست بکرێن و تەشجیع بکرێ.

٢٨ ــــ پێویسته عناصری رشوەتخۆر و منافق وخود پەسند، وه روحی

مدافەعەی منافعی خزمایەتی مەحو بکرێن. وە مبارەزەی قەتعی یەن بکرێ. ئەعمالی فاحشە و تریاک و قومار. وە لە جیاتی ئەوە تەشجیعی مەقدەردتی شەخسی بکەین وە بۆ گەیشتنی مناسیبی گەورە و پێشکەوتنی ئەوانەی کە لە پێناوی مەسلەحەتی عمومی میللەتدا فیداکاری و ئیخلاص نیشـن دەدەن کۆمەگیان پێبکەین.

ئامانجی عمومی مان :

٢٩ ــ بۆ ئەوەی کوردستانی ئازاد مدافەعە بکرێ پێویستە وفەرزە لە سەر هەر فەردێک کە لە کوردستاندا دەژیت مودەتێکی موعەیەن تەعلیماتی عەسکەری ببینێت و خزمەتی عەسکەری بکەن.

٣٠ ــ پرۆگرام و منهاجی حیزبی ئێمە بەشەرتی محافەزەکردنی ئەساسی دیموکراسی بە گوێرەی وەزعی سیاسی و ئیقتسادی و ئیجتماعی کوردستان پێویستە بەپێی زەمان ئیسلاح و گۆرینی مومکین بێت.

٣١ ــ حیزبی ئێمە پارێزگاری لە مەسالحی هەموو تەبەقاتی میللەتی کورد ئەکات. بۆیە هەموو ئەسنافی ئاغایان و کرمانجان و تجاران و کارگەران و روشنفکران و خوردەمالکان و سەنعەتکاراتی پچوک ئەگرێتەوە و هەموو ئەم ئەسنافانە کۆ دەکاتەوە لە ژێر یەکێتی جبهەی ئازادی نیشتمانی مدافعی مەسالحی موشتەرەکی هەمو تەبەقاتە. مبارەزە لە بەینی تەبەقاتدا لە کوردستان لە ژێر رەهبەری ئەم حیزبەدا جایز نیە.

٣٢ ــ حیزبی ئێمە حیزبەکی پرۆگرەسیڤە لە ماهیەتدا هەر وەکو لە برامج و تاکتیکدا دەر ئەکەوێت.

٣٣ ــ لە نەتیجەی ئەم مبارەزەی قەتعی ئێمەدا پێویستە شکلی ئەو حاکمیەتی موتلەق دیموکراسی کە لە کوردستان دادەمەزرێ لە منهاج و پرۆگرامی حیزبی ئێمەدا نیشان بدرێ وە هەر ئەوەشە ئێمە دەتوانین تەئمینی منافع و رەغبەتی حەقیقی و ئازادی میللەتی کورد بکەین. بێجگە لەوە هەر چ نەوعی حاکمیەتێک کە لە ژێر پەردەی دیموکراسی وە بە ناوی ئازادی کە لە

نەتیجەی فکرو خەیالی مەنحوسی ئیمپریالیزمانە وە لە کوردستان دادەمەزری، بەرعەلەیهی منافعی کوردە کە زیاتر دەیەوێ میللەتی کورد لە ژێر زنجیری ئەسارەتدا پان بکاتەوە. کە وابوو واجبی ئێمە ئەوەیە کە هەرچی نەوعە تەشکیلاتێک وە یان حاکمیەتێک کە ئیلهامی لە حیزبی ئێمە وەر نەگرتبێ و لە سەر ئەساسی دیموکراسی لە ژێر رەهبەری حیزبی دیموکراتی ئێمە دانەمەزرێ، ئەو حاکمیەتە وە یا تەشکیلاتە پوشالی یە ئیختراعی ئیمپریالیزمی مەنحوسە وە بەرعەلەیهی منافعی کوردە پێویستە لە سەر ئێمە مبارەزەی ئە و نەوعە تەشکیلات و حاکمیەتە پۆشالی یانە و هەموو پلانەکانی ئیمپریالیزمان بکەین.

**خلاصە:**

ئەمە لە بابەت تاریخی کورد و ئەو عامیلانەی مهم کە بوونەتە مانعی نهزەت و مەدەنیەتی کورد و وەزعیەتی حالی حازری کوردستان تەنیا شتێکی موختەسەرە کە لە نەتیجەی تەجروبەی شەخسی خۆمدا وە لەو مەعلوماتانەی کە لە مبارەزەکانی دوورو درێژی ژیانمدا بەدەستم کەوتبو وە بە خەیالمدا هات ئێستا بۆ ئێوەم شەرح دا.

بە تەبیعەت هیچ شوبهە ناکەم کە ئێوەش هەر یەکێکتان لە نەتیجەی تەجروبەی شەخسی خۆتان مەعلوماتی زۆرتان هەیە. لە بەر ئەوە خاهیش دەکەم لێرەدا ئێوەش هەر رەئیەک کە هەتانە شەرحی بدەن کە ئێمە لە نەتیجەی مناقەشە وە بە گوێرەی مەسلەحەت و منافعی کورد بگەینە نەتیجەیەکی مەعیەن و ئاشکرا، چونکە هەرئەوەیە کە تەعیینی خەتی حەرەکەتی ئەساسی حیزبی ئێمە دەکا. وە لە جەلەسەی ئایندەماندا دەخرێتە تەسویت وە لە پاش قەراردان شکلی پرۆگرام و منهاجی حەقیقی وەر دەگرێ و عەمەلی دەکرێ، وە لە جەلەسەکانی دیکەماندا نیزامی داخلیش مناقەشە دەکرێ. وە ئێمە لە خودای گەورە دوعا دەکەین کە ئێمە بۆ گەیشتنی غایەکەمان موفەق بکا.

ئێمە لە ژێر شعاری :« وطنی ئازاد وە میللەتی خۆشبەخت » مبارەزە دەکەین. سرری عەقیدەی غالب بوونمان لە وەدایە کە مبارەزەی ئێمە حەقە و بۆ منافعی

میللەتەکەمان و ئینسانیەتە.»»(١٦)

ڕێزمانی ئەم باسە هەر وەک خۆیەتی بەڵام ڕێنووسەکەی دەستکاری کراوە .
دانەر

پێکهێنانی ئەم ڕێکخراوەیە لە ئاوارەیی و دەربەدەریدا بە بەشداری کوردەکانی ڕۆژهەڵات و خوارووی کوردستان لە لایەن بارزانی نەمرەوە ئەم ڕاستی بە نیشاندەدا کە مستەفا بارزانی هەمیشە کوردستانی بە یەک وڵات و کوردیشی بە یەک نەتەوە داناوە. لەم هەنگاوەشدا ڕوونی کردۆتەوە کە پێویستە لە یەک ڕێکخراودا و بۆ یەک ئامانج بە تێکڕایی خەبات بکرێ. وەک لە دەقی وتارەکەیدا دەبینین بە گوێرەی کات و هەل ومەرجی ئەو دەمیش ئامانجی خەبات و تێکۆشانی ڕوون کردۆتەوە. لە ڕەوەندی ڕووداوەکان وادەردەکەوێ کە ئەم کۆبوونەوەو تێکۆشانە درێژەی نەبوە. هۆی سەرەکی سەر نەگرتن و پێشکەوتنی ئەم بزووتنەوە و ڕێکخستنەی کە لە ئازەربایجانی سۆڤێتی بناغەیان دارشتوە، دەبێ لەوەدا بدۆزرێتەوە کە باغرۆفی سەرکۆماری ئازەربایجان نەیویستوە کوردەکان لە ئاوارەییش دا تەشکیلات و ڕێکخراوەی خۆیان هەبێ. تەنانەت ویستوویەتی بیانلکێنێ بە تەشکیلاتی فیرقەی ئازەربایجانەوە ، هەر وەک لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا هەولی بۆ ئەم ئامانجە دزێوە دەدا. بێگومان سەرۆک بارزانی نەچۆتە ژێرباری ئەم بۆچوون و ئامانجە چەپەڵەوە. هەر ئەوەش بۆتە هۆی کە لە ئازەربایجان دووریان خستۆتەوە و بارزانیەکانیان لە یەر یەک بڵاو کردوە و تووشی نارەحەتی و شپرزەیی یان کردوون. پاش مردنی ستالین ولەداردانی باغرۆف وبیریای جنایەتکار، بارزانی خۆ دەگەیێنێتە مۆسکۆ ویەکسەر داوای چاوپێکەوتنی ڕێبەرانی سۆڤیت دەکا، پاش ئاگاداربوون لەوەزعی بارزانی وخەبات وتێکۆشانی بەگەرمی وەریدەگرن ودەیهێننە مۆسکۆ. لەمۆسکۆ وەک ڕێبەرو سەرکردەی میللەتێک ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن. تەنانەت خرۆشچۆف داوادەکا چاوی پێبکەوێ ولەڕابردووی ژیانی ئاگادار بێ. پاش جێگیربوونی لەمۆسکۆ ئەمجارە وەک ڕێبەرێک دەچێتەوە ئوزبەکستان وسەری هاوڕێیانی ئاوارەی دەداو هێندێکان

دینیته مۆسکۆ بۆ خوێندن و بەگشتی گۆڕانێکی تەواو لەژیانی ئاوارەیی ویر لە کونرموەری یاندا پێک دێت.

بارزانی نەمر لە ئاوارەیی و دەربەدەریشدا ئاوات و ئامانجی هەر ئازادی کوردستان و رزگاری نەتەوەی کورد بوە. بەڵام بە داخەوە پاش ٥٠ساڵ ئەم ئاواتەی سەرۆک بارزانی قەت نەهاتەدی. کوردواری وازی لە دوو بەرەکی و کەڵەوەکێشی و یەکترکوشتن نەهێنا و هەروا لە نێوگەمەی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان و لە ژێردەستی و بێبەشیدا دەتلێتەوە و رێبەرانی حیزب ورێکخراوە کوردی یەکانیش بە فیتی دوژمنانی کورد ملیان دەبەر یەکتر ناوەو خوێنی لاوانی کوردیش لەسەر دەسەڵاتی حیزبی، (نەک دەسەڵاتی نەتەوەیی) بەکوردستان وەر دەکەن.

# بووژانەوەی تێکۆشان و دامەزرانی کۆمەڵەی لاوانی لادێ

دوای لە سێدارەدانی پێشەوا ویارانی و ئەفسەرانی کۆماری کوردستان و گرتنی بەشێک لە کاربەدەستانی حیزب و حکوومەتی میللی کوردستن و ڕاکردنی هێندێکیان بۆ عیراق، تا ماوەیەک شێوە حکوومەتێکی سەرکوتکەری نیزامی لە کوردستان بەرێوە دەچێت. بەتایبەت ئەو ژاندارم و ئەفسەر و قازاخنەی کە سالی ١٩٤١لە کوردستان چەک دەکرێن ورادەکەن ، دەگەڕێنەوە کوردستان و بە شلتاخ و شەڕلاتانی و بە دەستکیسی زۆڵە کوردی خۆفرۆش دەست دەکەن بە ڕاو ڕووت و ئازاردانی خەلک و ئاگر دەکەنەوە.

کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دێموکرات و کۆماری کوردستان هەرچەندە لە بواری ژیاندنەوەو وریاکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی دابە قوڵی کاریان کردبوە سەر بیروڕای خەڵک، بەڵام بیر لەوە نەکرابۆوە و یا پێرانەگەیشتبوون کە بنیات و بنگەیەکی تیئۆری و فیکر ی نەتەوەیی و کردەوەیی پتەوی ئەوتۆ دابمەزرێنن کە لە ڕۆژی لێقەومان ورووداو و کارەساتدا، بتوانن یەکێتی بیرورا و رێکخراوەیی بپارێزێ و بەگوێرەی بارودۆخی رۆژ و بەشێوەی جۆر بەجۆر خەبات درێژە پێبدا و نەهێڵی خەڵک توشی تاسان و سەر لێشێواوی بێت و بنگەهی خەبات لە بەر یەک هەڵ وەشێتەوە.

بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی و تام و چێژی ئازادی سەردەمی دەسەلاتی نەتەوەیی حکوومەتی میللی کوردستان و بێدەسەلاتی حکوومەتی تاران لە سەر کوردستان لە لایەک و داخ و بێزاری کۆمەلانی خەلک لە تێکچوونی کۆمەری

کوردستان و له داردانی پێشەواو گەرانەوەی حکوومەتی تاران لە لایەکی تردوە، دەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵک بە بێ بوونی ناوەند وبنیاتێکی رێبەرایەتی بە گوێرەی تواناو دەرفەت و تێگەیشتوویی و لێکدانەوەی بار ودۆخی سیاسی. بۆ سازکردنی رێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بۆ نوێکردنەوەی خەبات دەست بەکاربن و شێوەی جۆر بەجۆر بە کار بێنن.

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٧ بە ئیبتکار و راوێژ و دەستپێشخەری تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەری کوردستانی گەرمێن بەناوی عبدالقادر کە پاشان دەبێتە (میرزاقادر) لە گەڵ چەند لاوی خوێن گەرمی تێکۆشەری ناوچەی سندوس وشنۆ ( کۆمەڵەی لاوانی لادێ )دادمەزرێ. میرزاقادر لاوێکی سەڵت و رەبەن و بێ ژن و ماڵ بوو. لە گەڵ بارزانیەکان هاتبوە کوردستانی ئازاد و پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان و رۆیشتنی بارزانیەکان، لە ناوچەی شنۆ لە گوندی (نەڵۆس) دەگیرسێتەوەو خۆی مەلاس دەدا و لە خانوچکەیەکدا خەریکی کرێکاری و فەعلەیی دەبێ. لە ئاخافتن و بۆ چوون و لێکدانەوەی دیار دەبوو کە لە کوردستانی گەرمێن دمێ لە سیاسەت وەرداوە و تەنانەت لە وە دەچوو کە سەر بە رێکخراو یا بیرێکی چەپ بووبێت. لە سەر راوێژو پێشنیاری ئەو دڵسۆزە نیشتمانپەروەرە تێکۆشانی کۆمەڵە دەبوایە لەسەر بنچینەی دژایەتی وخەبات دژی دەرەبەگ وئاغاوخاوەن ملکی کوردبەرێوە بچێ، دەبوایە کۆمەلانی خەڵک بەوە گۆش بکرێن کەهۆی تێکچوونی کۆماری کوردستان خەیانەتی دەرەبەگ وهێندێ سەرۆک عەشیرەتی کورد بوە، نەک دەسەڵات وهێزی حکوومەتی تاران. بۆیەربەرەکانی ودژایەتی ئەم توێژەی کۆمەڵ پێویستە لە هەر گوندێ چەندلاوی تێگەیشتوو ئامادەبکرێن و لە نووسراوەو بلاوکردنەوەی بەیاننامەو شەونامە چارێ دەبوایە دەست رابگیرێ وهیچ بەڵگەو بیانوێک نەکەوێتە دەست ژاندارم وئاغاکان. دوای یەکتردیتنی چەند کەسی تێکۆشەرو چالاکی دەورانی کۆمەڵەی ژ. ک و حکوومەتی میللی لە گوندی(ئالیاوێ شێخان) لەماڵە سەیدعەلی حاجی کاکەمینی بەبەشداری (میرزاقادر، سەیدعەلی حاجی کاکەمینی، مستەفا ساوجبلاغچی، سادق پێشنماز(کاوە) محەمەدی حاجی

رەسولی قاوەچی و کەریمی حسامی)لەئاخری جۆزەردانی ١٩٤٧( کۆمەڵەی لاوانی لادێ ) دادەمەزرێ. پاشان سێ تێکۆشەری ناسراوی دیکە(حەمەدی خانمێ وهەمزەی عەولای وسێنێی) خەڵکی دەربەندی سندوسی و عەولاسەوار لە شاری شنۆ لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە زیاددەکرێن. هەرە١٥رۆژ جارێک دامەزرێنەرانی کۆمەڵە لە (بازاری مەحمەدیار)* کۆدەبنەوەوباسی چالاکی ودەنگوباس وشێوەی پێوەندی وئاخافتن لەگەڵ خەڵک دەکەن. قاوەخانەی محەمەدی سۆفی رەسووی لەنەغەدە دەبێتەمەکۆوپێگەی دەنگ وباس وپێوەندیی وتێکۆشەرانی کۆمەڵە لەوشوێنە یەکتردەبیننەوە. کۆمەڵەی لاوانی لادێ لەزۆربەی گوندەکانی سندوس وشنۆ وتەنانەت لەبەری پیرانان ولاجانیش لەهەرگوند چەند لاوی خوێن گەرمی نیشتمان پەروەر پەیدا دەکاو دژی زوڵم و زۆری ئاغاکانی سەربە حکوومەت شێوەی جۆربەجۆری تەبلیغات بەکاردەهێنن. هەوەڵین بەیاننامەی(کۆمەڵەی لاوانی لادێ)بەبۆنەی ٢١ی ئازەر(١٢ی دیسامبری ١٩٤٧) رۆژی گرتنی تەوریزلەلایەن ئەرتەشی ئێرانەوە لەشارەکانی شنۆو نەغەدە و بەری پیرانان بلاودەکرێتەوە. لەم پێوەندی یەدا ناکرێ تێکۆشانی بەرێزان مەلامحەممەدی شێخی. سەید حەمەدی زەرگەتنی وکاک ئەحمەدی زیدان وکاک مامەندی زەرگەتەنی و کاحەمەدی سەروکانی(کاپیتان قادری) فەراموش بکرێ. بەتایبەت ئەمەی ئاخرین (کاپیتان قادری) کە یەکی لە ئەفسەرانی سوپای میللی کۆماری کوردستان ومیدالی قارەمانەتی لە لایەن پێشەوای نەمر قازی محەمەدەوە پێ بەخشرابوو. دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان لەگەڵ کاک ئەحمەدی برای کە ئەویش ئەفسەری کۆماربوو، رادەکەن ودەچنە کوردستانی عیراق ولەگوندی خەلان لەمالی جەنابی شێخ عەلائەدین دەگیرسێنەوە. پێویستە بڵێین گوندەکانی خەلان وزێنوێ، مالی

---

مەعمەدیار گوندێکی گەورەی عەجەمانە لە ناوچەی سندووس. هەموو رۆژانی هەینی بازارێکی حەفتەیی لێ ساز دەکرێ. لەهەموو ناوچەکانی کوردستان و لە بەری عەجەمیش خەڵک بۆ کرین و فرۆشی شتی خۆیان دێنە ئەو بازارە. لە کوردستان چەند بازاری دیکەش هەن. ئەمجورە شوێنانە بۆ دیدارو پێوەندی کاری نهێنی فرە رەخساوو لە بارن.

بەریزان شیخ عوبیدولاو شیخ عەلائەدینی رەحمەتی ببوە پەناگای ئاوارەو لیقەوماوانی کوردو لێی پەنادەدران و دەحەسانەوە. تێکچوونی کۆماری کوردستان ورەی تێکۆشانی کاپیتان قادری لاواز ناکاو لە گەڵ تێکۆشەرانی کوردستانی گەرمێن دەکەوێتە دانوساندن. لەلایەن پۆلیسی نووری سەعیدەوە دەگیری ودەیبەنەرەواندز وبەغدا.لەم گیرەوکێشەیەوپێوەندی گرتن لەگەڵ ئازادیخوازانی ئەودیو، بیروهزری زیاتردەکرێتەوەو دەکەوێتە سەر ڕێبازی زانستی خەبات بۆئازادی ورزگاری لە چەوسانەوە. پاشماوەیەک دەگەرێتەوە کوردستانی ئیران و بە ئەزموونی شێوەی تێکۆشانی تێکۆشەرانی پێشکەوتنخوازی ئەودیو. لەرێنوێنی ویارمەتی فیکری وکردەوەیی کۆمەڵەی لاوانی لادێ دا، دەورێکی گرینگ یاری دەکا. کۆمەڵەی لاوانی لادێ لاوێکی مێرمنداڵی ژیری خەت خۆش بە ناوی(کەریم پارسا) لەنەغەدە بۆ نووسین وئاڵقەی پێوەندی نێوان ئەندامانی دامەزرێنەر دەدۆزێتەوە و نووسراوەکانی پێویست لەلای ئەورادەگیرێن.*

## بڵێسەی خەبات لەگەشانەوەدایە

روخانی کۆماری کوردستان وگەرانەوەی حکوومەتی تاران. راستە خەڵکی کورد خەفەتبار و داخدار دەکات، بەلام ورەی خەڵک نامرێنێ. نەک هەر ئەوە بەڵکوو قین وبێزاری و توڕەیی خەڵک لە دەسەلاتی داگیرکەران وەک ئاگری بن زیلەمۆ دێ بگەشێنێتەوە. لە ناوچەی چۆمی مەجیدخان لە گوندی(قەلای رەسولەسیت)

* دوای روۆخانی رێژیمی شا کەگەرامەوە بۆ ئێران سۆراغی کەریم پارسام گرت. بەداخەوە نەمابوو لێک دیدار ناخۆەت بووین. لەمەهاباد رۆژێک پێشمەرگە شۆفێری توتوبوسێکیان هێنافیشەکیان لێگرتبوو بۆ تەوریزی دەبرد. خاوەنی فیشەکەکان رایکردبوو. لێم پرسی خەڵکی کوێی وچکارەی؟ کوتی خەڵکی نەغەدەم وکوری کەریم پارسام. هەستام ماچم کرد ، خۆم پێ ڕانەگیراو گریام. کوتم کرێی بارەکەت وەرکرتوە؟ کوتی پێشەکی وەرم گرتوە دەلێی تا بیدەم بەحیزب. جارێکی دیکەش ماچم کردو کوتم سلاوی دایکت بکەپێنە بارەکەش بۆخۆی هەلگرە.

خوالیخۆشبوو (مەلانەمجەدی عوسمانی)کە نیشتمانپەروەرێکی ناو بەدەردودی کۆمەڵەی ژ. ک و حیزبی دیموکرات و زانا و شاعیر و خەت خۆش و مۆر هەڵکەنێکی بێ هاوتا بوو، دەست دەداتە داهێنانێکی بێ وێنە و ئیبتیکارێکی بلیمەتانە. بە خەتێکی زێڕ کفتی جوانتر لە چاپ بانگەوازێک بەم چەشنەی خوارەوە دەنووسی و بڵاودەکاتەوە:

«... بە ناوی خودای گەورە و بێهاوتا. هاونیشتمانانی خۆشەویست! سەربۆ حکوومەتی عەجەم دامەنوێنن. کۆماری کوردستان نەروخاوە، حیزبی دیموکرات هەر ماوە، پێویستە خەبات نەوەستێ و درێژەی هەبێ. هەرکەسێ ئەم بانگەوازەی بگاتە دەستی،وەک واجبێکی ئایینی و ئەرکی نیشتمانی دەبێ حەوت نوسخەی لە بەر بنووسێتەوە و بیدا بە حەوت کەسی دۆست و ناسیاوی خۆی و بڵاوی کاتەوە.»

ئەم نووسراوەیە لە رێگای بازاڕەکانی باسکراو بە نێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە. کەس نازانی کێ نووسیویەتی و لە کوێوە هاتوە. خەڵک دەکەوێتە پرسیار و قوتە قوت دەیانەوێ کانگاو خاوەنی نووسراو بدۆزنەوە. لە رێگای بازاری مەحمەدیارەوە دەگاتە دەستی ئەندامانی ( کۆمەڵەی لاوانی لادێ)ش، بەچەشنێکی هەراو لە ناوچەی سندوس و شنۆ و لاجان بڵاو دەکرێتەوە.

## مەهاباد تەم ومژی خەفەت وبێدەنگی دەرەوێنێ

مانگی سەرماوەزی ۱۹٤۷،خەڵکی مەهاباد تەم و مژی خەفەت و بێدەنگیی دەڕەوێنن و جلی تازیە و رەشپۆشی فڕێدەدەن و تووڕەیی و بێزاری ئاشکرای خۆیان دژی دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتانی سەر بە حکوومەت دەردەبڕن. رۆژی ۲۱ی سەرماوەز حکوومەتی تاران بە بۆنەی گۆیا رۆژی ئازادکردنی ئازەربایجان و کوردستانەوە وەک شارەکانی دیکە لە مەهابادیش سان و رێژەی لەشکری هەم بەو بۆنەوە و هەم بۆ چاو ترسانی خەڵک ساز دەکات. تەواوی ئاغاو سەرۆک عەشیرەتان بە سوارەو دەست و پێوەندی خۆیانەوە بۆ بەشداری لە گەڵ رێژەی

ئەرتەش دێننە مەهاباد. لە سەر ئەوە کە کام سەرۆک عەشیرەت پترنۆکەری حکوومەتی عەجەمی کردوە، دەبێ لە پێشەوە بڕوا، لە نێو خۆیاندا دەبێتە کێشەو هەرا. کاتێ سوارەی عەشایر بەپێش فەرماندەی لەشکردا تێدەپەڕن و دێن بڵاوەی بکەن لە لایەن متدالانی مەدرەسە و خەڵکی دیکەوە دەکەونە بەر پەلاماری بەردو هێلکەو تەماتە رزیو و بە( هۆیها) بە کۆلانەندا راویان دەنێن و تاریان دەکەن. ماوەیەکی زۆر لە مەهاباد دەبێتە داب ئەگەر ئاغایەکی سەر بە حکوومەت بە نێو بازار دادێت، لە هەموولاوە لێی لە هەلاو هۆیها دەدەن و بۆی لە تەنەکە دەدەن. ئەم هەرایە سەر دەکێشێتە دایرەکانی پۆلیس و ئەرتش و دەگەڕێن سەبەبکار بدۆزنەوە، بەلام هەرایەکە گشتی یە و کەسێک دیاری ناکرێ، پولیس بە هەرەشەیەکی گشتی واز دەهێنێ. ئەم بەزمە سەردەکێشێتە شارەکانی تریش و هیچ بەرنامەیەکی سیاسیشی لە گەڵ نیە. بەلام ئیتر ئاغاکان بە تەواوی هەست بە نەفرەت و بێزاوی خەڵک لە خۆیان دەکەن و لە نێو شاردا خۆ دەپەنایان دەگرن.

## بڵاو بوونەوەی گۆڤاری ڕێگا

مانگی ڕێبەندانی ١٩٤٨ گۆڤاری (ڕێگا) بە نهێنی لە شاری مەهاباد بڵاو دەکرێتەوە. ڕێگا هەوەڵین نووسراوەی چاپکراوی سیاسی یە کە دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بڵاو دەکرێتەوە.

ڕێگا چبوو، لە کوێوە هاتبوو؟

غەنی بلوریان کە لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە گەڵ کۆمەڵێک لاوی کورد بۆ خوێندن ناردرا بوونە سۆڤێت دوای تێکچوونی کۆمار لە گەڵ چەند کەسی دیکە دەگەڕێتە وە ئێران و دێتەوە مەهاباد.

«... پاش ئەم کارەساتە دڵتەزێنە(لەداردانی پێشەواو هاوڕێیانی. ن)من وغەنی بلوریان ومحەممەدی رایانی کە لێک نیزیک بووین، بڕیارماند لە مەهاباد دەرکەوین و بەدوای چارەنووسێکی نادیاردا ڕوو بکەینە تاران. بیستبوومان هێندێ

خوێندکاری زانکۆی پزشکی باکۆ که بەر له ئێمه بۆخوێندن چووبوونه باکۆ گەڕاونەوەو تاتەکلیفیان دیاری دەکری له دانشسەرای سەرەتایی له شەقامی ڕۆزڤێلت ڕایانگرتوون. چووینه دانشسەرا. هێندێکمان دەناسین. گوتیان بچنه لای وەزیری فەرهەنگ و داوای یارمەتی لێبکەن کەرێگاتان بدات تا تەکلیفتان ڕوون دەبێتەوە لەدانشسەرا بژین و لەوێ بخەون ولەخواردنی دانشسەرا کەلک وەربگرن. وەزیر موافەقەتی کرد. هاوینی١٣٢٦(١٩٤٧) بەپارەیەکی کەم ئەمر ئەژی ڕامان دەبوارد. ڕۆژێک لەوەزارەتی فەرهەنگ تووشی دوکتور محەممەد موکری بووین که لەپێشدا سەرۆکی فەرهەنگی مەهاباد بوو. ئێمەی ناسی ولەرەنگ وڕوومان بۆی دەرکەوت کەبرسین. بردنیه مالی خۆیان. ئیتر هەموو ڕۆژەکای هەینی دەچووین له مالی ئەوان تێر پلاو و گۆشتمان دەخوارد. تەنانەت ڕۆژێکیان لەمالی ئەوان بەخزمەت حاجی سەید عەبدولا ئەفەندی و ژەنڕال ئیحسان پاشا گەیشتین.

ڕۆژێک لەدەرەوە لەرەستورانێکی هەرزان قیمەت نانمان خوارد. پاش سەعاتێک ژانه سکمان گرت. غەنی بلوریانیان بردە خەستە خانە ولەوێ ئاپاندیسیشیان عەمەل کرد. دوایه کزو داماو گەڕاینەوە بۆ دانشسەرا. چونکه دیپلۆممان نەبوو، بەهار وهاوین خەریکی فێربوون وخوێندن بووین، بۆ ئەوەی له دەبیرستان وەرمان بگرن، دەبوایه دیپلۆمەمان هەبێ. خەبەرمان زانی که نه دەبیرستانی دارایی قوتابی وەردەگرن. چووینه کن سەرۆکی دەبیرستان. کابرایەکی قۆڕدەماغ. گوتبووی هەر یەکیان بێته ژووری. قورعه بەناوی غەنی بلوریان دەرچوو. پاش تاوێک بەخەمباری ولارەملی گەڕایەوە، گوتی: ڕاستەو ڕاست گوتوویە: خۆشیمان لەگوردان نەدیوە، ڕاتان ناگرین. گەڕاینەوە بۆ دانشسەرا. لەوێش گوتیان مانەوەتان لێره قەدەغەیە. چووینه کن سەرۆکی فەرهەنگی تاران، ئاغای یەزدانفەڕ. داوامان لێکرد که لەدانشسەرا دەرمان نەکەن. بەتوڕەیی گوتی: دانشسەرا جێگای بۆلشەویکان نیه. چووینه میوانخانەی حەقیقەت. چەند عەریزەمان بۆ شای نووسی که شانسی خۆمان له دەبیرستانی نیزام تاقیکەینەوە. حەوالەی سەرلەشکر ڕەزمارایان کردین. ئەویش ئێمەی نارد بۆ دەبیرستانی نیزام لەزانکۆی ئەفسەری.

رۆژێک چووین بۆ ئیمتحان و دەبوایە رۆژێکی دیکەش بۆ تاقیکردنەوە بچینەوە. لە حەساری زانکۆ پیاسەمان دەکرد. ئەفسەرێکی باڵا بەرز هاتە لامان و کوتی : ئێوەن لە سۆفیێت گەراونەوە.؟ وامانزانی خەبەرێکی خۆشی پێیە. ئێمەی بردە بن دارێک و گوتی: من کوردێکی سنەییم. لەکۆبوونەوەی نیزامی لەکن رەزمارا بریار دراوە وەرتان بگرن. پاشان لە کاتی فێر کردنی مانۆری نیزامیدا. بەبیانووی بە هەڵە دەرچوونی گوللە لەبەینتان بەرن. چونکە لێتان بەشکن. ئاگاتان لەخۆتان بێ. ئەم رازەش لای کەس باس مەکەن. ئیتر ئێمە رامان کردو گەراینەوە بۆ مەهاباد.»(١٧)

غەنی پاش ئەوەی لەتاران رێگای خوێندنی بۆ نادۆزرێتەوە ولەوێ رووناکی شک نابا، وەک دوکتور ئاسۆ دەنووسێ، دەگەرێتەوە مەهابادو روو دەکاتە کوردستانی گەرمێن. لە سولەیمانی لە ماڵی شێخی نەمر لە گەڵ کاک حەسەنی قزلجی و عبدولرحمانی زەبیحی کە ئەوانیش دوای روخانی کۆماری کوردستان روویان کردبوە گەرمێن یەک دەگرنەوە.

لە وێ دێنە سەر ئەو بریارە بۆ نوێ کردنەوەی خەبات و تێکۆشان شتێک ساز بکەن و رۆژنامەیەک بڵاو بکەنەوە. لە سەر ئەم بریارە گۆڤارێک لە شەش لاپەرەدا بە ناوی (رێگا) بڵاو دەکەنەوە. لە سەر خەت و نێوەرۆکی رۆژنامەکە وا دەردەکەوێ کە رێگا وەک( ئۆرگانی کۆمەڵەی ژیانی کورد)بڵاو کراوەتەوە. وادیارە مەبەستیان دامەزرانی حیزبێکی تازە بوە بە ناوی (حیزبی ژیانی کورد) بێ ئەوەی پێرەو پرۆگرامێک لەم حیزبە بەدەستە وەبێ. بێ جێ نابێ کلیشەی رۆژنامەی رێگاو سەروتاری کە بە فارسی نووسراوە وتاقە ژمارەیێکیشە کە لە لای من پارێزراوەو داومە بە زۆر کەسیش کەلکی لێ وەربگرن. ئەگەر بەناوی خۆیان نەیسەپێنێ. بیکەین بە کوردی و بۆ مانەوە لە مێژوودا تۆماری بکەین: کلیشەی (رێگا) بەم جۆرەیە؛

پێشکەش بەگیانی پاکی شەهیدانی رێگای ئازادی__ رێگا اورگانی کۆمەڵەی ژیانی کورد __ بەرەو ئازادی و ئازادیخوازی – ژمارە (١) ساڵی (١)

بمرێ استعمار و دیکتاتوری. خەزەڵوەری ١٣٢٧

هۆی پێک هێنانی حیزبی ژیانی کورد ـــ بڵاو کردنەوەی گۆڤاری (ڕێگا) ـــ ئامانجی ئێمە:

ئێمە لە پێشەکی گۆڤاردا بەکورتی ئاماژەمان بۆ هۆیەکانی دامەزرانی حیزبی ژیانی کورد و مەبەستی بڵاو کردنەوەی گۆڤاری ڕێگا و ئامانجی خۆمان کرد. زۆر بەداخەوە کە سانسوری توندی حکوومەتی نیزامی و چاوەدێری توندی شارەوانی و کار ئاگایی و راوەدووی دایمی مەعمورەکانی دیکەی دەزگای دیکتاتۆری لە کوردستان هەموو ئامرازێکیان لە دەست ئێمە هێناوەتەدەر و تەنانەت کاتی ئەوەشیان نەهێشتوتەوە کە دەرفەت بێ وەک پێویستە بە درێژی باسی مەبەستەکان بکرێ. ناچار بە کورتی باسی مەسەلەکانی پێویست دەکەین و جارێ بە شێنکی گۆڤارەکە بە زمانی فارسی دەنووسین .تا دۆستانی ئازادیخوای غەیرە کورد راستە و راست بیخوێننەوە دەزگای دیکتاتۆری و کۆنەپەرستیش بەناوی وەرگێران پەڵەی مەبەستی چەپەڵی خۆیان نەخەنە سەرداوێنی باسی راستی نیشاندەری ئێمە. گیانی نەتەوەیی و شعوری قەومی و بەرژەوەندی کوردو کوردستانی ئێران بەتایبەت زەحمەتکێشان و زۆربەی میللەتی کورد، ئێمەی وا لێکرد کە بۆ وەدەست هێنانی مافی سروشتی نەتەوەی کورد و گەیاندنی هاواری مەزڵومانەی ئەم قەومە بە گوێی دنیای شارستانیەت و مرۆڤایەتی و خەباتی ئێمە لە گەڵ داروودەستەی حکوومەتی دیکتاتۆری تاران و استعمارچی و دەلاڵ و نۆکەرانیانو بەکرێگیراوانی دۆلار لە ئێران و بەتایبەت لە کوردستانی خۆشەویست، حیزبێک بەناوی (حیزبی ژیانی کورد) دابمەزرێنین.

لە رۆژەکانی سەرەتای هاتنی ئوردووی دیکتاتۆری زۆرو کەم تێکۆشانێک هەبوو. ئەمرۆ کە کاربەدەستانی دەوڵەتی کۆنەپەرستی تاران دەیانەوێ بە هەنگاوێکی بەردەوامتر بۆ نابودی ئێمە و گواستنەوەی گشتی کوردەکانی ناوچەی موکریان دەست بە کار بن، ئێمەش بە پێویستمان زانی خەباتێکی هەراوتر دەست پێ بکەین. ئەوەتا سەرەرای ئەو هەموو کەند و کۆسپە نا نە بارە و مەترسی زۆر،

دەستمان کردوە بە بلاو کردنەوەی گۆڤاری ڕێگا ئۆرگانی حیزب. بڕیاریشمانداوە کە هەر چەند مەترسی زیاتربێ و پتر لە ئاستەنگ دابێن دیسان بلاو کردنەوەی ئەو درێژە پێ بدەین و هەست و بیری کۆمەلانی کورد بە چاوی داد و مرۆڤایەتی دنیای ئێستا کە بریتی یە لە کورسی نشینانی کۆڕی نەتەوە یەککگرتوەکان نیشان بدەین. هەر چەندی ئەم چاوەی داد کوێر بێ، دیسان بە گەورەتر نیشانی بدەین تا لە ئاخردا بزانن کە لە سایەی ئەوانەوە چ بە سەر نەتەوەکانی بێ هێزدێتن.

تێکۆشانی حیزبی ئێمە تایبەتی بارودۆخی کورد وکوردستانی چوارچێوەی سنووری ئێستای ئێرانەو بۆ ئازادی و بە دیموکراسی کردنی تەواوی ئێران تێدەکۆشێ و خالی پالپشتی ئێمەش تەنیا هێزی لە شکان نە هاتووی ئازادیخوازانی نەتەوەکانی ئێرانە بە پشت پەستن بە قانونی ئەساسی ئێران، چونکە بۆ دەزگای دیکتاتۆری حکوومەتی تاران دووپاتە کردنەوە و ڕوونکردنەوەی زۆر پێویستە. دیسان بە ئاشکرا دەلێین، ئێمە مافی سروشتی میللەتی کوردمان لە ژێر چاوەدێری حکوومەتێکی دیموکراسی ئێران بۆ کورد وکوردستانی نێو سنووری ئێستای ئێران بە گوێرەی قانونی ئەساسی ئێران بە فتوای ئاقلی سەلیمی مرۆڤ گەرەکە. ڕێبەری ئێمە گیانی نەتەوەیی و یاریدەدەرمان هێزی ئازادیخوازی ئێمە و کەرەسەی کارمان مال و گیان و هەموو شتی ئێمەیە.

لە گەل ئەو هەموو دوو پاتە کردنەوەو ڕوونکردنەوەیە، هیواداریـن کۆنەپەرستەکان ئیتر لە بنچینەی ڕەفتار و کردەوەی خۆیان بوختان و تۆمەت بۆ مەرامی پاکی ئێمە هەلنەبەستن. هەرچەند ئەوەش گرنگ نیە، چونکە ڕاستی لە لای خەلکی تێگەیشتوو ڕوونە.

ئێمە بە ناوی پشتیوانی لە ویژدان و ڕاستی و ئازادی لەم خەباتە مەزنەدا دەستی داوای هاوکاری و بەشداری وپشتگیری بۆ لای حیزبە پێشکەوتوو خوازەکانی ئێران و هەر وەها کۆمەلانی ئازادیخوازی کورد لە هەر جێی یەک بێ، درێژ دەکەین و چاوەڕوانی پشتیوانیمان لە وان هەیە. لە گەل میللەتی نەجیب و هاودەردی ئازەربایجانیی ئێمە هاوکاری دەکەین. پێوەندی دۆستایەتی مێژوویی

خۆمان درێژە پێدەدەین .ئێستا بۆ ئیسباتی بوون و ناساندنی مافی خۆمان لە ئێران بەگشتی باسی میللیەت و هەل و مەرجە بنەرەتیەکانی ئەو دەکەین.»

لە لاپەرەی دووەمی (رێگا) دا پاش سەر وتار چەند خەت دەبینرێن کە لە ژێر هەر یەکێک لە وان واتە و مەبەستەکان بە کورتی روون کراونەوە. سەرخەتەکان ئەمانەن: « میللەتی کورد و میللیەتی ئەو»... زمانی کوردی . مەزهەبی کوردی. هەلکەوتی جوغرافیایی کوردستان. لەم بەشەدا باسی جوغرافیا و سنوورەکان و دابەشکردنی کوردستانی گەورە دەکا و بارودۆخی کوردەکان لە تورکیاو عیراق و سوریا بە گوێرەی چۆنیەتی ژیان و سیاسەتی حکوومەتەکانیان بە کورتی روون دەکاتەوە و لە سەر ئێران دەنووسێ:« بەلام لە ئێران هەر ئەو ئێرانەی ئێمە قانونی ئەساسی و یاساکانی تری ناوی کورد ناهێنن. بە روالەت هەموو جۆرە بە کارهێنانی زمانی کوردی دەبوایە لە باری یاساوە ئازاد بێ .بەو حالەش رەفتاری حکوومەت و مەعمورە کۆنە پەرستەکانی دەولەتی سەرە رۆی ئێران دەستی کەمتری لە فاشیستەکانی تورکیا نیە و رێبازی چەپەلی ئەوانیان سەبارەت بە کوردەکان گرتۆتە بەر. بە تایبەت دوای چاوپێکەوتنی دوو دیکتاتۆری ئێران و تورکیا( پەهلەوی ومستەفاکەمال) دەولەتی ئێران بۆ تواندنەوەی کورد لە هیچ کردەوەیەکی نامەردانە دەستی نەگێراوەتەوە.» لە لاپەرەی ٣دا باسی مێژووی هاوبەشی کورددەکاوبە سەلاح الدینی ئەیوبی هەلادەلێ ودەنووسێ:« ...زۆربەی تایفە کوردەکانی لە ژێر دەسەلاتی خۆیدا کۆکردۆتەوە و یەکیتی یەکی کوردی پێکهێناوە.»

لە لاپەرەی ٤ دا بە ئیمزای (بێناو) بەم جۆرەی خوارەوە باسی( ئامانجی هاوبەشی کورد) دەکات: « کورد تەنیا یەک ئاوات وویستی هەیە ئەوەش ئازادیە لە سەر بناغە قایمەکانی قەومیەتی ئێمە. ئێمە کوردەکانی ئێران بە گوێرەی ئەم بەلگەو دۆکومێنتە مێژوویی و بەگوێرەی دان پێدانانی ئاشکرای ئاغای موزەفەرفیروز باریدەدەری سەرۆک وەزیری ئەودەم و نوێنەری خاوەن ئیختیاری دەولەتی ناوەندی کە لە پەیمانی تاران- ئازەربایجاندا بوون و مافی ئێمە دانی

پێداهاتوە مافی سروشتی خۆمان کە بریتی یە لە حکوومەتێکی خودموختاری دیموکراسی لە چوار چێوەی حکوومەتێکی دیموکراسی ناوەندی دا بە کوێرەی قانونی ئەساسی داوا دەکەین. تا دوا هەناسەش لە پێناو ویستی مافی خۆماندا خەبات دەکەین و دلنیاشین سەرکەوتنی ئاخری بۆ ئێمەیە چونکە ماف بەلای ئێمەدایە.»

لە لاپەڕی ٤ ی گۆڤاری ڕێگادا وتارێک بە ئیمزای(تەیمور) لە ژێر سەرخەتی «حەربەی دیکتاتۆری یا ئەرتەشی ئێران» بلاو کراوەتەوە جنایەتەکانی ئەرتەش و پۆلیسی ئێران لە دەورانی حکوومەتی بنەماڵەی پەهلەوی روون کردۆتەوە ودەنووسێ:« ... هێزی هاشمی خائین و هومایونی لە کوردستان وەحشیانە دەستیان بە کوشت و کوشتار و هەلاوەسین کرد. لە ئازەربایجاندا هەزاران لاوی ئازادیخوای ئازەربایجانی و ئەرمەنی و ئاسوری یان کوشت. لە کوردستان پێشەوای کەبیر مەرحومی قازی محەممەد و چەند نەفەر پیاوانی گەورە و ئازادیخوای وەکوو سەدری قازی، سەیفی قازی، مازوجی، نازمی، نەغەدەیی، روشنفکر لە مەهاباد، عەلیخانی شێرزاد لە بۆکان، ئەحمەدخانی فروقی، حەمەخانی فاروقی، حەمەدبەگی فەیزولابەگی، عەلی بەگ، ئاغاسەدیق، عەلی خانی فاتیحی، شێخ ئەمینی کەس نەزان، ئەحمەدخانی شەجیعی، عەلی ئاغای جەوانمەردی، رەسول ئاغای جەوانمەردی، حەسەنخانی کانی نیاز، لە سەقز فیدای چەند دۆلارێک کران کە شاو هەیئەتی حاکمە و سەرانی ئەرتەش لە ئەمریکا وەریان گرتبوو. وە(٢٥)نەفەر ئەفسەری جەوان و رەشیدی ئازەربایجانی لە مەهاباد هەر بەو حیسابە تیرە باران کران.»

لە کۆتایی لاپەڕەی شەشی گۆڤاری(ڕێگا)دا لە ژێر سەرخەتی « ئەی برایانی ئازادیخواز» وەک بانگەواز نوسراوە: «...ئەی جەوانان وروشنفیکران ئازاد مەردان ئەم مجلە هی ئێوەیەو بۆ ئێوەیە جا لە بلاوکردنەوەی دریغ مەکەن و بیگەیێنن بە برایانی هاو فیکر و خوێندەواری خۆتان چ کورد، چ ئازەربایجانی، چ فارس وە بۆ برایانی نە خوێندەواریشی بخوێننەوە و حالیان بکەن چونکو بلاوبوونەوەی ئەو

مجەلەیە بلاو بوونەوەی ئەفکاری ئینگویە. وە لە ناردنی ئەخبار ونەزدریاتی خوتان رامەوەستن. هیواداریین بەم زوانە بەیاریدەدانی برایانی هاوفیکر و مەرام بتوانین ئەم مجلەیە جوانتر چاپ و ئامادە بکەین.»

لە کوتاییدا بە ناوی دەنگوباس چەند خەبەرێکی لە بارەی شێروخورشیدی مەهاباد و نەبوونی دوکتور و دەرمان لە شارەکانی کوردستان و تەشقەلە و پول ساندنی مەعمورانی دەولەتی بلاو کردۆتەوە. لە دێڕی ئاخریدا دەنووسێ « نرخی مجلە لە هەموو جێگایەک بۆ هەموو کەس دانەی تەنیا تمەنێکە» (١٨)*

وەک شەهید حەسەنی قزلجی باسی دەکرد و دەقی گۆڤاری (رێگا)ش وەک لێرەدا هاتوە و بە دەستەوەیە، دەبێ (رێگا) هەوەلین بلاوکەرەوەی سیاسی دوای روخانی کۆماری کوردستان بوو بێ. بەلام دوکتور ئاسۆ( قادری مەحمودزادە) لە بیرەوەریەکانیدا کە بە زمانی فارسی بلاوکراونەوە دەنووسێ : « .....لەمانگی پوشپەری ئەو سالەدا لە لایەن لاوانی تێکۆشەرەوە پشکی چوونی عیراق بە ناوی لاوی فیداکار ئاغای غەنی بلوریان دەرکەوت. ئەو چوە عیراق لە گەل ئازادیخوازانی وێندەرێ پێوەندی گرت و باسی زولم و ستەمی شاو رێژیمە بێزراوەکەی کرد ولە سەر ئەوە بریاردرا کە لە سیتەک ملکی شێخ مەحمودی نەمر چاپخانەیەکی پچوک

---

لەنووسراوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری رێگا دەردەکەوێ کە پتر لە پێویست بۆ وەدەستهێنانی(مافی سروشتی میللەتی کورد لە کوردستانی نێو سنووری ئێران) پشت بە قانونی ئەساسی ئێران دەبەستێ، لە کاتێکا قانونی ئەساسی ئێران نەک هەر باسی کورد وەک نەتەوە و مافی گەلانی ئێران ناکات .بەلکوو سەرپشکایەتی وسەردەستی زیدە بۆفارس لەبەر چاودەگرێ. جگە لەوە وەک نووسەرانی رێگا کەمتر لە وتووێژی موزەفەرفیروز ونوێنەرانی ئازەربایجان و نێوەرۆکی پەیمانی تاران___ئازەربایجان ئاگادار بن وایە. وەک لە بەرگی یێکەمی( پێداچوونەوە)دا روونم کردۆتەوە لە وتووێژو پەیمانی (تاران___ئازەربایجان)باسی کوردستان ومەسەلەی کوردو مافی کورد نەکراوە. لە پەیمانی ١٥مادەیی نێوان موزەفەرفیروز و حکوومەتی ئازەربایجان لە مادەی ١٣دا تەنیا ئەوەندە ناوی کورد هاتوە کە دەلێ: دەولەت موافەقەت دەکا کە کوردەکانی دانیشتووی ئازەربایجان لەمەزایای ئەم رێک کەوتن نامەیە کەلک وەربگرن وبەگوێرەی مادە ٢ی راگەیاندنی دەولەت تاپۆلی پێنجی سەرەتایی بەزمانی خۆیان بخوێنن.»( ٢٠)

___ پێداچوونەوە.

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی بڵاوۆکوو بەیاننامە بخرێتە بەر دەستی نوێنەری شۆرشگێرانی ئازەربایجان و کوردستان. ئاغای بلوریان توانی هێندێ بەیاننامە دژی شاو روکنی ٢ کە پاشان بوو بە ساواک ( دیارە دوکتور ئاسۆ زۆر ئاگادارنیە. روکنی ٢ نەبوو بە ساواک . ساواک دەزگایەکی تایبەتی ئەشکنجەو راونانی ئازادیخوازان بوو. ن ) بنووسێ و چاپ و بڵاو کاتەوە. ئەم کارە تا پاییزی ١٣٢٧ درێژەی کێشاو لە گەڵاریزانی ئەو ساڵەدا هێندێ لەو بەیاننامانەدا کەوتە دەستی ئێمە و بۆ بڵاو کردنەوە لە شاردا بە سەر لاواندا دابەشکرا.» (١٩)

جگە لەوە یوسفی ریزوانی* لە نامەیەکدا کە ٩٦/٤/١٥ بۆ نووسەری ئەم دێرانەی ناردوە دەنووسێ:« یەکێتی لاوانی کوردستان جێگای رابەری حیزبی دیموکراتی بە دەستەوەگرت. کاک غەنی بلوریان و محەمەدئەمینی مەولودەچرچی نێردرانە کوردستانی عیراق و میوانی شێخ لەتیف دەبن. بە هۆی ناوبراو وحیزبی شیوعی عیراقەوە بەیاننامەیەک بەناوی (ئیعلامی مەجودیەتی حیزبی دیموکرات) لە

---

یوسفی ریزوانی لاوێکی خوێن گەرم وتێکۆشەرێکی کۆڵنەدەری مەهابادی بوو. دوای کۆدیتای دژی حکومەتی مصدق ١٩٥٣ بەتاوانی تێکۆشانی سیاسی دەگیرێ وبەپێنج ساڵ حەبس حوکم دەدرێ. پێنج ساڵ زیندان لەبەندیخانەکانی مەهاباد وورمێ وتەوریز لەوپەری دەست تەنگیدا بەسەربەرزی دەباتە سەر. دوای ئازادبوونی لە زیندان رێگای خەبات و تێکۆشان دەگرێتەوە بەرو ساڵی ١٩٥٩باش پەلاماری ساواک بۆسەر رێکخراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان. ناو براویش رادەکاو دەچێتە کوردستانی گەرمێن. لەوێ ئەحمەدتوفیق زۆرنائینسانانە رەفتاری لەگەڵ دەکا. ناچاردەبێ ماوەیەک خۆبشارێتەوە، پاشان لەبەغدا بەناوێکی دیکە ژیانی ماڵ ومنداڵی خۆی بەرێوە دەباو هەرلەوکاتەشدا لەگەڵ تێکۆشەرانی کووردستانی ئێران لە پێوەندی دادەبێ. دوای رووخانی رێژیمی شا دەگەرێتەوە کوردستانی ئێران ولەریزی حیزبی دیموکراتدا بەشداریی خەباتی سیاسی دەکا. دەبێتە بەرپرسی تەشکیلاتی هەوشاری حیزبی دیموکرات. دوای کۆنگرەی چوارەم دەبێتە مشاوری کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات وکاندیدای حیزب بۆ هەڵبژاردنی پارلمانی ئێران. دوای پاشەکشەی حیزبی دیموکرات دیارە بەتاوانی زمانگەرانی، لەگەڵ شاعیری ناوداری کورد هێمن وقادری عەبدی ئەندامی پێشووی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات دەگیرێ وماوەیەک لەژێر پاسەوانی مەلاعەولای حیاکی (عبداللەحسن زادە)دا لەحەبسێدا دەبێ وپاشان بەنوکە قەڵەمێک بە شێوەی دیموکراسی لەحیزبی دیموکرات دەردەکرێ.«(پێداچوونەوە)

چاپ دەدەن و دەگەڕێنەوە مەهاباد. چونکو بەیاننامەکە لە چاپ درابوو بە دەستخەت (تکثیر) کراو بلاو کرایەوە. ئەو کارە بەر هەڵستێکی جوانی بەرانبەر حکوومەت نیشاندا و جموجۆڵێکی باشی خستە ناو خەڵک.»

---

سەرچاوەکان


١ – جعفر مهدی نیا ، زندگی قوام السلطنه ، ل ٥٢٢

٢ – ئیگلتون، کۆماری کورد ١٩٤٦ ، وەرگێرانی سەید محەممەدی سەمەدی ، ١٩٧١ ، ل. ٢١٤

٣– نجفقلی پسیان، ازمهاباد خونین تاکرانەهای اراس.

٤ – درک کینیان ،کردها وکردستان ، وەرگێرانی برایمی یونسی ، ١٣٧٢ ، ل ٢٠٤.

٥ – جعفر مهدی نیا ، هەمان سەرچاوە ، ل ، ٥٤٥

٦ – ئیگلتون ، هەمان سەرچاوە ، ل، ٢٢٧

٧ – ئارچیبالد رۆزڤلت ،شوق اموختن، ترجمه صهبا سعیدی، ١٣٧١ ، ل، ٣٥١

٨– جعفر مهدی نیا، هەمان سەرچاو ل ، ٥٥٠

٩– درک کینیان ، هەمان سەرچاوە ، ل، ١٣١

١٠– نجفقلی پسیان، ازمهاباد خونین تاکەانهای ارس ١٣٢٨ . ل. ١٤٠ – ١٠٢

١١– پسیان ، هەمان سەرچاوە ، ل، ١١٨، ١١٧ ، ١١٦

١٢ – ئیگلتون ، هەمان سەرچاوە ، ل، ٢٢٢

١٣ – وتەی بارزانی مستەفا ، لەکتێبی: مسعودالبارزانی، البارزانی والحرکه التحرریه الکردیه، ١٩٨٧،ل١٤٧

١٤ – ر. کوردستان ، ژمارە ١٧ ، ١٩٧٢

١٥ – پێنج بەڵگەنامەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ، وەرگێرانی ئەنوەر سولتانی، گزنگ، ژمارە ١٠

١٦-مەسعودالبارزان، البارزانی والحرکه التحرریه الکردیه، ١٩٨٧،ل،١٦٤، ١٧٧

١٧- دکتر اسو(قادر محمودزاده)خاطرات زندگی پرماجرا، تهران، ١٣٧٤،ل ١٦٥، ١٦٦، ١٦٧، ١٦٨

١٨ - گۆڤاری ریگا ، ژمارە ١ خەزەڵوەری ١٣٢٧

١٩ - دکتر اسو(قادرمحمودزاده) هەمان جێ ل ، ١٨٤

٢٠ - دوازدهم شهریور ، تاریخچه نهضت دمکراتیک ازربایجان، تبریز، ١٣٢٥ ل،١٢٢ ، ١٣١ .

## بەشی دووەم :

# تێکۆشانی سیاسی وپێکهێنانی ڕێکخراوێکی نوێ

بڵاو بوونەوەی گۆڤاری( ڕێگا )حکوومەتی ئێران دەهاروژێنێ. ڕێژیمی کۆنەپەرستی ئێران پێی وابوو دوای گرتنەوەی کوردستان ولەسێدارەدانی پێشەواو ئازادیخوازانی تری کورد و پەڕینەوەی بارزانیەکان لە ئاراز. ئیتر بزووتنەوەی کوردی خاشەبڕ کردوە و بیری ڕزگاریخوازی لە مێشکی تێکۆشەرانی کوردا کوشتوە و تام و چێژی ئازادی چەندساڵەی دەسەڵاتی نەتەوەیی کوردی لە چێژگەو بیروهەستی گەلی کوردا سڕیوەتەوە. سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (ڕێگا) بووبێ یا بەیاننامەی ناوبراو لە مەهاباد حکوومەت دەست دەکا بەگرتنی خەڵک و دوور خستنەوە لەکوردستان. عەزیز و قادری یوسفی دوو برای تێکۆشەرو حەسەنی مفتی بەچوارساڵ زیندان حوکم دەدرێن ورەوانەی بەندیخانە دەکرێن. بەڵام زەبرو زەنگی حکوومەت نەک هەرناتوانێ خەڵک چاوترسێن بکا، بەڵکوو بەقەولی شاعیری ناوداری کورد هێمن.( لەسەرداوارەواکەیان سوورتر) پشیان دەکات وبۆ نۆژینەوەی ڕێگاو شێوازی نوێی تێکۆشان جموجۆڵ دەست پێدەکرێت، هەروەک باسکرالە ناوچەی سندوس و لاجان و شنۆ (کۆمەڵەی لاوانی لادێ) لەنێو خەڵکدا وردە وردە دێتە ناسێن وهەست بە بزووتنەوەیەکی نادیار دەکرێت. لە دوو گوندی سندوس وشنۆ چەند لاوێکی خوێن گەرم لە قوڵە ئاغایەکی زۆربلێ و کوێخا سجلێکی خۆفرۆش دەست دەوەشێنن. ڕووداوەکە دەنگ دەداتەوەو ژاندارم بەدوای نۆژینەوەیدا دەست بەکاردەبێ.

لە مەهابادیش چەندلاوی خوێندەواری تێکۆشەر لێک کۆ دەبنەوەو ڕێکخراوێک بەناوی کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان ( ک.ک.ک ) دادەمەزرێنن. بەشێوەیەکی یەکجار نهێنی و زانایانە خەبات دەست پێدەکەن.

## کۆبوونەوەی بن گیشە گەنمی درواو

لە مانگی گەلاوێژی ١٩٤٨ لە سەر پێشنیاری خوالێخۆشبوو کاک سوڵتانی شێخاغایی (ئەفسەری پێشووی سوپای میللی کوردستان)چەند تێکۆشەری ناوچەی شامات کە لە سەر بنچینەی نووسراوەی مەلا ئەمجەدی عوسمانی یەکیان گرتبوو، لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵەی لاوانی لادێ لە مەزرای گوندی تازەکەندی شامات لەبن گیشە گەنمێک کۆدەبنەوە. بەشدارانی کۆبوونەوە لە شامات بریتی دەبن لە:(سوڵتانی شێخاغایی، میرزاحەسەنی میرخزری ، مەلابابەوەیسی)،لەلایەن (کۆمەڵەی لاوانی لادێ)وە، مەلا مەعسومی قەرەقەسابی، سەیدعەلی حاجی کاگەمینی و کەریمی حسامی. پاش باس و لێکۆڵینەوە و وتوێژێکی خەست دەگەنە ئەم بڕوایە کە یەکگرتنەوە ی تێکۆشانی بەربلاو بە ئەرکی سەرەکی دابنێن. هەرلە وێ بڕیار دەدەن بە هۆی کاک سوڵتانی شێخاغایی لە مەهاباد لەگەڵ کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان پێوەندی بگیرێ وهەموو هێزو توانا تێک بخرێنەوە وخەبات ڕێکوپێک بکرێ.

لە مانگی ئوکتۆبری ١٩٤٨ شادروان میرزارەحیمی سوڵتانیان وەک کارمەندی ئیدارەی دارایی دەچێتە نەغەدە و لە گەڵ دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی لاوانی لادێ) پێوەندی دەگرێ و پاش لێکدانەوەیەکی ژیربێژی کۆمەڵەی لاوان بەخڕی دەچێتە نێو(کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان)، خەبات شێوەیەکی ڕێکخراوەیی خاوەن زەبت ورەبت بەخۆوە دەگرێ. ک.ک.ک بە خێرایی تێکۆشانی خۆی پەرە پێدەداو تێنی خەبات وەبەر خەڵک دەنێ. بەڵام ئەویش بێ بەرنامە و پرۆگرام، تەنیا لەرێگای پێوەندی ڕاستەو خۆ دیدارو ڕاسپاردە کارەکانی ڕادەپەڕێنێ.

## بەرهولادان لەریبازی حیزبی دیموکرات و توندکردنی خەباتی چینایەتی

بۆچی دەڵێم بەرهولادان لەریبازی حیزبی دیموکرات ؟

لێرەدا مەبەستم بەکەمدانانی خەباتی کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان نیە. خۆم لەسەرەتاوە بڕوام بەخەباتی چینایەتی هەبوە و ئێستاش هەرلەسەر ئەو باوەڕەم کەکۆمەڵی کوردەواریش وەک هەموو کۆمەڵگای وڵاتانی دنیا خاوەنی چینی جیاوازە و بەرژەوەند و قازانجی ئەوچینانە یەکتر ناگرێتەوە و ژیـنیان لێک جیاوازە و خەباتی چینایەتیش مافی رەوای هەموو زەحمەتکێشانی کوردستانە. بەڵام لەبەر ئەوەی کوردستان وگەلی کورد بەخڕی لەژێردەستی بێگـنەدا دەژی وبەگشتی وەک نەتەوە لەمافی رەوای نەتەوایەتی بێبەشە، رەنگە خەباتی چینایەتی ئەوەندە توندو تیژنەبێ کە تارمایی بخاتە سەرخەباتی نیشتمانی ورزگاریخوازی نەتەوەیی. وەک دەزانین حیزبی دیموکرات ریبازی خەباتی چینایەتی نەگرتبوەپێش، وەک لە تێکۆشانی کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستاندارەنگی دەدایەوە
ک.ک.ک رێبوارانی رێگای ئازادی نەتەوەیی و نیشتمانی لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و هیوایەک لەدڵی خەڵکدا پێکدێنێ. لەو کاتەدا خوالێخۆشبوو رەحیمی سوڵتانیان ورەحیمی... لە دامەزرێنەرانی ک.ک.ک دەچنە تاران ولەگەڵ باڵیۆزخانەی یەکێتی سۆڤێتی پێوەندی دەگرن و دامەزرانی کۆمەڵەی کۆموونیستی کوردستانیان پێڕادەگەیێنن. دیارتیە کام دیپلۆماتی نەزان ونائاگای سۆڤیێتی ناشارەزا لە هەل و مەرجی وڵاتی فرەنەتەوە، بێ ئاگاداری لە باروودۆخی کوردستانی دابەشکراو و لەوەزع و حاڵی کوردی بەشخوراو، لە گەڵ نوێنەرانی ک.ک.ک دادەنیشێ و راست هەر ئەم هەڵانە دوویات دەکاتەوە کە دیپلۆماسی

سۆڤیێتی لە مەسەلەی کۆماری کوردستان بەسەریدا رۆیشتبوون . ئەودەم جەعفەر باغرۆف بە ناوی یەکێتی و هاوکاری (هێزە دیموکراتەکانی ئێران) دەیویست حیزبی دیموکرات لە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا بتوێنێتەوە. ئەمجارەش کابرای نەزان بە نوێنەرانی ک.ک.ک دەڵێ:«... لە ولاتێکدا دووحیزبی کۆمۆونیست نابێ،(ئەو حوکمەی پتر لە ٦٠سال کردیانە ئایەتی قورعان و لە ولاتی فرمنەتەوەدا، کۆموونیستی نەتەوەی ژێردەستیان پێ گێژکرد). کابرا دەڵێ لە ئێراندا حیزبی تودە هەیە و حیزبی کۆموونیستی ئێرانە. باشترە ئێوە لە کوردستان هەر بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان تێکۆشان درێژە پێ بدەن. لەوەش باشترئەوەیە بچن لە گەڵ حیزبی تودە دانیشن و هاوکاری بکەن. ئەوانیش بە گوێرەی کەش وهەوای گشتی ئەوزەمان لە رێگای صارم الدینی صادق وەزیری یەوە لەگەڵ رێبەرانی حیزبی تودەی ئێران پێوەندی دەگرن و دەگەنە ئەوبریارە کە واز لە ناوی(ک.ک.ک ) بێنن و لە کوردستان بۆ راکێشانی خەلکی کورد سەر زارەکی بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان و لە راستیشدا لە ژێر رێبەرایەتی و رێنوێنی حیزبی تودەدا وەک رێکخراوی حیزبی تودە خەبات درێژە پێبدەن. دیارە مەرجێکیشی ئەوە دەبێ کە باسی مەسەلەی نەتەوایەتی وزمان وکولتوری کوردی وتەنانەت خود موختاریش نەهێننە گۆرێ. خەباتی چینایەتی لەکوردستان بەرێوە بەرن. حیزبی تودەش هەم لەباری ماددی وهەم لەبواری پەروەردەی کادر و فێرکردنی خەباتی نهێنی یارمەتیان بدات .*

بە دوای ئەم راوێژکاری وخۆ بەستنەوە بە سیاسەتی حیزبی تودەی ئێرانەوە ئیتر(ک.ک.ک) نامێنێ و گۆرانێکی بەر چاو کە بە سەر بزووتنەوەی کوردستان

---

دیارە هیچ گلەیی لەو برادەرانە ناکرێ. یەکەم ئەودەم کەش وهەوایەکی ئەوتۆ لە ولات داهەبوو کە ئەوەی لە لایەن سۆڤیێتەوە گوترا بایە بۆ رووناکبیرانی پێشکەوتووخواز و بۆ زۆربەی خەلکی کوردیش جێگای پەسند بوو. دیسان خەلک بۆ ئازادی هەر هیوای بە سۆڤیێت بوو. دووەم لاوی بێ ئەزموون وخوێن گەرم وتورە لە خەیانەت و نۆکەری دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتانی کورد کە پشتیان دە کۆماری کوردستان کردبوو خەباتی چینایەتیان بۆ کوردستان پێ رێبازێکی راستتر بوو. ـــ پێداچوونەوە

دادیت بریتی یە لەوە: ئەگەر کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان خەباتی چینایەتی لە کوردستان کردبوە ڕێبازی تێکۆشانی خۆی و بە ناوی کۆمونیستی کورد خەباتی دەکرد، ئەمجارە خەباتە چینایەتیەکە هەردەمێنێ، کۆمونیستی یەکەشی بەناوی حیزبی تودەوە هەر پێوە دیاردەبێ، تەنیا (کوردستانەکەی) لێ ئەستێنرێتەوە و لە ژێر ڕێبەرایەتی حیزبی تودەدا، بۆچاو نووساندی کۆمەڵانی خەلکی کوردستان ناوی حیزبی دیموکراتی بیناوەرۆک بەکاردەهێنن. بۆ ئەوەی باسێک لە مەسەلەی کورد ومافی نەتەوایەتی کورد بێتە گۆڕێ

کومیتەی سەرکردایەتی (ک.ک.ک) کە بریتی بوون لە( ڕەحیمی سولتانیان، ڕەحیمی خەرازی، غەنی بلوریان، عەزیزی حسامی(ئەمەیان لەبەر ناکۆکی لەگەڵ غەنی بلوریان دەستی لەکارکێشایەوە ن) کەریمی وەیسی و عەبداللە ئیسحاقی)بۆ کۆنفرانس و کۆنگرە و هەڵبژاردن بە ناوی کومیتەی(کوردستان) تێکۆشەن بەڕێوە دەبەن. لە تاران صارم الدینی صادق وەزیری ئەندامی چالاکی حیزبی تودە دەبێتە بەرپرسی کومیتەی کوردستان. «ساڵی ١٣٣٠کە بۆ هەڵبژاردنی دەورەی حەفدەهەم هاتم، هەروەک دەزانی ئامانجم زیاتر ئەوە بوو تەشکیلاتی حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕێک وپێک بکەم. ئەودەم ساڵ و نیوێکی مابوو بۆ ئەو کاتەی کە حەزبی تودە ئیجازەی کاری سیاسی لە کوردستان و ئازەربایجان وەربگرێ.

هەروەک بۆم باسکردووی من خۆم ساڵی ١٣٢٦ڕێکخراوی حیزبم زیندووکردۆتەوە، لە لایەکیش دەمزانی کە لە نێوان پێنج ئەندامی کومیتەی ناوەندی ئەودەم ناکۆکی زۆر هەبوو. هەوەڵین کۆبوونەوەم بۆ باسی مەسەلەی ناکۆکی ئەوان تەرخان کرد. بە سەر سوڕمانەوە دیتم کە غەنی وعەولای ئیسحاقی لە لایەک وسێ کەس لایەکێ، یەکتر بە «جاسوسی و خەیانەت» تاوانبار دەکەن. * تورە بووم و بە سەریاندا هاتم

---

-بەداخەوە ئەم دابە نگریس ودزێوە لەنێو بزووتنەوەی کوردیدابۆتە باو،ئەندامانی حیزب وڕێبەرانی سیاسی دەیان ساڵ پێکەوە لەشانە وکومیتەو ڕێکخراوەدا هاوکاری دەکەن وبڕوایان پێک هەیە. بەڵام لەگەڵکو لەسەر مەسەلەیەک ناکۆکی بیروڕایان لێ پەیدا بوو ولێک ترازان. شاڵاوی تۆمەت وبوختانی بێشەرمانە دەکەونە ڕێ ویەکتر بەجاسوس

و گوتم: ئەگەر بەراست بۆ ئەم تۆمەت وتاوانانە بەڵگەیەکتان هەیە، چۆن تا ئێستا پێکەوە کارتان کردوە.؟ ئاخر چۆن شتی وادەبێ کەسێک لە گەڵ جاسوس وخائین لە ئۆرگانێکدا هاوکاری بکا.؟ بەڵێ پاش باسێکی زۆر هەرتک لا قەبوڵیان کرد کە تەواوی ئەو تۆمەتانە بێ بناغەبوون و هەرتک لا بۆ تۆمەت هەڵبەستن سنوورێکیان نەهێشتۆتەوە. گۆیا ئەوە تاقە زەمینەیەک بوە کەتێیدا ئازادبوون ! »(١)

خەبات لە کوردستان بەخێرایی پەرە دەگرێ و لە هەموو ناوچەکانی کوردستان لە سەر بنچینەی خەباتی چینایەتی لە ژێر ڕێنوێنی و ڕێبەرایەتی حیزبی تودەدا شانەو ڕێکخراوی ناوچەیی دادەمەزرێن. ڕۆژنامەکانی حیزبی تودە بەچەشنێکی هەراو لە شارەکانی کوردستان بڵاو دەبنەوە بێ ئەوەی باسی کوردستان و مەسەلەی نەتەوەیی یان تێدابێ. بەڵام کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشی کورد هەر بەناوی حیزبی دێموکرات بۆ مەیدانی خەبات رادەکێشرێن. حیزبی تودەی ئێران لە بەیاننامەیەکی خۆیدا(٢٠ مرداد ١٣٥٨) دەنووسێ: « حیزبی تودەی ئێران دوای شکانی ساڵی ١٣٢٥کە بوو بەهۆی لە بەریەک بڵاوبوونی هێزەکانی میللی ودێموکراتیک لە ئازەربایجان و کوردستان، دیسان زیندوو کردنەوەی ڕێکخراوەکانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و حیزبی دێموکراتی کوردستانی گرتە ئەستۆ. تەنانەت دوای ئەوەش کە لە نەتیجەی پیلانی مانگی بەهمەنی ١٣٢٧تێکۆشانی ئاشکرای حیزبی ئێمە تەنگە بەرکرا،حیزبی تودە هەموو توانای خۆی لەم ڕێگایەدا بەکار هێنا.»

---

وجاش وخاین تاوانبار دەکەن. لەکاتێکا سوور دەزانن ئەوەی دەیلێن وهەڵیدەبەستن درۆیە وبوختانەو تەنیا لەبێ فرهەنگی وخۆپەرستی یەوە سەر چاوە دەگرێ.

بەناواتی ئەو ڕۆژە کەکوردیش وەک گەلانی شارستانی وخاوەن کولتوری پێشکەوتو مامڵە لەگەڵ ڕوو داوەکان بکات وکۆمەڵی کوردەواری لەم ئاکارە دزێو وبێ ئەخلاقیە پاک بێتەوە . پێداچوونەوە.

# رەنگدانەوەی وەزعی کوردستان وبوژانەوەی خەبات لەدەرەوە

سالی ۱۹٤۸-۱۹٤۹وتارەکانی کوردی کە لە رادیو باکو (ئازەربایجانی سوڤیتی) بلاو دەکرینەوە، هیواو هومیدیک وە بەر خەلک دەنین و لە سەرخەبات و تیکوشان رژد تریان دەکەن. لە مانگی فیبریوەری۱۹٤۸لە زانستگای تاران تەقە لە شای ئیران دەکریێ. ئەم رووداوە دەبیتە هوی هیرشی پولیس بوسەر ریکخراوە دیموکراتیەکان وراونانی ئازادیخوازانی ئیران، بەتایبەت سەرحیزبی تودەی ئیران. لە کوردستان جاریکی دیکەش ئازادیخوازانی کورد دەکەونەوە بەر پەلاماری پولیس و دەگیرێن و دوور دەخرینەوە.

بوژانەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد دوای روخانی کوماری کوردستان و بلاو بوونەوەی دەنگی کوردی لە رادیوی ئازەربایجان جگە لەوە کە لە نیو کوڕ و کومەلانی کوردستان و ئیراندا بەگشتی دەبیتە جیی باس و لیرامان سەرنجی دەزگا جاسوسیەکانی دەولەتانی بیگانەش بولای خوی رادەکیشی. لەبەلگەنامەی ژمارە fo.321/91252/132969 ئوەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەریتانیادا بە ناوی(کیشەی کورد لە سالانی ۱۹٤٦-۱۹٥۰)ئەم راپورتەمان دیتە بەر چاو کە رینگاد ەدەن لە بوچووندا سەری هەودا ببەسترینەوە بە تیکوشان وجم وجولی خەریک بووژانەوەی بزووتنەوەی کوردستانی ئیران و تارادەیەکیش تەئسیری وتارە کوردی یەکاتی رادیوی ئازەربایجان.

۳٤ ــــ «...چالاکی راستەوخوی سوڤیت لە ناو کوردانی ئیراندا جگە لە بلاوەی(رادیو ئیرەوان) و ئیستگەی رادیوی دیموکراتەکانی ئازەربیجان کە شوینەکەی بە باشي روون نیە، جار بە جار و تەنیا بەگویرەی هەلکەوت بەرنوە

دەچن. کۆنترۆلی دەسەلاتداریەتی ئێران بە سەر ناوچە شاخاویەکانی کوردستاندا ئێستاش هەرکەم هێزە. بەلام خۆتێخزاندنی سیخورە سۆڤیتیەکان بەمەبەستی بەردەوام بوونی بایەخدانی کوردەکان بە پێوەندی یان لە گەل سۆڤیت دا رەنگە زۆریش دەگمەن نەبێ.

. لە وەتی هەرسهێنانی بزووتنەوەکە، سۆڤیتیەکان هیچ هەولێکی یارمەتی بە کوردیان تەنانەت بە قەدەر یارمەتییەکانی سالی ١٩٤٦-یش نەداوە. جوانڕۆییەکان بە ئاشکرا هیچ پشتیوانیەکیان لە لایەن سۆڤیتەوە لێ نەکراو نیشانەی واش بە دەستەوە هەن کە ناوچەکانی باشوری سنە و کرماشان هیچ چەشنە چالاکیەکی کۆمونیستیان تێدابەدی ناکرێ. هەر وەها نیشانەی ئەوەش هەیە کە جگە لە شکاک و هەرکی، کە لە ماوەی شەڕ و دوابەدوای ئەودا، بەهۆی دەست بە سەرداگیرانی ناوچەکەلە لایەن سۆڤیتەوە لە رێگا چووبوونە دەرەوە، پروپاگاندەی ئەم دواییانەی سۆڤیت شوێنی لە سەر پاشماوەی هۆزە کوردەکان دانەناوە. نموونەی سەمەرەی هۆزی فەیزولابەگی کە لە لایەن کونسولی ئەعلا حەزرەتی(شای بەریتانیا) لە تەوریزەوە باسی لێوەکراوە و سەرەگ هۆزەکان لە سەردەمی ریژیمی دیموکرات دا، زەویەکانی خۆیان بە سەر عەشیرەتدا دابەش کردوە * لە لایەن هیچ هۆزێکی دیکەوە رەچاو نەکراو یەکجار دووریش دەبیندرێ کە لە داهاتوودا رەچاو بکرێ.

٣٥ - ئەو زمانە توندو تیژو لە رادەبەدەرەی وا لە بلاوەی(رادیۆی)کوردیدا کەلکی لێ وەردەگیرێ، نیشانەی درێژەی مەیلی سۆڤیتە بۆ کوردستان و حالەتی ئێستای دەست راگرتنی سۆڤیت لە دەست تێوەردانی زیاتری بەشی کوردستانی ئێران کە قەبوڵ و پەسندێکی زۆریشی بۆ هەیە نیشانەی رێزگرتنی سۆڤیتیەکانە

---

* ـــ مەبەستی عەزیزخانی کرمانجە کە سالی ١٩٤٣ زەویەکانی خۆی بەسەر رەعیەتەکاندا دابەش کردبوو. ئەو عەزیزخانەی کە مانگی مای ١٩٤٣ دوای وتارێک لە چوارچرای مەهاباد خەلکی دەنگدا تا شارەوانی مەهاباد پەلاماربدەن وئاخرین شوێنەواری دەسەلاتی حکوومەتی تاران لە مەهاباد کوێر کەنەوە. حیزبی دیموکراتیش لەم دواییانەدا بە هەلە رۆژی ١٧ی دیسامبر رۆژی هەلکردنی ئالای کوردستانی کردۆتە رۆژی پەلاماردانی شارەوانی وناوی ناوە رۆژی پێشمەرگە.!! پێداچوونەوە

لەو راستیەی کە هەر کاتێک هێزی سۆڤیێتی بێتە ناوچەکە و چەک و پارە بەسەر هۆزەکاندا دابەش بکات، هۆزە کوردەکان دەخاتە بارێکی دڵخوازی خۆیەوە.

توانای سۆڤیێتەکان بۆ ڕاگرتنی کورد لەم بارو دۆخەدا تا رادەیەکی یەکجار زۆر بە توانای پاراستنی مەرزنایەتی ناوچەیی خۆیان و درێژەدان بە ناردنی کەرەسەوە بەستراوە تەوە.»

١٩٤٩

١٠- «.... لە سەرەتاکانی ساڵی١٩٤٩دا بە هۆی بڵاو بوونەوەی هەندێ ماتریاڵی پروپاگاندەوە (واهەیە لە لایەن « رزگاری» یەوە بوو بێت) هەنگاوێک بۆ ژیاندنەوەی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردی هەڵهێنرایەوە. دەسەڵاتداریەتی ئێران لە مانگی فەبریوەر و مارچ و ئەپریل دا دەستی کرد بە گرتنی خەڵک و کارێک کە پێوەندی بە هەواڵی ئەو هەنگاوەوە دەدرا کە لە مانگی فەبریوەری بزکوشتنی شا هەڵێنراوە. گەرچی هۆزەکانی جەلالی و شکاک دژایەتی خۆیان نیسبەت بە حکوومەتی ئێران نە دەشاردەوە، هیچ نیشانەیەک بەدەستەوە نەبوو کە کورد ئەم کارە خەتایەی کردبێت و بۆ تۆڵە سەندنەوەی تایبەتی خۆیان لە لای دەسەڵاتداریەتی ئێران خەراپەی (عەشیرەتەکانی تر) یان گوتبێت.

١٢ ـــ راپۆرتێکی سەرنجراکێش لە سەر بناغەی بۆچوونی دوو جاسوسی بە ئەزموونی ئینگلیزی کە لە مانگی ئاگوستی ساڵی ١٩٥٠ بە شێوەیەکی سەر بەخۆیانە بە ناو کوردستانی ئێراندا گەڕا بوون، هەستی ئەوانی لە مەڕ هەڵوێستی کورد لەم چەند وشەی خوارەوەدا تۆمار کردوە:

ئە ـــ «هەموو هەواڵنێرە کانمان لە ناوچەکانی کورد نشینی باکوری سەقز بە شێوەیەکی بنەرەتی،هەواڵی لایەنگری کردنی(خەڵکمان) لە سەربەخۆیی کوردستان پێدەگەیێنن و وەک هۆی شتەکە، ناو لە جیاوازیی نەژاد، فەساد وزوڵم وزۆری حکوومەتی ئێران و ئەفسەرانی ئەرتەش دەبەن کە بە گوێرەی قسەی ئەوان لایەنگری بەڕێوە چوونی بەرنامەی پێشکەوتوو لە ناوچە کوردنشینەکان نین و بە دەستی زۆر پێشی بەرنامەی ئەوتۆ دەگرن.

ب ـــ«سەرەرای تورەییکی بێگومان، کە لەو ئاکارە وەشاوەتەوە، هیچ نیشانەیەک نابیندرێ کە بەرنامەیەکی دارژاو یا رێکخراوەیەکی گرنگ بە ئامانجی دابینکردنی سەربەخۆیی لە ناوچەکەدا پێکهاتبێ. روانگەی دەسەلاتداریەتی ئەرتەش لە مەهابادیش هەر وابوو.

لە وەش زیاتر، هیچ نیشانەیەکی لایەنگری کردن لە کوردستانی گەورە وباس و خواسی موشکیلەی کورد لە تورکیاو سوریا و عیراق، سوریا و عیراق،لە ئەو هاو زمانە کوردە ئێراتیەکاندا نەبیندرا.

پ ـــ لە ناوچەکانی باکوری سەقزیشدا، نارەزایی خەلک لە کاربەدەستانی ئێرانی، وەک نارەزایی زۆربەی ناوچە باکورییەکان بوو. بەلام لێرەدا لە جیاتی پێداویستی سەر بەخۆیی، لە سەر ئەو مەسەلەیە جەخت دەکرا کە کاربەدەستانی ئێرانی لە مەترسیەکان ئاگادار بکرێن. سەردانی ئەم دواییەی شا لە ناوچەکە، ئاکامێکی باشی بوە، بەلام ئەوە زۆر گرنگە کە ئەو بەلێنانەی شا داونی، بێنە ئەنجام.»(٣)

## پەلاماردانی جوانرۆیی یەکان ـــ ١٩٤٩

نێوەرۆکی ئەم راپۆرتانەی وەزارەتی کارو باری دەرەوەی ئینگلستان و کار تێگردنیان لە سەر رووداوەکانی کوردستان لە بەر چاوی کار بەدەستانی حکوومەتی تارانیش زۆر بزر نابێ. دوای تەقەکردن لە شا لە زانستگای تاران حکوومەتی ئێران دەیەوێ نەک هەر دیموکراسی و مافی مرۆڤ لە ئێراندا بەتەواوی پێشێل بکا، بەلکوو هەموو هەست و بیری بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازیش لە رەگ و ریشە دەربێنێ. لە نێو عەشیرەتە کوردەکان، عێلی جوانرۆیی دوای رووخانی ڕێژیمی پەهلەوی (١٩٤١) بە شێوەی سەربەخۆ دەژیا. نە مالیات و باجیان دەداو نە چەکیان دانا بوو. « ... لە سەرووی رۆژئاوای کرماشان نێزیک سنووری ئێران و

عیراق لە دەوروبەری (رەوانسەر و پاوە و نوسود) کە بە بەرزایی سەخت ورژدو شوێنی قایم و ئەستەمی سروشتی لە دنیا بە ناو بانگەو تەنانەت لە سەدەکانی کۆندا لە بەرانبەر هێرشی ئەسکەندەر بەربەرەکانی کردوە و پەلاماردەری راگرتوون، خەڵکێک لە کوردی ئێرانی دەژین بەعیلی جوانڕۆ ناسراون. شەرکەرانی جوانڕۆ بەگشتی خەڵکێکی رەشید و تفەنگچی و لە نێو عەشیرەتەکانی ترداپە ئازا و هێندێ جار بە دڵرەقیش بەناو بانگن. شێوەی خەبات و بەربەرەکانی عەشیرەتی جوانڕۆ جۆرێک بوو کە خاو و خێزان و کەسانی پەک کەوتەیان بۆلای سنووری عیراق دەنارد و گەنجە شەروانەکانیش لە ژن و پیاو بۆ خەبات وبەربەرەکانی دمانەوە. حکوومەتی ناوەندی بڕیاریدا عەشیرەتەکانی دەور و بەری کرماشان چەک بکا، ویستی چەکی ئەم عێلەش بستێنێتەوە. لە مانگی جۆزەردانی ١٩٤٩ حکوومەتی ئێران بۆ چەک کردنی جوانڕۆیی یەکان لەشکری ناردسەریان. دیارە ئەوە جاری هەوەڵیش نەبوو کە لەشکر دەچوە سەر عەشیرەتی جوانڕۆ و هەموو جاری بە سەر شۆڕی دەگەڕایەوە. ئەم جارەش نەک هەر چەکیان نەدایەوە، بەڵکوو لە دەی مانگی خەرمانان پادەگانی دەوڵەتیی (پلنگانیان) پەلاماردا و زیانێکی قورسیان بە ئەرتەشی ئێران گەیاند. لە تارانەوە لەشکرێکی ٤٥هەزارکەسیان لە گەڵ ٥٠تانک وچوار فرۆکەوە بەهاواری لەشکری کرماشانەوە ناردر بەربەرەکانی جوانڕۆیی یەکان سەرکوت کرا. » (٢)

جگە لەم بابەتە کە ئیرج ئەفشارسیستانی باسیکردوە، لە تیلگرافەکانی باڵیوزخانەی بەریتانیا لە تاران کە کاک ئەنوەری سوڵتانی لە(بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا)وەری گرتوون و کردوونی بە کوردی و بۆچوونی کاربەدەستی ئەرتەشیەکانی ئێرانی لێ دەردەکەوێ، راپەرینی جوانڕۆیی یەکان نەک هەر دەوڵەتی ئێرانی توشی ژانە سەرکردوە، بەڵکوو دەوڵەتی بەریتانیاشی خستۆتە فیکری لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی هۆو بنج و بناوانی ئەم سەربزێویە و زۆریشیان خۆ پێوە ماندوو کردوە

FO.371/82000/xc/132947 ...»

حەوتەمی سپتەمبەری ١٩٥٠

لە وەزارەتی دەرەوەی(بەریتانیاوە)بۆ(بالیۆزخانەی بەریتانی)لەتاران.

رۆژنامەکانی ئێرە، شەوق و عەلاقەیەکی زۆر بەنیسبەت کاروباری کوردستانی ئێرانەوە لە خۆیان نیشان دەدەن. تکایەهەوالی هەل و مەرجەکەم بە تێلگراف بۆ بنێرە و لە زانیاریدا رام بگرە.

FO.371/82000/xc/132947

لە تارانەو بۆ وەزارەتی کارو باری دەرەوەی (بەریتانیا)

سێرف .شپێرد .. ژمارە ٤٢٥ ـــ ١١ی سپتەمبەری ١٩٥٠

(سەبارەت)بەتێلگرافی ژمارە٢٨١ی ئێوە لە مەڕ کوردستان میدیای رەسمی ئێرە دەڵێن هێزی جوانرۆ، داواکاریی ئەرتەشی ناوچەکەی بۆ بە دەستەوەدانی تفەنگەکانیان داوەتە دواوە و لە رۆژی دووهەمی سپتەمبەردا، هێرشیان بردۆتە سەر بنگەیەکی ئەرتەش لە ٦٠مایلی باکووری رۆژئاوای کرماشان. ئینجا بریگادی کرماشان کە فرۆکەی هۆریکان پشتیوانیان بوە، بە گژ جوانرۆیی یە کانداچوە، مەتەریزە کانیان لێگرتوون و بەرەو چیا کشاندایاننەوە. ئەرتەش لە لایەن ئەو هۆزە دراوسێیانە وە کە دوژمنی جوانرۆیی یەکانن، یارمەتی دەدرێن.

ئەتاشەی عەسکەری (بەریتانیا) ئاگادار کراوە کە بەتالیۆنێکی یارمەتیدەر لە تارانەوە نێردراوە بەلام هێشتا نەگەیشتونەتە جێ. دەقی هەموو نامەو راسپێریەکان لە جانتاکە دایە. پێکدادان درێژەی هەیە.

٢ ـــ جوانرۆییەکان ماوەیەکی درێژە سەرچاوەی ژانەسەرن و ئەم عەمەلیاتەش کارێکی ئاسایی یە بۆ پۆلیس. ئەم راپەرینە (کە لە لایەن رۆژنامەکانەوە گەورە کراوەتەوە)، وێ ناچێ لە پەرەسەندند ابێت. هیچ نیشانەیەکی ئیلهام وەرگرتن لە سۆڤێتی پێوە دیار نیە.

FO. 371/82000/xc/132947

بالیۆزخانەی بەریتانیا.تاران ـــ ٢٢ی سپتەمبەری ١٩٥٠

نهێنی ، ژمارە ٢٧٢

جەناب . بە گەڕانەوە بۆ تێلگرامی ژمارە٤٣٥ی ١١ی سپتەمبەر،شانازیم هەیە لێرەدا نوسخەیەک لەو ڕاپۆرتەتان بۆبنێرم وا لە لایەن جەنابی جێگری کۆنسول Roper؛ carzon لە کرماشانەوە سەبارەت بە عەمەلیاتی دەسەلاتداریرتی عەسکەریی ئێران، دژ بە هۆزی جوانڕۆ نووسراوە. کارێکی بەجێیە ئەگەر لەم کاتەدا چاوێک بە باروودۆخی عەشیرەیی کوردستاندا بخشێندرێتەوە تا بزانرێ مەترسی جیددی بۆ ئاسایشی دەوڵەتی ئێران لە ناوچەکە، تا چ ڕادەیەکە.

١)ڕاستەقینەی بناغەیی سەبارەت بە هۆزە کوردەکان ئەوەیە تفەنگیان بە دەستەوەیە و هەر وەها بە هۆی دوژمنایەتی عەشیرەیی و بنەماڵەییەوە، گەلێک دابەشکراو و لێک دابڕاون. بۆ دەست تێوەردانی حوکمی مەرکەزی لە شێوەی ژیانی خۆیان بێزاریی دەنوێنن، هیچ شتێک سەبارەت بەشێوەگەلی ڕێکخراوەیی-جیالەشێوازی عەشیرەتی نازانن. وادیارە حکومەتی ئێران دان بەوە دابنێ لەم کاتەدا ،شتێکی ئەگونجاوە هەموو هۆزەکان چەک بکات بەڵام خەیاڵی وایە بەهۆی دانانی بنکەی عەسکەریی لە شوێنە کلیلیەکان و چاوەدێری کردنی ئەو تفەنگانەی وابە دەستیانەوەیە، پێشی کوردان بگرێ ونەهێڵێ خەریکی چەتەیی و رووتاندنەوە بن و هەروەها سەربەستی یان لە شەرو کێشەی ناوخۆییدا یاساغ بکات. هەر هۆزێک پیشەی چەتەیی ڕەچاو بکات، یا لە گەڵ دراوسێکاندا بکەوێتە شەڕەوە، مەترسی ئەوەی دەبێت داوای لێبکرێ تفەنگ دابنێ یا ڕوو بەرووی عەمەلیاتی عەسکەر ببێتەوە. ئەوەش لەراستیدا هەر ئەو شتە بوو بۆ جوانڕۆیی یەکان هاتە پێشێ.

٢)ئەوە ڕەسمیی» ڕادیۆی ئازادی « ئازەربایجانی کۆمونیستە، کە نوێنەرایەتی کوردان بۆ یەککگرتنیان لە پێناو خەباتی دژ بە حوکمی مەرکەزی و دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بکات. بە کورتی، شەڕی ئەمجارە کاتێ هەڵگیرساوە کە هۆزە دراوسێکانی جوانڕۆ یارمەتی ئەرتەشی ئێران دژ بەجوابرۆیی یەکان دەدەن تا بتوانن تۆڵەی کۆنی خۆیانیان لێ بکەنەوە. لە ڕاستیدا ئەو ڕاپۆرتانەی واگەیشتوونەتە دەستم، دەری دەخەن پڕوپاگاندەی ڕادیۆیی، شوێنێکی کەمی

داناوه و هیچ بزووتنەوەیەکی یەکگرتوو لە پیناو سەربەخۆیی کوردستان لە ناوچەکەدا نابیندری. بێگومان ئەگەر هێرشێکی رووس بۆ سەر ئێران لە گۆڕیندا بوایە، هێندێ ڕێبەری هۆزەکان بە خێرایی لە گەڵ ئەرتەشی سوور دەکەوتن ئەویش بە هیوای شوێن و جێگەی خۆیان لە ناوچەکەدا بچەسپێنن. بەڵام ئەم رووداوە شتێکی تەواو جیاواز لە بزووتنەوەیەکی ڕاستەقینەی سەربەخۆیی دەنوێنێ، دوور نیە خەباتی دژ بە حکوومەتی ئێران هەنگاوێکی هاوکات لە لایەن حکوومەتەوە بێت بۆ ئەوەی هەموویان پێکەوە چەک بکات، ئەوەش لە گەڵ ئەو سیاسەتەی ئێران واله سەرەوە باسم کرد، یەک ناگرێتەوە و من هیچ ئاسۆیەکی ئەوتۆ بەدی ناکەم حکوومەتی ئێران دەست بداتە عەمەلیاتێکی مەترسیدارلەو شێوەیە.

٣)حکوومەتی ئێران خۆی لەم دوایی یەدا فاکتەرێکی دیکەی بۆ ئاڵۆز کردنی پێوەندی یە کانی خۆی و ناوچە هۆز نشینەکان پێکهێناوە ئەویش بەو ناوەی کە ئەگەر هات و رووسەکان هێرشیان کردە(سەرئێران)،لە هێزی چەکداری چریکی عەشیرەتەکان کەلک وەربگرێ، ئەم ئیمکانە، بۆ سەرۆکی ستادی ئەرتەش زۆر سەرنج ڕاکێش دەنوێنێ کە چەندین جار و لە چەندەها شوێن چەکی بەو هۆزانە داوە واجێگەی متمانەی بوون.

هێچ لەوە ناچێ سیاسەتێکی گشتی(چەک کردن)بۆ هەموو وڵات هەبێت، لە کاتێکدا چەک لە هۆزێک و لە ناوچەیەک وەردەگیرێتەوە، دەدرێتە دەستی هۆزێکی دیکە، ئەوەش هێندێ جارلە ناوچەیەکدا، دەبێتە هۆی سەر لێشێواوی، هەر چۆنێک بێ وادەردەکەوێ تا ئێستا لە کوردستان چەک بە هیچ هۆزێک بۆ عەمەلیاتی چریکی نەدرابێت.

٤)هەر بەم بۆنەیەوە، من دەگەمە ئەو ئاکامەی کە حکوومەتی ئێران زۆر واهەیە سیاسەتی ئێستای خۆی لە مەڕ هاو سەنگ ڕاگرتنی پێویستیەکانی ئاسایشی گشتی و مەترسی دەست درێژیی بەربڵاوی هۆزەکان بەرێوەبەرێ. وەک ئاکامێک، تائەو کاتەی سنوورەکانی ئێران دەستیان لێ نەدرێت(نەکەونەبەرهێرشی رووس) ئیمکانێکی کەم بۆ پێکهاتنی بزووتنەوەیەکی بەهێزی کوردستانێکی سەربەخۆ

بەرچاو دەکەوێت.

٥)من نوسخەی ئەم نامەیە بۆ نوێنەرانی ئەعلاحەزرەت لە واشنکتون، مۆسکۆ، بەغدا، ئانکارا و کاربەدەستانی کۆنسولیەتی ئەعلا حەزرەت لە کرماشان وتەوریز. هەروەها بۆ سەرۆکی دەفتەری بەریتانیایی رۆژهەلاتی ناوەراست لە قاهیرە دەنێرم بە شانازیەوە. لە گەڵ ئەوپەڕی رێزمدا، خزمەتکار زۆربە ئیتاعەی ئێوە.»(٤)

هەرچەندە دەوڵەتی ئێران ودەزگا جاسوسیەکانی ئینگلیز هەولیاندا پەردەیکی تەماوی بخەنە سەر راپەرینی عەشیرەتی جوانرۆ. بەلام تێکۆشانی رێزدار دوکتورکامران بەدرخان پەردە لەسەر پەلاماری درندانەی لەشکری ئێران لادەداو بەناردنی یادداشتێک بۆ سەرۆک وئەندامانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان (دەوڵەتە یەکگرتوەکان) جنایەتی حکومەتی ئێران لەقاو دەدا. ئەمەش دەقی یادداشتی بێزاریی ئەمیر کامران بەدرخان :

Fo.371/82000/xc/32947

پاریس ١٣یسپتەمبەری ١٩٥٠-کۆیی- وەفدی کورد

3rue Debrousse oaris 16

[`بۆ سەرۆک وئەندامانی رێکخراوەی نەتەوە یەککگرتوەکان ]

پایە بەرزان. من بەناوی « وەفدی کورد» ەوە، شانازیم هەیە ئەو یادداشتەتان وەبیر بێنمەوە والە٢٩ی نوامبەری ١٩٤٨دا لە مەڕ گەلی کورد بۆتان نێردراوئەم راستیانەشتان پێراگەیێنم.

دەفتەری مەرکەزیی ئەرتەشی ئێران لە چوارەمی سپتەمبەری ١٩٥٠دا،بەیانێکی دەرکردو تیایدا رایگەیاند کەکوردی«جوانرۆ» سەریان لە چەگدانان باداوەتەوەو هێرشیان کردۆتە سەر پێگەیەکی ئەرتەشی ئێران. ئەوە دژبەراستە قینەیە. راستیەکەی ئەوەیە کوردی ناوچەکە - وەک دانیشتوانی ناوچەی «شاهئاباد» بەگوێرەی فەرمانێکی رەزاشای کۆچکردوو کەتا ئێستاش لەسەر بڕیاری خۆی ماوەتەوە. سەر باری باجی دەوڵەت ناچار کراون ٢٠٪ی

حاسلاتیان بە شای ئێران بدەن. فەرمانەکە-بەشێوەیەکی ملهوڕانە دەڵێ زەوی کوردەکان، ملکی تایبەتی شای ئێران بوە. ئەم قسەیە بەهیچ شێوەیەک لەجێگەی خۆیدا نیە،چون کاتێ هەردوو باجەکە دەخرێتە سەر یەک،دەبن بەنیوەی داهاتی خەڵکەکە- داهاتێک کەخۆی لەخۆیدا، بەهۆی شێوەی نواکەوتوی کشتوکاڵەوە، کەم وناتەواوە.

ڕاست دوای ئەوەی کوردی جوانڕۆ ملیان بۆ ئەو بەشە ناعادلانەیە دانەنواند کە لە لایەن کاربەدەستانی شاهەوە داوا دەکرا، ئەرتەشی ئێران دەستی کرد بە گرتن وکوشتوبڕی خەڵک. کورد کە هیچ دەرەتانێکیان بۆ پارێزکاری کردنی خۆیان کەو کردەوە نامرۆڤایانەیە نەمابوو، ناچار بەئامانجی پاراستنی خۆیان و ماڵیان دەستیان دایە تفەنگ.

لەرۆژانی ٤وە٥و٦ی سپتەمبەردا،تۆپی ئێرانیەکان لەگەڵ فڕۆکەی«هوریکان»، ناوچەکەیانی بۆمباران کرد. کورد بەتفەنگی ئاسایی وەڵامی دانەوەو دوو«هۆریکان»یان خستە خوارەوە. بەڵام بۆمبارانی گوندەکان درێژەی کێشا. لە سێ رۆژی یەکەمدا چوار گەند بەتەواوی سوتێندران وسێزدەی دیکەیان بەشێوەیەکی جیدی توشی زیان هاتن. ئەگەر ژمارەی دوازدە کوژراو لە شەڕکەران بێتە حیساب، ژمارەی کوژراوو بریندار لەناوژن ومنداڵ وپیر،دەگاتە دوو هەزار کەس.

دوای سالانی٤٧-١٩٤٦،ئەوە جاری دووهەمە چەکدارانی تاران هێرش دەبەنە سەر خاکی کورد. گوندەکان وێران دەکەن و دەیانسوتێنن، منداڵ وپیر دەکوژن و سەر باری هەمووی ئەوانە، هەڵکەوتوانی نەتەوەکە لەدار دەدەن.

بەناوی خەڵکەکەمەوە، بەتوندی دژ بەوکارە نامرۆڤایانە دەوەستم ونارەزایی خۆم بە حکوومەتی ئێران ڕادەگەیێنم. مخابن، بارودۆخی کورد لە تورکیا وعیراقیش، زەحمەت لەوە چاکتر بێت. شانازیم هەیە سەرنجی ئێوەی بەڕێز بەرەو ئەو ڕاستیە ڕابکێشم پەیمانی سالی ١٩٢٠ی «سیڤەر» کە لەلایەن زلهێزەکانەوە مۆرکرا- مادەی ٦٢ ٦٣،و٦٤ لەبەشی ٣، مافی گەلی کورد لە پێناو یەکێتی و

خودموختاری و تەنانەت لە هەل و مەرجێکی دیاریکراودا بۆ سەر بە خۆییش بەرەسمی دەناسێ. ئیجازە دەخوازم تکاتان لێبکەم نفوزی یەکجار زۆری حکوومەتی خۆتان بۆ راگرتنی کوشتاری دانیشتوان و بۆردومان و ویرانکردنی ناوچە کورد نشینەکان. بخەنە کار. هەر وەها لێتان دەپاریمەوە مەسەڵەی کوردستان بخەنە بەردەمی زووترین کۆبوونەوەی رێکخراوی نەتەوە یەککرتوەکان.تا بەگوێرەی روحی مادەی ٧٣ی مەنشوری نەتەوە یەکگرتوەکان لەباسی وڵاتە خود موختارەکاندا. پەیمانێک بۆ گەلی کورد زامن بکرێ ونوسولی مەنشورەکە. باڵ نکێشێتە سەر ئەوانیش. دۆستی راستە قینەتان (ئیمزا) ئەمیر دوکتور کامران عالی بەدرخان. (٥)

راپەرینی جوانرۆ بە پێچەوانەی پروپاگاندەی ئەرتەشی ئێران و راپۆرتی کاربەدەستانی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە تاران(دزی ورێگری ودەست درێژی بۆسەرعەشیرەتەکانی دەوروبەر) نەبوە. ئەوان دەیانویست لە ناوچەی خۆیاندا بە ئازادی و لە ئاشتی و هێمنیدا بژین و لە زوڵم و زۆرداری ئەرتەش و ژاندارمی دزو تریاکی لەئەماندابن. بەڵام ئەرتەشی ئێران بەیارمەتی هێندێ لە عەشیرەتەکانی کوردی ناوچە هێرشیان دەکاتە سەر و پاش شەرێکی توندو بۆمبارانی ژنو منداڵ و دێهات راپەرین دادە مرکێ و تاجارێکی دیکەش پاش پێنج ساڵ دیسان سەر هەڵدە داتەوە.

پەراوێزەکان

١ ــــ نامەی صارم الدینی صادق وەزیری بۆنووسەر، ٨ اسفند ١٣٦٣

٢ ــــ گۆڤاری گزنگ، هەمان ژمارە ١٠

٣ ــــ ایرج افشار سیستانی، کرمانشاهان وتمدن دیرینەی ان. جلددوم ١٣٧١،ل٩٨٣

٤ ــــ ئەنوەری سوڵتانی . راپەرینی جوانرۆ. گۆڤاری رابوون. ژمارە ١٨/١٩ ١٩٩٦

٥ – ئەنوەری سوڵتانی . راپەرینی جوانرۆ. گۆڤاری رابوون. ژمارە ٢٠ ١٩٩٧

ڕێکخراوەکانی حیزب لە ناوچەی مەهاباد تێکۆشانێکی بەربلاو بۆ سەرکەوتنی کاندیدای حیزبی تودە دەست پێدەکەن. هەرچەندی لە بەرنامە هەڵبژاردنی کاندیدای مەهاباد دا، سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی و مافی کولتوری و سیاسی کورد هیچ شتێک نابینرێ، لە گەڵ ئەوەش ٩٪ دەنگەکان لە مەڵبەندی مەهاباد بۆ صارمخان دەدرێ. بەو حاڵەش لە سایەی دیموکراسی مصدقەوە سەید حەسەنی ئیمامی ئیمام جومعەی تاران لە سندوقەکانی هەڵبژاردنی مەهاباد سەر وەدەر دەنێ و لە سەر کورسی نوێنەری مەهاباد دادەنیشێ.

---

ــ حیزبی دیموکرات لە ئەدەبیاتی خۆیدا صارم الدینی صادق وەزیری بەکاندیدای حیزبی دیموکرات دەناسێنێ و وانیشان دەدا کە گۆیا ئەوە حیزبی دیموکراتە صارمخانی بۆ هەڵبژاردنی پارلمان دەست نیشان کردوە.کریس کۆچراش لە(بزووتنەوەی میللی کورد) لاپەری ٢٠٢دا بێ ئەوەی ئامازە بۆ سەرچاوەیەک بکا، بەهەڵە دەنووسێ:«صادق وزیری یەکێ لەئەندامانی حیزبی دیموکرات بەنوێنەری پارلمان هەڵدەبژێردرێ.

ــ ناتەواوی وەهەڵەی کومیتەی مەهاباد وڕێکخراوەکانی حیزبی لەوەدابوو کە مەسەلەی میللی ومافی نەتەوایەتی ومەسەلەی زمانی کوردی وخوێندن وفێربوونی کوردی بەجارێک خرابوە پشت گوێ، مەسەلەی میللی لەژێر پەردەی خەباتی چینایەتی وخەباتی دژی ئیمپریالیستی لەبیرکرابوو. بە بۆچوونی من کەئێستا لە سەرئەو باوەڕم و ئەودەم قەت بیرم لەوە نەکردۆتەوە، هەم ڕێبەرانی حیزبی تودەو هەم ئەندامانی کومیتەی مەهاباد ئەگەر نەڵێم فێڵیان لێک دەکرد، بەراشکاوی دەتوانم بێژم کە تۆزقاڵێک هەڵەیەک بوون چ بەرژەوەندیی خەباتی تێدانەبوو، هیچ خێریشی نەداوەتەوە.

کومیتەی سەرکردایەتی مەهاباد لە لایەک وەک ڕێکخراوی حیزبی تودە لە ژێر ڕێنوێنی ئەو حیزبەدا خەباتی چینایەتی دەکرد و لە لایەکی تر کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ مەیدانی خەباتی چینایەتی رادەکێشا بێ ئەوەی بەرنامە و تاکتیک و ستراتیژی حیزبی دیموکراتی هەبێ و مەسەلەی مافی نەتەوایەتی کورد بێنێتە گۆڕێ.

حیزبی تودەش بەو هیوایە کە کومیتەی مەهاباد ڕێکخراوی حیزبی تودەیە لە کوردستان، بە پێچەوانەی ناوچەو مەڵبەندەکانی دیکەی ئێران بە ناوی حیزبی تودە بە ئاشکرا ڕێکخراوی لە کوردستان دانەدەمەزراند. لە ڕۆژنامەو نووسینەکانیشیدا نە باسی کومیتە و ڕێکخراوی تودەی دەکرد لە مەهابەد، نەباسی مەسەلەی میللی و مافی نەتەوایەتی دێنا گۆڕێ، نە ناوی حیزبی دیموکراتیشی دێنا.. لە ناوچەی سنەو کرماشان

## پەرەگرتنی بزووتنەوەی وەرزێری لە ئێران

لە ساڵەکانی ١٩٥٢-١٩٥٠لەگەڵ هاتنە سەرکاری حکوومەتی دوکتورمصدق و پەرەگرتنی خەباتی دژی ئیمپریالیستی و دژی کومپانی نەوتی ئینگلیز__ئێران و ئازادی نیسبی حیزب ورێکخراوەی سیاسی ، بزووتنەوەی وەرزێریش بۆ چاک کردنی مەسەلەی زەوی و کورت کردنەوەی دەستی خاوەن مڵکان لەبێگارو جەریمە و سوورسات لە سەرانسەری ئێراندا پەرە دەگرێ. لە ژێر زەختی بزووتنەوەی وەرزێریدا، حکوومەتی دوکتور مصدق بۆ دامرکاندنەوەی تینی بزووتنەوەی وەرزێری دەست دەکا بە بەرێوە بردنی جۆرە رێفۆرمێکی زەوی ، جگە لەوەی رێفۆرمێکی قووڵی رادیکاڵ نیە، بەڵکوو لەگەڵ ئەو کەموکوری یەش کە هەیەتی، دیسان ئەویش بە تەواوی بەرێوە ناچێت .

لە سەر پێشنیاری حکوومەتی دوکتور مصدق، پارلمانی ئێران لە مانگی یونی

---

رێکخراوی حیزبی تودە هەبوون بەڵام باسی ماف ومەسەلەی کورد هەر نەبوو. لە کوردستان ئەندامانی حیزب بە تاوانی تودەیی دەگیران و بە ئیستعفا و بێزاری لە حیزبی تودە ئازاد دەکران. حیزبی تودە هەموو ئەندامانی تەشکیلاتی مەهابادی بە ئەندامی خۆ دەزانی، بێجگە لە کومیتەی مەهاباو هێندێ کادری خوێندەوار، خەڵکی دیکەی حیزبی خۆیان بەئەندامی حیزبی دیموکرات و دۆستی حیزبی تودە دەزانی. ئەو روون نەکردنەوە بە سەری لە زۆر کەس شێواندبوو. ساخ نە بوونەوەی ئەندامەتی و پێوەندی نێوان دوو حیزبی ناوبراو ئاماوەیەکی زۆر لە کوردستان جێگای دم بەدمە بوە.تەنانەت لەساڵی ١٩٧١وەوپاش کۆنفرانسی سێیەمی حیزبیش کە شکڵێکی حیزبی خاوەن پێرەو و پرۆگرام و رێبەرایەتیەکی شەرعی بوو دیسان ئەم بەزمە هەربەردەوام بوو. ئەوانەی خاوەنی بیروباوەری پێشکەوتوخواز بون و لەئاست کەم وکوڕی وهەڵەی رێبەرایەتی بەزمان دەهاتن و رەخنەو پێشنیاری داهێنەرانەیان هەبایە، لە لایەن کەسانی کۆنەپەرست ومێشک زەنگاوی و نەزان بەتودەیی تاوانبار دەکران. لە هەمووی سەیرتر دوکتور قاسملوی شەهید کەخۆی تاساڵی ١٩٦٨ ئەندامی حیزبی تودەبووە، تاوانی تودەیی بوونی

١٩٥٢ياسايەكی ریفۆرمی زەوی پەسند دەكات، كە بە(یاسای ٢٠٪)ناوترا. بەگوێرەی (یاسای ٢٠٪) دەبوایە لە بەهرەی ملكانەی خاوەن ملك٢٠ ٪ كەم بكرێتەوە، لە وەی ١٠٪ بدرێتەوە بە وەرزێر و١٠٪ش بۆ ئاوەدانكردنەوەی ئاوەدانی تەرخان بكرێ.(١)

هەرچەند ئەم یاسایە بە ناو بۆ باشكردنی ژیان و بەرێچوونی وەرزێران ،پەسند كرابوو، بەڵام مەعمورەكانی دەوڵەتی بە بەرتیل لانی خاوەن ملكان دەگرن ویاسا تەنیا لە سەر كاغەز دەمێنێتەوە. لە لایەكی دیكەوە پەسند كردنی ئەم یاسایە بە دەستی وەرزێرانەوە دەبێتە بەڵگەو بیانوو بۆ توند گردنی خەبات وبەربەرەكانی دژی خاوە ن ملك و دەرەبەگان. « ...لە زۆر ناوچەكانی ئێران وەرزێران خاوەن ملكان لە گوندی وەدەردەنێن. لە هێندێ شوێن گەیشتە خەباتی چەكداریی دژی دەرەبەگان.» (٢)

---

—

كردبوە شەمشێری دیموكلیس و لە بان سەری ئەندامانی خاوەن بیرو بەشەخسیەت وتێكۆشەری هەڵدەسوڕاند. « ئەوەی بەلامەوە سەیرەزمانی شای خائین هەركوردێكی كوردستانی كە لە ئاكامی خەباتی نەتەوایەتیدا دەگیرا، بە تۆمەتی تودەیی محاكەمە دەكرا، جانەگەر تۆمەتبار بەقەڵەم وبەزمان ئیعترافیشی كردبا كە ئەندامی حیزبی دیموكراتە و بەیاننامەی حیزبیشی بە دەستەوە گیرابا هەر تودەیی بوو، من و زۆر كەسیتر هەرچی بایە هەر بەتۆمەتی تودەیی دەبوایە لە كورەی تۆمەتدا تواباینەوە. لە حیزبی دیموكراتیش من نە مامەغەنی بووم و نە محمدامینی سراجی و نەهاواڵیان بووم و نەهاوكاریان، بەلام هەرتودەیی بووم و دەبوایە دەگەڵ مام هێمن و قادری عبدی و.... لە «ئۆلەتوو» زیندانی كرابام » ( ٣ ) . پێداچوونەوە

# راپەرینی وەرزێڕا ن لەکوردستان

لە کوردستان لە سەر ڕێنوێنی حیزبی تودە بە شێوەی خەباتی سەرانسەری ئێران و لە ژێر چاوەدێری کومیتەی مەهاباد(کومیتەی گشتی وەرزێڕانی کوردستان) لەم کەسانەی خوارەوە پێک دێت:( سولتانی شێخاغایی، کەریمی حسامی، سەدیقی خاتەمی، هاشم اقل الطلاب، سەیدرەسوڵی کولتەپە). خەباتی وەرزێڕانی کوردستان شێوەیەکی تایبەتی بۆ خەبات بەرێوە دەبات.

یەکەم کومیتەکانی وەرزێری لە دێهات ناوی حیزبی تودەیان لە سەرنیەو بەناوی (حیزبی دیموکرات) کاردەکەن

دووەم لە گوندەکان شورای ٥کەسی دادەمەزرێنن، شەرتیش نیە ئەندامی حیزب بن. ئەندامانی شورا سوێند دەخۆن کە پشتی یەک بگرن و خەیانەت بە یەکتر نەکەن

سێ یەم لە سەرەتاوە بۆ دانانی سندوقێ شورا پارە کۆ دەکەنەوە بۆخەرجی کێشەو هەرای ئیداری و هاتوو چۆی شار و یارمەتی بەگیراوان و کاروباری پێویستی تێکۆشان بەکاری دێنن. کادرو ئەندامانی حیزبی دیموکرات یارمەتی و ڕێنوێنی شوراکان دەکەن و بۆ توندکردنی خەباتی چینایەتی وبەربەرەکانی دلی دەرەبەگ و خاوەن ملکە زۆردارەکان هانیان دەدەن.

خەباتی وەرزێڕان لە سەرانسەری ئێران پەرە دەگرێ. لەکوردستان، بەتایبەت لە ناوچەی موکریان و بەشی فەیزوڵابەگی و ناوچەی چۆمی مەجیدخان و سندوس بەرەو راپەرینی گشتی مل پێوە دەنێت.. رۆژنامەکانی تاران بە گەرمی دەنگوباسی خەباتی وەرزێڕان بەتایبەت لە کوردستان بلاودەکەنەوە. « وەرزێڕان لە چەند گوندی کوردستان دژی خاوەن ملکان راپەڕیون و زەویەکانیان داگیر کردوە ولە نێو خۆدا بەشیان کردوون» ( ٤ )

رۆژنامەی(ستندج)نووسیبووی» وەرزێران هەرەشە لە دەرەبەگان دەکەن، لە خەو خەبەر بنەوە. لە دوورەوە مەترسی خوێناوی وەرزێران دێتە بەرچاو. کوردستان دەبێتە کومۆنیستی.(٥)

چاپەمەنی یەکانی ئێران دەنگو باسی خەباتی وەرزێران بەدرێژی لە لاپەرەکانیاندابڵاودەکەنەوە. رۆژنامەی (توفانی غرب)دەنووسێ:«وەرزێرانی کوردستان خەبات بۆ وەدەستهێنانی زەوی توند تردەکەن. دەیانەوێ زەوی خاوەن ملکان دابەش کەن » (٦)

« لە٥٠ گوند وەرزێران زەوی خاوەن ملکانیان دابەش کردوە. وەک لەسنەوە خەبەردەدەن وەرزێرانی گوندی (گۆرموێ) ملکی خسرەوی، ملکانەی خاوەن ملکیان نەداوە. ئاغا بە دەستەو دەیارەی خۆیەوە چۆتە سەریان. بەلام وەرزێران راویان ناون. خاوەن ملک و چەکدارێکی بریندار بوون. دوو کەس لە وەرزێرەکان کوژراون. حکوومەت ویستی رەوای وەرزێرانی بە زیندان وەلام داوەتەوە.»(٧)

لە مانگی ژانویەی ١٩٥٢لە گوندی(گۆل)ناوچەی مەحالی یەختەچی مەلبەندی بۆکان، ملکی برایماغای قارەمانی وەرزێرێکی خەلکی گوندی ژن دەگوێزێتەوە وزەماوەند سازدەکا. ئاغاکان بۆ ئەوەی سووکایەتی بە مەلاعەولای پێش نوێژی گوندی بکەن کە ئەندامی حیزب و بەرپرسی شورای وەرزێرانی گوندی دەبێ، نۆکەران دەنێرن کە بە تۆبزی کیژی مەلا بێننە شایی و هەڵیپەرێنن. دیارە مەلاباوە رازی نابێ. خەلکی گوندی بە پشتیوانی لە مەلا عەولا بەدەمی ئاغاکاندا دەدەنەوەو دەبێتە کێشە و لە ئاغاکان وەخۆ دەکەون و ئاغاکان لە گوندی وەدەردەنێن. ئاغاکانی دەوروبەری سەربە برایمی بابیرئاغا کۆدەبنەوە و دەیانەوێ بچنەسەر گوندی(گۆل) و وەرزێران تەمبێ بکەن. شورای گوندەکانی ناوچە و کومیتەکانی حیزبی لە مەلبەندی چۆمی مەجیدخان و مەحالی یەختەچی داواله خەلکی گوندەکان دەکەن یەک بگرن و ئەو ئاغایانەی بەکۆمەگی ئاغاکانی قارەمانی یەوە دەچن لە گوندیان وەدەر بنێن. وەرزێران لە گوندەکانی گۆل وەمەلالەر وعەمبارو شاریکەند و ناچیت و رەحیمخان و یەکشەوە لە ئاغاکان وەخۆ دەکەون ولەگوندیان

وەدەر دەنێن. ئاغاکان رووداوەکانە بۆکان لە ژێر سەرکردایەتی و دەراستی قاسماغای ئیلخانیزادەدا کۆدەبنەوە، چەک لە ژاندارمە وەردەگرن وبۆ پەلاماردانی گوندەکان خۆ ئامادە دەکەن.

لە بۆکان حاجی قاسم ناوێک کە سەر بە حیزبی ئیران وجەبهەی میللی دوکتور مصدق دەبێ و دەیەوێ حیزبی ئیران لە کوردستان دابمەزرێنێ، خەڵکی بۆکان لە خۆ کۆ دەکاتەوە و هانیان دەدا کە ئیجارە وملکانەی نەدەن بەئاغاکان .*

لە مەهابادیشەوە سەرهەنگ موزەفەری فەرماندەی تیپی مەهاباد گورهانێک سەرباز بە تانگ و تۆپەوە بە هاواری دەرەبەگانەوە دەنێرێ. ژاندارم و ئاغای چەکدار و ئەرتەش لە وەرزێران وەخۆ دەکەون. لە پێشدا لە بۆکان ماڵی حاجی قاسم و براکانی پەلامار دەدەن. حاجی و براکانی رادەکەن و خۆ دەشارنەوە، خانووی حاجی قاسمی وێران دەکەن و بەردی بناغەی دەردێنن. دەست دەکەن بە تالان کردن و وەدەرنانی وەرزێرانی سەربزێو لە گوندەکان. بەکورتی دەست لەهیچ جنایەتێک ناگێرنەوە. بێشکەی بەمندالەوە دەخەنە چۆمی تەتەهو، خەڵکی گوندی خوێریاوا لە شامات بێشکەی بە مندالی خنکاوەوە دەگرنەوە. نە کومیتەی مەهاباد

---

یوسفی ریزوانی کە بەرپرسی کومیتەی حیزبی دەبێ لە میاندواو لە دەبیرستانی بۆکان دەرس دەخوێنێ، لە نامەیەکدا ١٥/٤/٩٦بۆی نووسیوم ودەڵێ : « ئاغاکانی بۆکان لە سەرووی هەموانەوە قاسماغای ئیلخانیزادە زوڵم و بێدادیان لە تام برد بوەدەرێ، گشت شاری بۆکان بەخەڵک فرۆشرابوو بەلام کەس مافی ئەوەی نەبوو داوای سەنەدی مالکیەت بکا.ئەوەی لە لادێ بە سەر زەحمەتکێشاندا دەهات، لە شاری بۆکانیش وەک لادێ بەدەست ئاغاکانەوە دەچەوسێنرانەوە، تەنانەت بێگاری مەسەرانەشیان دەستاند.ئەم ئاکارانە رق وکینەی خەڵک دەبزوێنێ و لە دەوری حاجی قاسم کۆدەبنەوە کە بتوانێ وەک هەزرەتی موسا لە دژی فیرعەونی زەمان بجولێتەوە و لە زولم و سوکایەتی رزگاریان بکا. بەلام ئەم جولانەوەیە جولانەوەیەکی خود بە خودی وبێ بەرنامەب ووحیزبی دیموکراتیش ئەو زەمانە ئاگاهی سیاسی کەم بوو، نەیتوانی ئەم هەلە بقۆزێتەوە، زۆر کەمتەر خەمی کرد.حیزب هیچ دەورێکی نەدی، جوتیارەکان لەم جولانەوەیەدا بێ رابەری سیاسی مانەوە. یەکێتی ئاغاکانی ناوچە پێکهاتبوو لە دژی راپەرینی جوتیاران کەوتبوونە پەلامار و لێدان و تالان کردنی مالی جوتیارەکان. حاجی قاسم ودارو دەستەکەشی قودرەت و هێزی سازدانیان نەبوو، رایان کرد و تا ئێستاش لە هەولێر دەژی.»

و نە ڕێبەرایەتی حیزبی تودە لەم مستەوایەدا نابن کە ڕاپەڕینی وەرزێڕان ڕێبەری بکەن و بەرەو شۆڕشێکی بەربلاوی گەلی ڕێنوێنی بکەن. کومیتەی مەهاباد غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی کە تازە لە زیندان ئازاد کرابوو، دەنێرێتە بۆکان کە لە نیزیکەوە ڕاپەڕینی وەرزێڕان ڕێبەری بکەن. ئەوان لە جیاتی ئەوەی بچنە بۆکان و ناوچەی ڕاپەڕینی وەرزێران دەچنە تەوریز و کرماشان و لە تاران سەر وەدەردەنێن تا بزانن ڕێبەرایەتی حیزبی تودە دەڵێ چی و بڕیاری چیدەدا.؟!

دەرەبەگە هەلاتوەکان کە چەکدار کرابوون، دەست دەکەن بە تالانی وەرزێڕە سەربزێوەکان و ئەندامانی شوڕای وەرزێڕی. لە مەهاباد دژی جنایەتی دەرەبەگان و ناردنی ئەرتەش و ژاندارمە بۆ سەرکوتکردنی وەرزێڕان خۆپێشاندانی بێزاری و مەحکومکردنی فەرماندەی ئەرتەش دەست پێدەکرێ. تێلگرافی سکالاو ئیعتیراز بە هەزاران ئیمزاوە بۆ سەرەک وەزیر و کار بەدەستانی دەوڵەتی لێدەدرێ.

هەنگاوێکی دیکەی کومیتەی سەرکردایەتی مەهاباد پێشگری لە مەڕ و ماڵاتی تالانکراوی وەرزێڕان بوو کە ئاغاکان دەیان نارد لە بازاری مەحمەدیار و مغەدە بفرۆشرێن. کومیتەی مەهاباد بە ڕێکخراوەکانی سندوس و شامات ڕادەگەیێنێ کە مەڕ و ماڵاتی تالانکراوی وەرزێڕان بۆ فرۆشتن دەبەنە بازار، بە وریایی پێشیان بگرن وژاندارمەری ئاگاداربکەن تاخاوەنەکانیان پەیدا دەبن. ئەندامانی حیزبی لە گوندەکانی(قەرەقەساب ومەمەلیان وخەلیفەلیان) لە ناوچەی سندوس نیزیکەی ٥٠٠سەر مەڕ و بزن و ڕەشە ولاغ لە نوکەری ئاغاکان دەستێننەوەو لە نەغەدە بە ژاندارمە ڕادەگەیێنن و پاش چەند ڕۆژ خاوەنەکانیان دێن ووەریان دەگرنەوە. تاوانبارەکانیش بەگرتن دەدرێن.(٨)

# سەربزێوی وەرزێران لەناوچەی سندوسی

لە گەڵ هەرای ناوچەی بۆکان لە سندوسیش وەرزێران داوای ٢٠٪ی مڵکانەی خاوەن ملک دەکەن. لە گوندەکانی قەڵاتان و دیلانچەرخ و زولمابات و مەمێند ناهێڵن خەرمان هەڵبگیرێن. کومیتەی رێکخراوی حیزب لە نەغەدە سەرپەرشتی سەربزێوی شوراکانی وەرزێری دەکات. ئاغاکانی قەرەپەپاخ و مامەش دەچنە ورمێ و هاواردەکەن ئەگەر دەوڵەت زوو نەجوڵێتەوە شۆرشی وەرزێران دەست پێدەکا و ناوچەکە دەشێوێ. کومیسیونی ئەمنیەتی شارستان کە حکومەتی مصدق بۆ گرتن ودوور خستنەوەی ئازادیخوازان داینا بوو، بریاردەدا کەئەندامە ناسراوەکانی حیزب لە سندوس بگیرێن و لەم رێگایەوە تێکۆشانی وەرزێران کپ بکرێ. لە مانگی مارسی ١٩٥٢ فەرماندەی ژاندارمەری ئازەربایجانی رۆژئاوا دێتە نەغەدە و بەبێ لێ پرسین و بریاری دادگا یازدە کەس لە ئەندامانی تێکۆشەری حیزب لە نەغەدە و لە گوندەکان دەگرێ و رەپێچەکی زیندانی ورمێ یان دەدا. گیراوەکان ئەم کەسانەی خورەوە دەبن:(کەریمی حسامی، مستەفای ساوجبلاغچی، سەعدەی محەممەدی، ئەحمەدحەلەب، مەحمود حەلەب، قاسمی پینەچی، محەممەدی سۆفی رەسووی لەنەغەدە. سەدیقی عەلایی وحەمەدی خانمێ لە گوندی (ئارنە).هەمزە ئاشەوان لە گوندی بالقچی، کاک حەمەدی سەروکانی (کاپیتان قادری) لەگوندی سەروکانی لاجانی مامەشان).

یەک لەو یاسایانەی حکومەتی دوکتور مصدق بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی ئازادی و دیموکراسی داینا بوو بریتی بوو لە:« یاسای ئەمنیەت وئاسایش ». بەڵام لەراستیدا ئاسایشی لە تێکۆشەرانی رێگای ئازادی بریبوو. بەگوێرەی ئەم یاسایە لە هەرئوستان یا شارێک کومیسیونێک لە(فەرماندارێیابەخشدار وسەرۆکی پۆلیس

وسەرۆکی ئیدارەی دارایی ونوێنەرێکی ئەرتەش ونوێنەری دادستانی) پێک دەهات. ئەم کومیسیۆنە دەسەڵاتی هەبوو هەرکەسی ویستبای بۆماوەی ٦مانگ بۆ دادگایی دووری بخاتەوە یا زیندانی بکات. ئەم یاسایە ببوە ئامرازێک بە دەست ژاندارمەری بەوە بۆگرتن و راونانی ئازادیخوازان.

دوای گرتنی ئەندامانی کومیتەی حیزب و تێکۆشەرانی وەرزێری، دەرەبەگەکانی ناوچەی سندوسیش دەست دەکەن بە وەدەر نانی وەرزێرە سەر بزێوەکان لە گوندی.(٩)

رۆژنامەی بانگی مەردوم نووسیبووی:« حەیدەری ئاغای (سەراو)گەلێک لە وەرزێرەکانی لە گوندی دەرکردوە، زەویەکانی لێ ئەستاندوون و بە تەراکتۆر دەیانکێڵێ. لە ناوچەی سندوس لە گوندەکانی (دیلانچەرخ ونارنەو قەڵاتان ١٦ ماڵی وەرزێریان لە گوندی وەدەرناوە وحکوومەتیش بۆ بەرگری لە مافی وەرزێران هیچی نەکردوە.»(١٠)

وەدەرنان و ئاوارەکردنی ئەندامانی ناسراوی حیزب ووەرزێرانی چالاک و تێکۆشەر لە ناوچەی بۆکان و فەیزوڵابەگی و مەحالی بەختەچی و ناوچەی شامات و سندوس دەست پێدەکرێ. ئەوەی لێرەدا نابێ لە بیر بکرێ وبۆ مانەوە لە مێژوودا بێتە سەرکاغەز، هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە و ئازایانەی چەند خاوەن ملکی نیشتمانپەروە کە سەرەڕای هەڕەشە و ترس وە بەرنانی حکوومەت بەراشکاوی ریزی خۆیان لە دەرەبەگانی سەر بەحکوومەت ودژی گەلی جیا دەکەنەوە و لەریزی خەڵکدا جێدەگرن. لە نێو ئەوانەدا هەڵوێستی مێرانەو نیشتمانپەروەرانەی (گەوهەرتاج خانمی )کیژی شادرەوان سەدری قازی شەهیدە کە بێگومان لە لاپەڕی مێژووی خەباتی گەلی کورد لەو سەردەمەدا دەدرەوشێتەوە. ناوبراو لەم ئاستەنگ و تەنگانەیەدا، پتر لە وەی دەرەتانیشی هەبێ، وەرزێرە ئاوارە ودەرکراوەکان لە گوندەکانی خۆیدا دەحاوێنێتەوە و نیشتەجێی یان دەکات. هەر چەندە ناوبراو سەبارەت بە هەڵکەوتی بنەماڵەیی قازی (سەرکۆماری کوردستان) لە ژێر چاوەدێری حکوومەت دادەبێ، و لە لایەن پۆلیسەوە هەڕەشەی لێدەکرێ،

گوێی ناداتە بەیتو باوی دەرەبەگانی ناوچە و هەڕەشە و چاولێ سوورکردنەوەی ئەرتەش و پۆلیس، میرانە دەفریای لێقەوماوان دەکەوێ ویارمەتی هەموو لایەنەی تەواویان پێدەکات. لە ناوچەی سندوس خاوەن مڵکی گوندەکانی( حەلب وکۆیک ویونسلیان)کەبە(ماڵەخەلیلی)ناسراون، هەموو وەرزێرە دەرکراوەکانی گوندەکانی (قەلاتان ودیلانچەرخ وئاڕنە )پەنا دەدەن و دەیانحاوێننەوە. لە ناوچەی شنۆ(موزەفەرخانی زەرزا) ما لە (برایم لێتانی) رادەگرێ وخانو وزەوی وجێگای دەداتێ. ماڵە برایم لێتانی سەردەستەی وەرزێرانی ڕاپەڕیوی ناوچەی بۆکان ومەهالی پەختەچی بوو، ناوبراو دەردەکەن و لە هیچ کوێ ڕاینا گرن تا لە ناوچەی شنۆ خۆدەگرێتەوە.(١١) بنەماڵەی لێتانی هەمیشە لە ریزی تێکۆشەرانی حیزبی دیموکرات دابوون و لە پیاوەتی و جوامێری دا بە ناوبانگ بوون.

بزووتنەوەی وەرزێران سەبارەت بە هێندێ بارو دۆخی ناوچە و نەبوونی سەرکردایەتی لێهاتوو سەرکوت دەکرێ. بەلام دە بێتە هۆی وریایی ویەکگرتنی جۆتیارانی کوردستان و پەنگ خواردنەوەی قین و بێزاری کۆمەلانی خەلک لە دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتانی سەر بە حکوومەت و توند کردنی خەباتی چینایەتی و کۆبوونەوەی زیاتریان لە دەوری حیزبی دیموگراتی کوردستان. وەرزێران شێوەی خەبات دەگۆڕن. داهاتی بەروبووی پاییزی جۆتیارانی کوردستان توتن و چەوەندەرە. کارخانەی قەند و دوخانیات پەیمان لە گەل خاوەن ملک دەبەستن و پارەی بەروبووی زەحمەتی سالانەی وەرزێران دەدرێ بە خاوەن ملک. جۆتیاری توتنکار و چەوەندەر چێن دەبوایە دەست بگرێتەوە، ئەگەر خاوەن ملکی(شیرحەلال خواردوو) هیچی دابایە باشبوو دەنا دەنگی بەهیچ کوێ ڕانەدەگەیشت. وەرزێران لە سەر ڕێنوێنێ کومیتەکانی حیزبی نامەی بەکۆمەل دەنووسن وداوادەکەن کە خۆیان پەیمان لەگەل کارخانەی قەندو دوخانیات ببەستن وبەرهەمی زەحمەت وکوێرەوەری خۆیان بۆخۆ وەربگرن. ئەم خەباتە لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەت لەو شوێنانەی کەرێکخراوەی حیزبی تێدابەهێزدەبێ، بەرهەم دەداتە دەست و وەرزێران سەرکەوتن وەدەست دێنن.

# کادری تازەی حیزبی تودەی ئێران بۆ کوردستان

کادری پێشووی حیزبی تودە کە بۆ سەرپەرشتیی تەشکیلاتی کوردستان دەینێرنە مەهاباد، سەبارەت بە ناشارەزایی لە بارودۆخی کوردستان ونەزانینی زمانی کوردی لە گەڵ ئاقار و داب و شوێنی کوردەواری زۆر جورنایەتەوە . بەهاری ساڵی ١٩٥٢ حیزبی تودەی ئێران عبدالرحمانی قاسملو وەک بەرپرسی کومیتەی کوردستان دەنێرێتە مەهاباد.

عبدالرحمن قاسملو کێ بووە؟ ناوبراو کوری مەمەدئاغای وسوق خەڵکی ورمێ بوو. مەمەدئاغای وسوق خاوەن ملکێکی ناسراوی ناوچەی ورمێ وکوردێکی نیشتمانپەروەری ناو بەدەرەوە بوە. لە نێو کورد و عەجەمی مەڵبەندی ورمێ بە پیاو ماقوڵ و کەیخودا ناسراوە. هاتوچۆی عەلیاغای سەرۆکی عەشیرەتی دێبۆکری (ئەمیرئەسعەد) بۆ ماڵی مەمەدئاغا، پایەی کۆمەلایەتی ناوبراو لە نێو خەڵکدا دەباتە سەر. مەمەدئاغا چوارکوری دەبێ و هەرچواریان دەبەرخوێندن دەنێ و هەموویان دەبنە دۆکتۆر و ئەندازیار و ئابوری زان و کەسانی ناسراوی کوردەواری. عبدالرحمن دوای وەرگرتنی دیپلۆم دەچێتە فەرانسەو لەگەڵ ئەحمەدی برای کە پێشتر لە پاریس دەیخوێند، دەست بە خوێندن دەکات. دیارە وەزعی مادی مەمەدئاغا رێگا دەدا کورەکانی بۆ خوێندن بنێرێتە ئورووپا ولە بورسی دەوڵەتیش کەلک وەردەگرن. ئەم دووبرایە لە گەڵ نورالدین زازای رەحمەتی وچەند خوێندکاری دیکەی کوردلە پاریس کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا دادەمەزرێنن. پاش ئەوەی ساڵی ١٩٤٩ لە ئێران تەقە لە شا دەکرێ، حکوومەتی ئێران بورسی خوێندن لە هێندێ خوێندکاران دەبرێ، برایانی قاسملوش

وەبەردەکەون وپارەیان بۆنایە. لە پاریس دەبن بە ئەندامی حیزبی تودەی ئێران. ئیرەجی ئەسکەندەری ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی تودە دەچێتە پاریس و خەبەردەزانێ کە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد دامەزراوەو ئەحمەد و رەحمانی قاسملوو ئەندامی حیزبی تودە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەن. ئیرەجی ئەسکەندەری پێیان دەڵێ:« لەهەموو ولاتێک یەکێتی خوێندکاران هەیە. خوێندکاری هەر ولاتێک پێویستە لە یەکێتی خوێندکارانی ئەم ولاتەدا ئەندام بێ و تێبکۆشێ. ئێوەش ئێرانین و ئەندامی حیزبی تودەشن، باشترە بچنە نێو یەکێتی خوێندکارانی ئێرانی. لە سەر رێنوێنی ئیرەجی ئەسکەندەری ئەحمەد و عبدالرحمن قاسملو بەیاننامەیەک دەردەکەن و هەڵوەشاندنەوەی ( کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا) رادەگەیێنن و کۆمەڵە بە کردەوە تا ساڵی ١٩٥٦ کە هێندێ خوێندکاری نیشتمانپەروەی کورد دوو بارە کۆمەڵە دادەمەزرێننەوە لە کار دەکەوێ. *

پاشان حیزبی تودە لە چێکوسلۆڤاکیا بورسی خوێندن بۆعبدالرحمن قاسملو وەردەگرێ و ناو براو دەچێتە پراک و خوێندن درێژە پێدەدات. دوای تەواوکردنی خوێندنی زانستگا ساڵی١٩٥٢ دەگەڕێتەوە ئێران و لە تاران لە رێکخراوی حیزبی تودەی ئێراندا چالاکی خۆی درێژە پێدەدات. لە پاشان لە سەرپێشنیاری صارم الدینی صادق وەزیری کە بەرپرسی کومیتەی کوردستان دەبێ لە حیزبی تودەدا،عبدالرحمن قاسملوو وەک بەرپرسی تەشکیلاتی مەهاباد دەنێرنە ئەو شارە. قاسملوو لە چوارچێوەی سیاسەت و دروشم و تاکتیکی حیزبی تودەدا تێکۆشان بەرێوەدەبات بێ ئەوەی کە باسی کورد و مەسەلەی نەتەوایەتی بکرێ.

لەو سەر و بەندەدا کە حکوومەتی دوکتور مصدق لە گەڵ شیرکەتی نەوتی ئینگلیز و

---

ساڵی ١٩٦٠ لە گەڵ دوکتور قاسملوی شەهید چووینە کۆنگرەی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد کە لە بیرلین گیرابوو. دوکتور کامران بەدرخانیش هاتبوو. لە گەڵ دوکتور کامران بەدرخان باسی بارودۆخی ئێرانمان دەکرد. دوکتور قاسملو خۆی بێ ناساند و گوتی من فلان کەسم و لە پاریس زۆر جار هاتوومەلات » کامران بەدرخان گوتی :« ها... کورم... ئەوە تۆبووی ئەودەم کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردت تێکداو چوویە ناو تودە.» قاسملو گوتی:« نا: میرم... من نەبووم، ئەوە کاکم بوو... من ئەو دەم چوو بوومە پراگ» پێداچوونەوە.

ئێران کەوتبوە خەبات و بەربەرەکانی، نیمچە ئازادی و جۆرە دیموکراسیەک لە ئێراندا هاتبوە کایەوە. حیزبی تودەی ئێران هەر چەندەش بەرەسمی ئیجازەی تێکۆشانی ئاشکرای نە درابۆیە، بەلام نیوە ئاشکرا خەباتی بەربلاو لە سەرانسەری ئێران پەرە پێدەدات. لە مەهاباد رۆژنامەکانی حیزبی تودەی ئێران بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز بەپ ازاردا دەیانگێرن و دەفرۆشرێن.

لە مانگی یونی ١٩٥٣تێکۆشانێکی بەر بلاوبۆ بەشداری لاوانی کورد لە چوارەمین فیستیڤالی جیهانی لاوانی دیموکرات دەست پێدەکرێ. لە مەهاباد کۆبوونەوە ومیتینگی لاوان ساز دەکرێن. رۆژی ١٩٥٣/٦/١٥میتینگی ئاشتی وهێمنانەی لاوان لە باغێکی قەراخ شار دەکەوێتە بەر پەلاماری پۆلیس و سەربازانی ئەرتەشی. لاوێکی مێرمندال بە ناوی(حەسەنی رەمەزانی) دەکوژرێ و سەدان کەسیشدەگیرێن.رۆژنامەی( KOMSOMOLCKAIA PRAVDA) ئۆرگانی یەکێتی لاوانی کوموونیستی لینینی سۆڤێتی نووسیبووی:« لەم رۆژانەدا لە باغەکانی قەراخ شاری مەهاباد لە کوردستان چەند سەت لاوی کورد بە بۆنەی ئامادە بوون بۆ چوارەمین فیستیڤالی جیهانی لاوان خەریکی سازکردنی ئاهەنگ دەبن هێزی سەربازو پۆلیس باغەکە گەمارۆ دەدەن و لاوەکان دەدەنە بەر گوللە و دەستریژ. لەم پەلامارەدا چەند کەس کوژراون و هێندێکیش بریندار‌بوون.»(١٢)

کومیتەی مەهاباد بەم بۆنەوە دژی سەرەرۆیی ئەرتەش و پۆلیس لافاوێکی توندی پرۆتێست و بێزاری دەخاتە رێ. بە سەدان ژن و مێر لە تێلگرافخانە ماندەگرن و داوای ئازادی گیراوەکان و سزادانی تاوانباران دەکەن. پۆلیس ناچار دەبێ دوای پێنج رۆژ گیراوەکان ئازاد بکا.

## سەرچاوەکان


١ - کەریمی حسامی. هێندێ لایەنی ریفۆرمی ئەرزی لەئێران، چێکی، ١٩٦٤، ل.٥٠

٢- کۆڤاری دنیا، ژمارە ٣، تاران، ١٩٦٣

٣ - رۆژنامەو نبرد، تاران، ١٩٥٢/٥/١٢

٤ - نامەی یوسفي ریزواني بۆنووسەر، ١٩٩٦/٤/١٥

٥ - رۆژنامەی سنندج، ١٩٥٢/٥/٤

٦ - رۆژنامەی توفان غرب، ١٩٥٢/٥/١٢

٧ - رۆژنامەی ستارە، ١٩٥٢/٦/٢٦

٨ - کەریمی حسامی لەبیرەوەری یەکانم. بەرگی یەکەم، ١٩٨٧، ل، ٢٠٩ ـــ ٢٠٨

٩ - هەمان سەرچاوە ل ٢١٣

١٠ - رۆژنامەی بانگ مردم، تاران، ١٩٥٣٥١

١١ - کەریمی حسامی، هەمان سەرچاوە، ل.٢١٤

١٢ - رۆژنامەی کۆمسۆمۆلسکایا پراڤدا، موسکۆ، ١٩٥٣/٧/٢٤

## بەشی چوارەم:

# کۆدیتای ئاوگوستی ١٩٥٣ دژی حکوومەتی دوکتۆر مصدق

١٩ی ئاوگوستی ١٩٥٢بە نەخشە و پلان و پشتیوانی(سی. ئای . ئێ) ناوەندی جاسوسی ئەمریکا حکوومەتی دوکتور مصدق بە کۆدیتایەکی نیزامی دەرووخێنرێ. لە گەڵ سەرکەوتنی کۆدیتا هێرشێکی درندانە و خویناوی بۆ سەر هێزە دیموکراتیەکانی وڵات دەست پێدەکرێ. کوردستانیش لەم هێرش و پەلامارەدا وەپاش نادرێ، رێکخراوی بەناو حیزبی دێموکراتیش لە کوردستان دەکەوێتە بەر پەلاماری وەحشی یانەی ئەرتەش و پۆلیس. جگە لەوانەی کە دەگیرێن، هێندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی روو دەکەنە دێهات و چەندیان دەچنە کوردستانی گەرمێن و هێندێکیش دەچنە تاران.

عبدالرحمانی قاسملوش چەند رۆژان لە ماڵی پێشەوای شەهید خۆ حاشار دەدا و پاشان دەچێتە تەورێز لە ماڵی ئەحمەدی برای پەنا دەگرێ.

لە تاران صارمخانی صادق وەزیری کە بەرپرسی کومیتەی کوردستانی حیزبی تودە بوو، دەگیرێ، شادرەوان سەدیقی ئەنجیری ئازەر ئەندامێکی لێهاتووی حیزبی تودە کە پێشتر لە تاران دەژیا، دەبێتە بەرپرسی پێوەندی لە گەڵ ئەندامانی رێکخراوی مەهاباد کە دوای کۆدیتای دژی حکوومەتی مصدق روویان کردبوە تاران و لەوێ دەسووڕانەوە. نووسەری ئەم دێرانە کە بە نوێنەرایەتی لاوانی کورد بۆ بەشداری لە چوارەمین فیستیڤاڵی لاوانی جیهانیدا چوو بوە رومانی لە گەرانەوەدا لە تاران دەگیرێ و پاش حەفتەیەک بە مەرجی وەدەر نەکەوتن لە تاران ئازاد دەکرێ. دوای ئازادی بەدوای ئادرێسی ناسراوانی پێشوودا دەگەرام، لە

ڕێگای سولەیمانی موعینی  کاک سەدیقی رەحمەتیم دیتەوە. ناو براو کە دوای کودیتاو کیرانی صارمخانی صادق وەزیری بیوە بەر پرسی کومیتەی کوردستان گوتی: لە گەڵ ئەندامانی دیکە کە هاتوونە تاران ئەشێ بگەڕێنەوە بۆ کوردستان و خەریکی سازدانەوەی ڕێکخراوبن. لە مانگی سەرماوەزی ۱۹۵۳لە گەڵ شەهید سولەیمانی موعینی بەرەو تەوریز کەوتینەڕێ. لە تەوریز چوومە ماڵی ئەحمەدی قاسملو دیتم رەحمان لەوێیە. گوتی برادەرانی دیکە بڵاو بوون و نازانم ڕوویان دەکوێ کردوە. منیش چەند ڕۆژ لە ماڵی پێشەوا خۆم شاردەوە پاشان دیتم ناتوانم بمێنمەوە. بەیانیەکی سواری گوێدرێژێکیان کردم و پێمەڕمیەکم هاویشتە سەرشان و لە گەڵ یەکێک هاتمە باغی قازی سەر ڕێگای ورمێ. ماشێنێک هات سوار بووم چوومە ورمێ. هێندێکم پارە لە دوکتوری کاکم ئەستاند و هاتوومە ئێرە و دەچمەوەتاران  ئێستا  کەس لە مەهاباد نەماوە. پێویستە خۆت بگەیێنیەوە مەهاباد کاروباری ڕێکخراو ڕێک بخەی. ئێستا بەرنامەی حیزب( مەبەست حیزبی تودەیە )  ئەوەیە کە خۆ بۆ شەڕی پارتیزانی ئامادە بکەین.

پێویستە بە وریایی ناوی ئەو کەسانە بنووسرێن کە ئامادەیی شەڕی پارتیزانیان هەیە. دەرکەوت قاسملو هەر لە خووە ئەوەی ئەگوتبوو. چونکە کەیانوری لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێ:«... هەوەڵین هەنگاوی ئێمە خۆ ئامادەکردنی شەڕی پارتیزانی بوو. هێندێ لە دۆستانی ئێمە لایان وایە ئەگەر ئەو کارەمان دەست پێکردبایە لە بەر ئەوەی ڕێژیمی کودیتا هێشتا  خۆی نەگرتبوو لە نێو ئەرتەشیش نارازی زۆر بوون، ئاگامی دەبوو. تەنانەت لە  وانەش بوو کە هێندێ تیپی ئەرتەشی رەگەڵمان بکەون»(۲)

دوای دیتنی قاسملوو گەڕامەوە کوردستان و لە گوندی ساروقامیش چوومە ماڵی ئاغای سالاری میرزافەتاحی. باسی بارودۆخی وڵاتمان کرد و گوتیان تاقە کادرێکی حیزبی بەناوی(عەولابارزانی) لەم ناوە دەسووڕێتەوە. ناردم عەولابارزانیان دیتەوە، دووسێ ڕۆژ لە لام بوو. پاشان ناردمەوە مەهاباد. دوای کودیتا کە ئەندامانی حیزبی مهاباد چۆل دەکەن. لە تاران بڕیاردەدەن

عەولابارزانی کە لە ناوچە نەناسراو بوە بینێرنە مەهاباد کە کاری حیزبی بکات. ناوبراو کە لە تاران پێشتر کوڕی رەشی ناسیبوو، دەچێتە ماڵی پێشەوا. بەلام پاش ماوەیەک رۆژێک دەرفەت دێنێ هێندێ ئالتون وپارەی ماڵی پێشەوا.ئەودی دەستی پێڕادەگا دەیدزێ و بزردەبێ. ساڵەکانی دوای ٧٠ بیستمان لەهەولێر ناوی خۆی گۆڕیوە و بۆتە شۆفێری ئوتوبوسەکانی ناو شار.

عەولا بارزانی کێ بوو؟ ئەو کابرایە کوردێکی کوردستانی گەرمێن بوو لە گەل بارزانیەکان هاتبوە ئەمدیو. دوای رۆیشتنی بارزانیەکان ناوبراو لە ناوچەی شنۆ دەمێنێتەوەو دەگیرێ. دەیبەنە زیندانی تەوریز و چەندساڵ لە بەندیدا دەبێ. دوای ئازاد بوونی دەچێتە تاران و بە ئاشنایەتی لە گەڵ کوردان دەبێتە ئەندامی حیزبی تودە و ئەوان دەنێرنەوە کوردستان. با بزانین کادرێکی حیزبی تودەی ئێران بەناوی ( محمد روزگار) لە بیرەوەریەکانی خۆیدا چۆن باسی عەولابارزانی دەکات؟ «

«....لەلایەن کومیتەی ئەیالەتی یەوە کابرایەکیان بۆ لقی حیزبی ئێمە ( لقی سەلسەبیل)نارد بە ناوی(عبداللەبارزانی) ئەسپاردیان کە لە بارەی جێگا کارو ژیانەوە یارمەتی بدەین. پیاوێک بوو ٢٨ ــ٣٠ساڵە. فارسی و کوردی و عەرەبی باش دەزانی، زۆر جار لە کاتی سەر خۆشیدا هەولمان دەدا ژیننامەی بزانین. بەلام هەر چەندی سەرخۆش دەبوو دەیگوت لە بارزانیەکانی عیراقم. کاتی چوونی بارزانیەکان بۆ سۆڤێت گیراوەو چەندساڵ لە زیندانی تەوریز دابوە و هەر لە وێش بۆتە ئەندامی حیزبی تودە. کاتێ لێمان دەپرسی ئەوفارسیە لە کوێ فێربووی. دەیگوت لە زیندانی تەوریز تورکی وفارسی فێربووم. عەولا بارزانیمەن لە کانگای ئاوی تاران وەک دارتاش دامەزراند. لە گەڵ خاوو خێزانمان بوو بە ئاشنو هاتووچۆی ماڵەکانی دەکرد و کاتی بێکاری هاوڕێیاتی حیزبی لقی(سەلسەبیل) پارەیان دەدایە. پاشان دەرکەوت عەولابارزانی جاسوسێکی زرنگی سازمانی ئەمنیەت بوەو هاتۆتە نێو حیزبی تودەوە. دوای کۆدیتا عەولابارزانی بڕیار دەدا بچێتەوە عیراق و میراتی باوکی لە مامی بستێنێ. ماوەیەک بزر دەبێ. ئێمە لێی بێ خەبەر بووین. پاشان سەرو کەللەی لە تاران پەیدا دەبێ ولە گەڵ عەلی قازی

(کوڕی قازی محمد)دەگەڕێ. عەولابارزانی کە لە سەفەری عیراق گەرابۆوە دەیگوت: چەندین هەزار تمەن پارەی هێناوە. ئەمجارە دژی عەلی قازی دەدوا. ئێمە کومانمان لە وەدا ئەما کە پارەیەکی زۆری هەیە. بەلام لەوە بەشک بووین کە داخوا چۆتە عیراق و میراتی وەگیرکەوتوە.؟ ئەم پرسە بۆ ئێمە مەتەل بوو. تارۆژێک بەهەلکەوت بەشەقامی سویادا تێدەپەریم. عەولابارزانیم دیت لەگەل عەلی قازی دەکەرێ. گورج بۆ(سەمەد)م گێراوە. برپارماندا لە سەرهەست بێن و درۆنگی خۆمان بە برادەرانی سەرەوەش راگەیاند. بە عەولابارزانیشمان گوت:« شانەکان هەلوەشاون و تێکۆشان راوەستاوە.» ئاشکرابوونی رێکخراوی نیزامی حیزبی تودەش بیانوێکی باشبوو. بەلام عبدالله دەیگوت: شانەکان لە سەر شەقامیش کۆدەبنەوە. هەمیشەش هاواری بوو کە بۆچی چەند شانەیەکی حیزبی بەمن ناسپێرن. بەسەر چوو من چوومە شورەوی. پاش ٧ سال نامەیەکی (سەمەد)م پێگەیشت. نووسیبووی: «لە بیرت ماوە کە لە ئاخرین رۆژەکانی رۆیشتنت گوتت لە عەولابارزانی خۆتان بپارێزن. پاش سەفەری تۆ عەولابارزانی هەموو هاورێکانی ئێمەی پێوەکرد. من ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئەشکنجەدابووم. چونکە لە مالی ئێمە سەنەدو بەلگەیان دۆزیبوونەوە. ئەو کەسەی چەند سال نان ونمەکی ئێمەی کردبوو خەیانەتی پێکردین. دەرکەوت جاسوسی نێونەتەوەیی بوە. ئێستا ناردوویانەتە سوریا لە وێ خزمەت بە ئەربابی بکات.»(٣)

دوای بلاو بوونی ئەندامانی سەرکردایەتی کومیتەی مەهاباد وهاتنەوەی کەریمی حسامی بۆ نێو شار. کومیتەیەکی کاتی لە مەهاباد پێوەندی لە نێوانی ئەندامانی حیزبدا نوێ دەکاتەوە و هێندێ شانەی حیزبی نوێ دەکرێنەوە. هاوکارانی ئەو کومیتەیە بریتین لە:

:(کەریمی حسامی، عەولای حەکیمزادە، قاسمی سولتانیان، یونسی بلوریان، جەلیلی گادانی و لاوێکی کرماشانیش بە ناوی بەهنام کە حیزبی تودە وەک بەرپرسی لاوان نارد بوویە مەهاباد.

دووی رێبەندانی ١٩٥٤ کومیتەی کاتی لە مەهاباد بۆ یاد کردنەوەی کۆماری

کوردستان کۆبوونەوەیەک پێک دێنن. بۆ ئەوەی سامی خەڵک بشکێ وحکوومەت وانەزانێ کە بزووتنەوەی کورد بە جارێ خینکاوە، دەگاتە ئەو بڕیارە کە لە دیوارەکانی شار یادی کۆماری کوردستان و « بژی دووی ڕێبەندان » بنووسرێ و ئالای کوردستانیش لە سەر لوتکە چیاکانی دەور و بەری شار هەڵبکرێن. کابرای کرماشانی بەو باسە و بەبیستنی ئەم بڕیارە هەڵدەبەزێتەوە و دەڵێ:« ئەم قسانە چەس؟ ئەمە فیکرێکی ناسیونالیستی یە و حیزبی تودە شتێکی ئاوای بەمن نەگوتوە». برادەرانی کومیتە گوێ نادەنە کابرا و بڕیارەکە ئەنجام دەدرێ. بەیانی پۆلیس و ئەرتەش کە ئالای بان لوتکە چیاکان و دروشمی دیواران دەبینن، هار دەبن، دەست دەکەن بە جۆرە ڕەش بگیریەک و ئەوانەی گومانیان لێدەکەن دەیان گرن. بە تایبەت ئەندامێکی تێکۆشەر بەناوی (مەحموودی خسرەوی) لە رادە بردەر ئازار و ئەشکنجەدەدەن . لەترسی ئەوەی ئەوەکوو بمرێ، دەیدەنەوە بەدایک وبابی وڕێگاش نادەن بیبەنە تەورێز یاورمێ بۆ سەردوکتور وناهێڵن دوکتوری شاریش بچێتەسەری، عەولای حەکیمزادەی ڕەحمەتی بەنهێنی هاتووچۆی دەکاودەرمان وئامپولی پێویستی بۆدەبات. ئەوە یێکەم جارە پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان ئاوا یادی ئەم کۆمارەو دووی ڕێبەندان زیندوودەکرێتەوە. برادەری کرماشانی بەناوی ڕەخنەونارەزایی لەم کارە پێدادەگرێ کە لە مەهاباد نامێنێ، بەم زستانە سەختە دەینێرنەوەتاران .( ١ )

## دەورەی دووەمی رۆژنامەی کوردستان

بەر لەوەی بێمە سەر باسی بڵاو بوونەوەی دەورەی دووەمی رۆژنامەی کوردستان لە ئێران، بۆ مانەوە لە لاپەڕەی مێژوودا پێویستە ئەم رۆژنامەیەش نە خرێتە پشت گوێ کە بەناوی« رۆژنامەی کوردستان - ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان» لە «باکۆ» ئازەربایجانی سۆڤیێتی پێشوو لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە بڵاو کراوەتەوە. ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیە هەموویان بە دەستەوە نین. بەڵام دەبێ لە دوا مانگەکانی ساڵی ۱۹٤۷ وە دەستی بە بڵاوبوونەوە کردبێ و تاساڵی ۱۹٦۱-یش بەر دەوام دوو جار لە حەفتەدا بڵاو بوو بێتەوە. لەم رۆژنامەیە ژمارە ۲۲۹،شەمۆ ۲۲ی رێبەندانی ۱۳۲۸(۱۱ی فەبریوەری۱۹۵۰و ژمارە ۸۷۷ چوار شەمۆ ۱۲ی سێپتامبری ۱۹۵٦ بە دەستەوەن و تا رادەیەک مەبەست و نێوەرۆکی نووسینەکانی ئەو رۆژنامەیە روون دەکەنەوە.

رۆژنامەی کوردستان چاپی باکۆ لە یەک لاپەڕەدا لە پاڵ رۆژنامەی «ئازەربایجان» ئۆرگانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دابڵاو کراوەتەوە. وەک لە لاپەڕەی ئەم رۆژنامەیەدا دەردەکەوێ نووسەرانی بریتی بوون لە:(دوکتور رەحیمی قازی، عەلی گەلاوێژ، کەریمی ئەیوبی، ا.نادری، رەشید.س. ر. گەرمیانی، م.شەڵماشی) دیارە پرۆفیسور قەناتی کوردۆیێف یش وتاری بۆ نووسیون. وەک دەزانین نووسەر و بەڕێوە بەرانی ئەم رۆژنامەیە ساڵی ۱۹٤٦ لە لایەن حکوومەتی کۆماری کوردستانەوە بۆ خوێندن دەنێردرێنە ئازەربایجانی سۆڤیێتی وپاش تێکچوون کۆماری کوردستان ئیتر ناگەڕێنەوە و بەناوی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە باکۆ «رۆژنامەی کوردستان » بڵاو دەکەنەوە.

لە ژمارە ۲۲٦ -۲۱ی ژانویەی ۱۹۵۰ لە ژێر سەرخەتی:« کۆبوونەوە بەبۆنەی

پێنجەمین وەرزی حکوومەتی نەتەوایەتی کوردستان«دا. نامەی کومیتەی ناوەندی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان، بۆ کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان، بلاو کراوەتەوە. لە ژمارەکانی دیکەدا یادی هەوەڵین کونگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان و یادی دامەزرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و. وتاری جۆربەجۆری سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری و کولتوری لە بارەی ئێران وولاتانی هەندەران بەر چاو دەکەوێ.

لە ژمارە ٥٩٢، ٢٨ی نوامبری ١٩٥٢ لە لایەن کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە نووسراوەیەک دەبینین تێیدا هاتوە« لە لایەن کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان را. کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە پاش ئانالیزی کودیتای شا-زاهیدی و لێک دانەوەی بەسەر هاتەکان، پێشنهادی تەشکیلاتە پێشکەوتوەکانی ولات لە مەڕ پێویست بوونی جبهەییکی واحدی زیدی ئیمپریالیستی بۆ شکاندنی دوژمنی موشتەرەک و سەرەو ژێر کردنەوەی حکومەتی مونارخۆ-فاشیستی شا-زاهیدی لە سەر ئەساسی دوو بەندی خوارەوە تەئیید دەکات.

١ - حکوومەتی خائینی شا-زاهیدی سەرەو ژێر بکرێتەوە و شوێن ونەتیجەی ئەو جنایەتانەی کە بە دەستی ئەو حکوومەتە بە پێچەوانەی حاکمیتی نەتەوایەتی و رزگاری کۆمەلایەتی خەلک دەکرێت، لە نێوان لا ببردرێت.

٢ - دەوڵەتێک بهێندرێتە سەر کار کە دەبێناوی برینی قەتعی نفوزی داگیر کەرانەی ئیمپریالیستەکانی ئەمریکا و ئینگلیز دا ئیقدام بکات و لە هەموو جێگایەکی ولات ئازادی دیموکراتیک یانی ئازادی حیزب، هەلبژاردن، مضبوعات، کۆبوونەوە و نمایش دابین بکات. کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان«

لە ژمارە (١٠٩٠ - ١٨ ئوکتوبری ١٩٥٨ تاژمارە ١٩٠٧)ی رۆژنامەی کوردستاندا ریزە وتارێک لە بارەی مەسەلەی کورد لە ئێران بە قەڵەمی عەلی گەلاوێژ بەرچاو دەکەوێ تێیدا هاتوە:« ... ئێران ئێمرۆ بۆخۆی دەوڵەتێکی هەیە. ئەو دەوڵەتە ئەگەر کۆنە پەرستیش بێ، دەوڵەتی ئێرانە. بەلام کوردستان خۆی

دەوڵەتی نیە. لە مافی دەسەلاتی سیاسی بێ بەشکراوە. لە بەر ئەوەیە لە کاتێکا خەڵکی ئێران دابینکردنی ئامانجی نەتەوەیی خۆی لە روخانی دەزگای کۆنەپەرستی دەسەلاتداراداو گۆرینی ئەودا دەبینێ، خەڵکی کورد بەم کارە واتە بەرووخانی دەزگای دەوڵەتی کۆنەپەرستی ئێران. بە هیچ ئامانجێکی بنەرەتی خۆی ناگات. چونکە لەو حاڵەتەدا هێشتا دەسەلاتی نەتەوەیی دیموکراتیکی خەڵکی کورد دانەمەزراوە تەنیا دروشمی راست کە ئیمرۆ دەتوانێ میلیۆنها ئینسانی پشتمانپەروەری کوردستان لە دەورەی خۆی کۆ بکاتەوە بریتی یە لە دروشمی خەبات دژی ستەمی نەتەوەیی و خەبات بۆ دامەزراندنی دەسەلاتی سیاسی دیموکراتیکی گەلی کورد..»

وادەردەکەوێ ئەم رۆژنامەیە دوای کۆنفرانسی یەک گرتنەوەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و حیزبی تودەی ئێران ۲۹ی مانگی یولی۱۹٦۰لە دەرەوەی ولات، ئیتر لە دەرچوون کەوتوە و یا بلێین داخراوە. لە نامەیەکدا کە بەرێز دوکتور رەحیمی قازی لە ۱۹٦۲/۱/۱۲بۆ نووسەری ئەم دێرانەی ناردوە دەنووسێ: «....داخرانی « رۆژنامەی کوردستان » لە پاش ۱٥سال دەرچوون لە لایەن تودەوە یەکێک لە سەهوەکانی هەرە گەورەیە کە تودە لە کاتی دوور لە نیشتمان تووشی بوەوە نیشتمان پەروەرانی کورد نارازی ئەکات..»(رێنوسی ئەم نووسراوانە دەستکاری کراوە)

بەهاری سالی ۱۹٥٤برایانی یوسفی( عەزیزوقادر) لە گەڵ غەنی بلوریان و رەحمانی قاسملو لە تەوریز کۆ دەبنەوە و بە یارمەتی حیزبی تودە و لە چاپخانەی نهێنی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان رۆژنامەی کوردستان دەردەکەن. دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان و پاشماوەی ئەندام و رێکخراوەکانی کوردستان لە ژێر رێبەرایەتی حیزبی تودە تێکۆشان لە کوردستاندا درێژە پێدەدەن . دوکتورقاسملوی شەهید لەم بارەوە دەڵێ:

«... ئەو تەشکیلاتەی کە زیندوو کرایەوە لە راستیدا بە یارمەتی حیزبی تودە بوو. حیزبی تودە هەر چەند یارمەتی دابوو حیزبی دیموکرات زیندوو بێنەوە. بەلام

بەکردەوە هەر ناوەکەی حیزبی دیموکرات بوو، تەواوی خەتی سیاسی، رێبەرەکەی و هەتا دەستووری تەشکیلاتی هەموو لە تارانەوە لە لای حیزبی تودەرا بۆی دەهات.»( ٤ ) *

دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان هەر چەند لە ژێر رێنوێنی حیزبی تودەی ئێراندابوو، بەلام بۆ ئاشکرا کردنی ناو ونیشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەو کاتە حەستەم و دژوارەدا بە هەنگاوێکی پیرۆز و گرنگ دەژمێردرێ.

لە گەڵ ئەوەش کە نە(کوردستان)ەکەی باکۆ و نە(کوردستان)ەکەی تەوریز هیچیان ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات نەبوون و هیچ کومیتە ناوەندی یەک لە گۆڕێدا نەبوو تا ئۆرگانی رەسمی بلاو کاتەوە و تەنیا چەند کەسی تێکۆشەر بەناوی حیزبی دیموکرات هەڵدەسوڕان و ناوی حیزبی دیموکراتیان دەپاراست .

. رۆژنامەی کوردستان هەروەک لە کلیشەکەی دیارە وەک« ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان» بلاو دەکرێتەوە. لە سەر دێری نووسراوە:«ژمارە ١دەورەی دووەم » یەک شەمۆ ــــ ٥ بانەمەری ١٣٣٣،واتە(٢٥ی ئەپریلی ١٩٥٤) لە سەرخەتی لای راستەی نووسراو: «لە رێگای ئاشتی و بەرامبەر بە ئەمپریالیزم خەباتی خۆمان پەرە پێدەدەین»

لە لای چەپەی لاپەرەی یێکەم نووسراوە » ..بۆ وەدەست هێنانی دیموکراتی و حاکمیەتی نەتەوایەتی بەرەوپێش» سەر وتاری رۆژنامەی کوردستان لە ژێرئەم ناو ونیشانەدا دەنووسێ: » پاش هەشت ساڵان دیسان رۆژنامەی » کوردستان

---

بەمحاڵە دوکتور قاسملوە (چل ساڵ خەبات) دادەنووسێ: «...حیزبی دیموکراتی کوردستان چل ساڵ لەمەو بەر لە هەل ومەرجێکی زۆر دژواردا ئەم مەسئولیەتە گەورەی بەعۆدە گرت. دیتمان کە حیزب بەتەواوی بۆ ئەم بەرێوەبەری یر ئامادە نەبوو وە یەکێک لەهۆیەکانی تێکشکانی کۆماری کوردستانیش هەر ئەوە بوو. بەلام ئەو رێ مرەسمە واتە رێ ورەسمی بەرێوە بەری حیزب هەر مایەوە. لەو کاتەوە تا ئێستا کە چل ساڵ رادەبری جولانەوەی گەلی کورد لەکوردستانی ئێران هەر لە ژێر بەرێوەبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان دا بوە. هیچ رێکخراوێکی دیکە نەیتوانیوە ئەم مەسئولیەتە گەورە بەعۆدە بگرێ.» ( ٥ )

«ارکانی حزبی دیموکراتی کوردستان زبانی نەتەوەی ئیمە لە شەرایتی سەختی دیکتاتۆری فاشیستی دا بلاو ئەکرێتەوە. لە ماوەی ئەم هەشت ساڵەدا دوژمنانی خەڵکی کوردستان یانی ئەمپریالیزمی شەر هەلایسێنەر و کۆنەپەرستانی ئیرانی نەک هەر نەیانتوانی بەربەرەکانی نەتەوەی کورد خاپور بکەن، بەڵکوو خەباتکەران (مبارزین)خەڵکی ئیمە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەموو کاتێک وە لە هەموو شەرایتێک دا بەرامبەر داگیرکەرانی حکوومەتی تاران راوەستان و ئالای حیزبی دیموکراتی کوردستانیان سەر بەرزو بلێند راگرت. لەم،ماوەیەدا زۆر جار حیزبی دیموکراتی کوردستان، بەهۆی بەیان نامە و تراکت میللەتی کوردی لە چۆنیەتی(کیفیت)، سیاسی ولات ئاگادار کردو رێگای بەربەرەکانی پیشاندا.حیزبی ئیمە هیز و توانای خۆی لە رابیطە و نیزیکی لە گەڵ گەلانی خەڵکی کوردستان ئەزانێ و هەر وەها بۆ پێکهێنانی ئەو ئاواتە یانی مەحکەم کردنی رابیطەلەگەڵ خەڵک و بە دیموکراتی و نەتەوایەتی لە نیشتمانی ئیمە دایە کە دوو بارە رۆژنامەی کوردستان کە ئاوینەی ژیان و خەباتی نەتەوەی کورد بوو دیسان هەر بۆ نە و نامانجە یانی کەساسی وبێ بەشی کورد بخاتە بەر چاو و رێی دوا رۆژی خەڵکی ئیمە بنوێنێ بلاو ئەکرێتەوە، رۆژنامەی «کوردستان» هەر وەکوو پێشەوای شەهیدی ئیمە قاضی محەممەد پیشانی داوە خەباتی خەڵکی لەرێگای ئازادی و رزگاری کورد و کوردستان بەرێوە دەبا وە بۆحەقی ژیانی نەتەوەی کوردو پێکهێنانی ئاواتەکانی مێژوویی ئەو تێدە کۆشێ.

«کوردستان» لە حەقی نەتەوایەتی، لە زبان وفەرهەنگ وسونەتەکانی مێژوویی نەتەوەی کورد هەر وەها لە شەرەف وشانازی وی دفاع دەکات وەدەنگی بەربەرەکانی وتەقەلای وی بەگوێی بەشەریەتی پێشرو دەگەیێنێ.

«کوردستان» بۆیەکیتی تێک نەشکاو و مەحکەمی کرێکاران و جوتێران و رووناک بیران، پیشەوەران و عەشیرەتە خەڵک پەروەرەکان کە ضامنی رزگاری نیشتمانی ئیمەیە هەوڵ ئەدا.

«کوردستان » مەبەستی ئەوەیە کە دۆستایەتی نەتەوەی کورد لەگەڵ نەتەوەکانی

ئازەربایجان و ئێران و گشت نەتەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست گەشە پێبدا.

« کوردستان » هەر وەکوو جاران بۆ دۆستایەتی و برایەتی حیزبی قارەمانی تودەی ئێران و فیرقەی خەباتکەری دیموکراتی ئازەربایجان تێ دەکۆشێ وە بۆ رزگاری نەتەوەکانی ئێران لە ژێردەستی ئەمپریالیزم هەول ئەدا.

« کوردستان » بە هەموو تواناییەکەوە لە پێناوی ئاشتی و دیموکراتی ئاماتجی بەرزی نەتەوەکانی گێتی خەبات ئەکا و بۆ پاراستنی ئاشتی لە ناو میللەتان وە بۆوەی کە نیشتمانی ئێمە نەبێتە مۆلگای شەری زیدی یەکیتی شورەوی بێ وچان تێدەکۆشێ

« کوردستان » دۆست و دوژمنی میللەتی کورد دەناسێنێ وە هەروەها کە لە یەکیتی شورەوی و هێزەکانی ئاشتی و دیموکراتی بۆ ژینە دۆستێکی خەلکی کوردستان دفاع ئەکات بەرامبەر بە شەر هەلایسێنەرەکان، ئەمپریالیزمی خوێن مژ وەکوو دوژمنانی نەتەوەی کورد بەربەرەکانی ئەکات. دەرکەوتنی دووبارەی کوردستان لە شەرایتی سەختی ئەورۆدا نیشانەی توانایی و بەهێزی حیزبی دیموکراتی کوردستان وە گشت خەباتکەرانی نەتەوە کوردە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان بلاو بوونەوەی دوو بارەی رۆژنامەی« کوردستان »کە بە سەرهاتێکی گەورە لە مێژووی نەتەوەی ئێمەیە لە هەموو دانیشتوانی کوردستان و گشت نیشتمانپەروەرانی کورد پیرۆزبایی ئەکا و هیواداره کە ئەو بەسەرهاتە ببێتە تەلیعەی سەرکەوتنی گەورەتر لە دوارۆژی خەلکی ئێمەدا وە خەباتی یێکرەنگ و یەکگرتووی گەلانی زیدی ئیستعماری کوردستان و ئازەربایجان و ئێران سەر بکەوێ. ئێستا وەزیفەی ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و ئەفرادی بە شەرەفی کوردە کە رۆژنامەی «کوردستان» بگەیێننە هەموو شارەکان و دێیەکانی کوردستان وە ئەرکی خوێندەواران ئەوەیە بۆ نەخوێندەوارانی بخوێننەوە، تێ یان بگەیێنن هەر وەها هاورێیانی خوێندەواری ئێمە ئەبێ دەنگ وباسی ناوخۆ و چۆنیەتی ژیان و خەباتی گەل و داخوازیاتمان بۆ بنووسن و بینێرن. با هەموو نەتەوەی بە شەرەفی کورد رۆژنامەی کوردستان بە

دۆست و یارمەتیدەری خۆی بناسێ و ئیلهامی لێ وەرگرێ بەو جۆرە رۆژنامەی کوردستان ئەتوانێ ئەرکی مێژوویی و راستەقینەی خۆی پێک بێنێ و ببێتە رێنوێنی خەباتی خەلک و زبانی میللەتی کورد و گەلانی کوردستان »

وتارێکی دیکەی رۆژنامەی کوردستان لە لاپەرەی یێکەم دا لە ژێرسەرخەتی: «....نەتەوەکانی ئێران هەتا سەرکەوتنی دوایی لە میللی بوونی نەفتی خۆیان دیفاع دەکەن» دژی پێکهاتنی کۆنسرسیۆمی نەوت، زەرەر و زیانی پێکهاتنی کۆنسرسیۆم و پیلانی شیرکەتەکانی نەوتی ئینگلیز و ئەمریکا روون دەکاتەوە و لە کۆتایی وتارەکەدا دەڵێ:« حیزبی دیموکراتی کوردستان لە هەموو نەتەوەی بە شەرەفی کورد، لە هەموو ئەندامانی خۆی داوا دەکات کە تەواوی هێز و توانای خۆیان بەکار بخەن بۆوەی کە نەخشە گلاوەکانی دوژمنە خوێن مژەکانی ئێمە نەیەتەدی.»

وتارێکی دیکەی رۆژنامەی کوردستان لە ژێر سەرخەتی: « دۆستایەتی تێک نەشکاوی نەتەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان رۆژ بە رۆژ چەسپاوتر و گورج تر ئەبێ » دەنووسێ: « رۆژی سێی بانەمەرلە مێژووی نەتەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان رۆژێکی تاریخی یە.

لەو رۆژەدا پەیمانی دۆستایەتی و یەکێتی لە ناو خەلکەکانی ئێمە لە لایەن نوێنەرەکانی دوو نەتەوە ئیمزا کراوە.

دۆستایەتی نەتەوەی کورد لە گەل خەلکی ئازەربایجان سەرچاوەی دوورو درێژو مێژوویی هەیە. نەتەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان هەمیشە لە زەرەر و قازانج هاو بەش بوون و دۆست و دوژمنیان یەک بوە. ئەمپریالیزمی خوێنمژی ئەمریکا وئینگلیز و هەروەها داگیرکەرانی حکوومەتی تاران نەتەوەکانی ئێمەیان بێرەحمانە وبێشەرمانە ئیستسمارکردوە. ژیان و ناموس و فەرهەنگ و زبان و هەرچی کە نیشانەی نەتەوایەتی ئێمە بوو لە لایەن حکوومەتی بەگرێگیراوی تاران بە چاوی نزم(پست)و سوک تەماشا دەکرا و بە تالانی دەبرد.

نەتەوەی کورد هەر وەکو نەتەوەی ئازەربایجان بۆ رزگاری و ئازادی خۆی لە ژێر زولمی زۆرداران هەوڵ ئەدا. چاکترین و بە شەرەفترین رۆلەکانی ئەو دوو

نەتەوەیە لە ریگای رزگاری نیشتمان و بۆ پێکهێنانی ژیانێکی سەربەست و بەختیار بۆ نەتەوەی خۆیان شەهید بوون و قوربانی کران، بەلام نە کوشتار و زۆرداری و نە تەقەلای دوور و درێژی داگیرکەرانی تارانی نەیتوانی بەربەرەکانی نەتەوەکانی کورد و ئازەربایجانی دابمرکێنن. پاش ئەوەی کە یەکێتی شورەوی قەلای ئەروخی ئاشتی و سۆسیالیزم بە سەر فاشیزمی هیتلەریدا زال بوو، بۆ نەتەوەکانی زۆر لێکراوی کوردستان و ئازەربایجان هەلکەوت تا حکوومەتی میللی خۆیان دابمەزرێنن. لە ماوەی سالێک بوونی حکوومەتی میللی لەکوردستان و ئازەربایجاندا دۆستایەتی و یەکێتی گەلانی ئەو دوو ولاتە هێشتا زیاتر وپتەوتر بوو. ئیتر حکوومەتی تاران نەیدەتوانی سیاسەتی ئیستعماری خۆی کە سیاسەتی بەشکردن و حکوومەت کردنە لە ولاتەکانی ئێمەدا بێنێتەدی. ئەو جار بە پێچەوانەی ئەو سیاسەتە نەتەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان حالی بوون کە زیاتر لە هەموو کاتێک پێداویستیان بە دۆستایەتی و برادەری هەیە، هەربۆ ئەوە بوو کە لە مانگی بانەمەر پەیمانی دۆستایەتی لە لایەن نوێنەرانی هەر دوو لاوە ئیمزا کرا. لەو پەیمانە دەر ئەکەوێ کە حکوومەتەکانی کوردستان و ئازەربایجان حازر بوون وەک دوو حکوومەتی برادەر و دوو دراوسێی دۆست پێکەوە رابوێرن و لە نەزەری سیاسی لەشکری و ئابووری یەوە یاریدەی یەکتری بدەن. ئەو پەیمانە رایدەگەیاند کە ئەو دوو نەتەوەیە ئەبێ بە یەکەوە بەرامبەر بە زۆردارانی تارانی بەربەرەکانی بکەن، ئەو پەیمانە نیشانەی ئەوە بوو کە دۆستایەتی ئەو دوو نەتەوەیە یارمەتی جولانەوەی زیدی ئەمپریالیستی لە تەواوی ئێراندا ئەکرد، هەر بۆ وەی بوو کە گەلانی کوردو ئازەربایجان بە شادی و خۆشی یەوە لەو پەیمانە پێشوازیانکرد، ئەورۆکەش کە هەشت سال لە رۆژی بەستنی ئەوپەیمانە رابردوە دیسان نەتەوەکانی کوردو ئازەربایجان بەوی وەفاداران و گورجتر و چەسپاوترکردنی دۆستایەتی خۆیان تێدەکوشن. ئێستاکەش نەتەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان هەروەها کە بۆ یەکەتی و دۆستایەتی خۆیان لە گەل نەتەوەی ئێران هەول ئەدەن هەروەهاش بەرامبەر بە حکوومەتی بەکرێگیراوی تاران، بەرامبەر بە هەتیوی

رەزاخان و کۆدیتاچیان بەربەرەکانی ئەکەن.

ئیستاش کە نەتەوەکانی ئیمە بە چاکی ئەزانن کە رزگاری و بەختیاری ولاتی ئیمە بێ وەی کە ئەمریکاییەکان و ئینگلیزیەکان لە ئیران دەربکرێن مومکن نیە گەلانی ولاتی ئیمە حازربن پاش ئەو هەموو فیداکاری و گیانبازیە نەفتی ولاتەکەیان بکەوێتە دەست دوژمنانیان کە ئەمپریالیزمی ئەمریکا و ئینگلیزە و خوێنی شەهیدان بە خۆرایی بچێ. ئیستاکەش نەتەوەکانی ئیمە تێدەکۆشن کە پێش بە شەرهەڵایسێنەرەکان بگرن و نیجازە نەدەن کە نیشتمانی وان ببێتە کانگەی شەڕی زیدی شورەوی کە چاکترین دۆستی وانە.

لە رۆژی سێی مانگی بانەمەڕ کە رۆژی دۆستایەتی و برادەری گەلانی ولاتی ئیمەیە، نەتەوەی کورد جارێکی تر وەفاداری خۆی بە پەیمانی دۆستایەتی تازە دەکاتەوە. لە سەر خەباتکەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانە کە بە هەموو هێزێکەوە یەکەتی و برایەتی نەتەوەی ئیمەی لە گەڵ نەتەوەکانی ئازەربایجان و ئیران وەک گلێنەی چاوی خۆیان بپارێزن و رۆژ لە رۆژ گورجترو ریشەدارتری بکەن. بێگومان یەکەتی نەتەوەکانی ئیمە لە گەڵ نەتەوەی ئیران زامنی رزگاری گەلانی زۆرلێکراوی ولاتی ئیمە لە ژێرباری ئەمپریالیزم و کۆنەپەرستانی ئیرانی و دوارۆژێکی بەختیار و سەر بەستمان بۆ پێک دێنێ.

بژی رۆژی سێی بانەمەڕـــ رۆژی دۆستایەتی نەتەوەکانی کوردوئازەربایجانی،

بژی جبهەی واحدی زیدی ئەمپریالیستی مەزهەری یەکەتی تێک نەشکەوی خەڵکەکانی ئیران،

سەرکەوێ بەربەرەکانی گەلانی ولاتی ئیمە لە ژێر رێبەری حیزبی تودەی ئیران و حیزبی دیموکراتی کوردستان و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان»

رۆژنامەی«کوردستان» بەبۆنەی رۆژی جیهانی کارگەر لە ژێر سەرخەتی :«پیرۆزبێ رۆژی یەکەمی مای جێژنی ناونەتەوایەتی (بین المللی) رەنجبەرانی گیتی» وتارێکی بلاو کردۆتەوە و پاش باسێکی مێژوویی پەیدابوونی ئەو رۆژە دەنووسێ :«... نەتەوەی زۆر لێکراوی ئیمە ئەو جێژنە لە هەموو رەنجبەرانی دنیا بە

تایبەتی لە خەڵکی گەورە و دۆستی نەتەوەی کورد ورێنوێنی بەشەریەتی پێشڕەو یەکەتی شورەوی پیرۆزبایی دەکات گەلانی رەنجبەری کوردستانیش ئەو رۆژە بە رۆژی یەکەتی و خەبات لە رێگای ئاشتی و دیموکراتی و حاکمیەتی نەتەوایەتی داجێژن دەگرن وە دڵنیان کە بەربەرەکانی نەتەوەکانی گێتی لە ژێر رێنوێنی یەکەتی شورەوی سەر ئەکەوێ.

بژی یەکەمی مای رۆژی دۆستایەتی و پەیوەندی گشت رەنجبەرانی جیهان

سڵاو لە نەتەوەی رەنجبەری کورد ـــ خەباتکەری رێگای ئاشتی و دیموکراتی حاکمیەتی نەتەوایەتی

سڵاو لە یەکەتی شورەوی قەڵای ئەرووخی ئاشتی و دیموکراتی و پەناگای نەتەوەکانی بێ بەشی گێتی.

سڵاو لە رەنجبەرانی ئێران و ئازەربایجان دۆستانی دراوسێ و خۆشەویستی نەتەوەی ئێمە

سڵاو لە حیزبی تودەی ئێران، فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ئەحزابی براو دۆستی ئێمە.

بژی ئاشتی لە ناو میللەتان ئامانجی بەرزی بەشەریەتی پێشرەو!»

پارچەیەکی ئەدەبی جوانیش بە ناوی« بەرەو رووناکی» لە ژمارەیەکەمی کوردستاندا چاپکراوە. لەلاپەرەی دووەمدا نووسراوە : « قیمەتی لەشار دوو قران و لە دێ قرانێکە» ـــ یەک شەمو ٢٥ی اوریل»

رۆژنامەی کوردستان ٥ ژمارەی لێ دەردەچێ. ژمارە پێنج ناگاتە دەستی خوێنەرانی کورد لە رێگادا دەگیرێ. پۆلیس چاپخانەکەش لە تەورێز دەدۆزێتەوەو ئیتر تا ساڵی ١٩٥٨هیچ چەشنە بڵاوکەرەوەیەک بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بڵاو ناکرێتەوە.

# قۆناخی تازە لەتێکۆشانی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا

دوای گرتنی رۆژنامەی کوردستان و دۆزینەوەی چاپخانەکە، هێندێکی دیکەش لە ئەندامانی حیزب دەکەونە بەر پەلاماری پۆلیس و دەگیرێن. لە سالی ١٩٥٤غەنی بلوریان دەتێرن بۆسنە ولەوێ بەداوی پۆلیسەوە دەبێ ودەگیرێ و پاش بینەوبەرو دادگایی کردن بە ٢ سال مەحکوم دەکرێ. نێترئەندامانی کومیتەی کوردستان تەنیا دوو کەسیان دەمێنێ. غەنی بلوریان و کەریمی وەیسی دەکەونە بەندیخانەوە، رەحیمی سولتانیان خۆی تەئمین دەکاتەوە و دەچێتەوە سەر کاری خۆی واز لە تێکۆشانی سیاسی دێنێ، دەمێننەوە عەزیزی یوسفی و عبداللەئیسحاقی و رەحمانی قاسملوش وەک کادری حیزبی تودە و بەرپرسی کومیتەی مەهاباد.

بەهاری سالی١٩٥٥دەگەرێنەوە کوردستان و لە گەل چەند کادرێکی دیکە کەلە دێهات دەسوورانەوە کۆبوونەوەیەک پێک دێنن و دێنە سەر ئەو باوەرە کە لە گەل رێکخراوی حیزبی تودە پێوەندی بپچرێنن و سەر بەخۆ خەبات درێژە پێبدەن. لەم کۆبوونەوە یەدا کە نە پێرەو و پرۆگرامێکی حیزبی لە گۆرێدا دەبێ و نە بەیاننامە و راگەیەندراوێک لە سەر ئەم کۆبوونەوەیە بلاودەکرێتەوە، ناوی دەنێن( کۆنفرانسی حیزبی) لە بەر ئەوەی کە سێ کەسیش لە دامەزرێنەرانی کومیتەی مەهاباد ئامادە نین، هیچ رێبەرایەتیەک و کومیتەیەکی تازەش هەلنابژێردرێ. رەحمانی قاسملوو پێشنیاردەکات کە لە گەل عبداللەئیسحاقی بچنە ئوروپا و لە گەل رێبەرانی حیزبی تودەی دانیشتووی ئوروپا پێوەندی بگرن. لە سەر ئەو پێشنیارە با بزانین دوکتۆر قاسملو خۆی دەلێ چی:« ... بۆیە ئێمە ئەو دەم کۆبوونەوە یەکمان پێکهێنا کە لە وانەی ئێستا لەو جەمعەدا هەن کاک «عبدالله عزەتپور» و ئەمنی تێدا بەشدار بووین. ئەو کۆبوونەوەیە کە پاشان ناومان نا« کۆنفرانسی یەکەمی حیزب» لە گوندی «کەوتەر»ی مەنگورانی مەهاباد بە نهێنی پێکهات. لە وێ دا ئێمە بریارماندا لە گەل حیزبی تودە قەتعی رابیتە بکەین و حیزبی دێموکرات بۆ خۆی سەر بەخۆ

فەعالیەتی خۆی بکا. چونکە هەم ئەزمرمان ئەوە بوو حیزبی تودە لە سەرمەسەلەی مصدق و لە سەر کودیتای ۲۸ی مرداد چەوت رۆیشتوە، هەم ئەزمرمان ئەوە بوو کە پۆلیس زەدە بوە و هەر تەماسێک لە گەڵ حیزبی تودە لە تاران بگیرێ نەتیجەی ئەو دەبێ دە گیری پۆلیس بکەوین. ئەوە بوو کە قەتعی رابیتەمان کرد لەو وەختەدا ئیعلانمان کرد کە حیزبی دیموکرات خۆی سەر بەخۆ فەعالیەت دەکا، بەشدارانی کۆنفرانسی یەکەم ئەوەی لە بیرم بێ غەیری خۆم و کاک عبداللەعزەتپور، بریتی بوون لە عزیزیوسفی، عبدالله اسحاقی، اسعدخدایاری، هاشم اقل الطلاب(قادرشەریف) پێم وایە هەموومان حەوت هەشت کەس زیاتر نەبووین. ئێمە ئەو وەختە لە بەر ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بوو تەماسمان لە گەڵ حیزبی تودە هەبوو،( دوکتورقاسملوناڵێ کادرورێکخراوی حیزبی تودە بووین. د) بیرو باوەڕی تودەییمان تێدا زۆ بە هێز بوو، بۆیە پێمان وابو ئەو تەشکیلاتەی حیزبی تودە کەلە نێو خۆی ولاتدا فەعالیەت دەکا، چەوت رۆیشتوە. بەلام ئەوانی دەرەوە وەک «رادمنش» و «اسکندری» و ئەوانی دیکە باشترن. لە سەر ئەو ئەساسە کومیتەی کوردستان بریاریدا کە ئێمە لە دەرەوە پێوەندی یان لە گەڵ بگرین و من بۆ بەرێوەبردنی ئەو مەئموریەتە چوومە عیراق و لە وێڕا چوومە دەرەوە. لە دەرەوە پێوەندیم گرت هەم لە گەڵ حیزبی تودە و هەم لە گەڵ سۆڤیەتی یەکان. لەو تەماسەدا کە دەگەڕێتەوە سالی ۱۳۳٤یانی ۲٤ساڵ لەوە پێش و بە دوور و درێژی قسەم لە گەڵ کردن ئەوان گوتیان: بەڵێ داخوازەکانتان راستە و رەوایە و جێ بەجێ یان دەکەین، تۆ بگەڕێوە داخلی ولات و بە هاورێ یانیش بڵێ. نمایندەی حیزبی تودە «رادمنش» بوو.(٦)* (دوکتورقاسملو ناڵێ: داخوازیەکانیان چبوون کەوابەراست ورەوایان زانیون وچەندمیان جێبەجێ کردوون) . ن

لە کۆبوونەوەی ناوبراودا هەر چەندە بە قسەی دوکتور قاسملو بڕیاردەدەن کە(قەتعی رابیتە لە گەڵ حیزبی تودە)بکەن و بە ناوی حیزبی دیموکراتی بێ پێڕەو

---

یا مەسەلەی ئەم کۆبوونەوەیە کە ناویان ناوە کۆنفرانسی یەکەم پتر شی بکەینەوە: دوکتور قاسملو دەڵێ: « کۆبوونەوە لە(کەوتەر) بوە و حەوت هەشت کەس زیاتر نەبوون.. » بڕیارماندا لە گەڵ حیزبی تودە قەتعی رابیتەی تەشکیلاتی بکەین.حیزبی دیموکرات بۆخۆی سەر بەخۆ فەعالیەتی خۆی بکا. بەلام هەرچەند گۆیا(بڕیاریان داوەلەگەڵ حیزبی

و پرۆگرام سەر بەخۆ کار بکەن، بەڵام رەحمانی قاسملو پێشنیاردەکا لەگەڵ عبداللەئیسحاقی بچنە ئوروپا و لە گەڵ بەشی ئوروپای رێبەرایەتی حیزبی تودە پێوەندی بگرن. لە ئوروپا عبداللەئیسحاقی و قاسملو نێوانیان تێکدەچێ ودوای سێ مانگ ئیسحاقی بەدڵگرانی دەگەڕێتەوە.
رەحمانی قاسملو وەک خۆی باس دەکا دوای ماوەیەک لە سەر راسپاردەو رێنوێنی رێبەرانی حیزبی تودە دەگەڕێتەوە بۆ تاران و سەر لەنوێ هەر لە سەر خەت و

---

تودەقەتعی رابیتەی تەشکیلاتی بکەن.) بڕیاردەدەن لەدەرەوە لەگەڵ حیزبی تودە پێوەندی بگرن گۆیا ئەوانەی وڵاتیان بەجێهێشتوەو چوونەدەرەوە، لە ئەوانی ژوورەوە باشترن.!!
مەلاعەولای حەیاکی کە چ ئاگای لەو کۆبوونەوەیە نەبوە. لە حکایەتەکەیدا بە ناوی(نیوسەدەتێکۆشان) قسەی دوکتورقاسملو بە بەڵگەنازانێ و بۆرازاندنەوەی حکایەتەکەی پەنابۆ( بیستنی قسەو قسەڵۆکی سەرزارۆزمانان دەباو
کۆبوونەوە دەکاتە کۆنفرانس و جێگاکەشی دەکاتە( ناوچەی سەری مەیدان لەنێزیک مەهاباد) و (بەشدارانی کۆبوونەوە ) دەکاتە ( ٢٠تا٢٥کەس) و دەنووسێ: «... پێک هێنانی کۆنفرانسی یەکەم لەو هەل و مەرجەدا هەنگاوێکی دیموکراتی و شۆڕشگێڕانە بوە کە توانیویەتی بەشێک لە گیروگرفتەکانی ئەودەمەی حیزب بەباشی چارەسەربکا.» ١
داخوا ئەندامانی حیزب دەتوانن پرسیاربکەن وبڵێن :« کام گیروگرفتی ئەودەمی حیزب بەباشی چارەسەرکران وچۆن لەخۆت رادەبینی کەدوکتۆرقاسملو وەدرۆ بخەیەوە کەخۆی بەشداربوە، ماستا؟!
لەحیزبی دیموکراتدا بۆتەباوەرکەسێکی بوو بەسکرتێر دەبێ بەگێڕانەوەی حکایەتێک بەناوی( مێژووی حیزبی دیموکرات)لێهاتوویی خۆی بەئەندامانی حیزب نیشان بداو مێژووی خەباتی زەحمەتکێشانی کوردیش بەئیشتیای خۆی بشێوێنێ.
.کاک جەلیلی گادانیش کە سەردەمێک لەسەرکورسی سکرتێری پاڵی دابوە، بۆئەوەی لەسکرتێرەکانی دیکە وەپاش نەکەوێ، لەبەرگی یەکەمی«کورتەمێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بەناوی( ٥٠ ساڵ خەبات) کەبێ تاریخە لەلاپەڕی ٩٨دا دەنووسێ :
«... لەهاوینی ١٣٢٤ بەهاوکاری بێ دریغی کاک سەیدرەسوڵی دیهقان لەکێوی قەڵاتەڕەشی پشتی گوندی سەیداوای بابی گەورە لە ناوچەی پیرانشار بەبەشداری پازدە- بیست کەس کۆنفرانسی یەکەم پێک دێ. بەپێی ئەم یادداشتە کورتەی لەشەهید سەیدرسوڵ بەجێ ماوە(کەدیارنیەکام یادداشتە و هیچ ئاماژەی بۆ ناکات) لە بەشداران ئەو چەند کەسەی ژێرەوە بۆئەو ناسراون.
١ - کاک رەحمانی قاسملو بەنێوی نهێنی حەسەن

ڕێبازی جاران لە گەڵ عەزیزی یوسفی ورەحمەتی شەریعەتی ودوکتورعەلی مەولەوی بە ناوی کومیتەی کوردستان خەریکی تێکۆشان دەبێ. ئەمجارەش پێوەندی لە گەڵ حیزبی تودە بەردەوامە. بەڵام لە گەڵ باوەر پێکراوانی «ڕادمنش».

لەم بەینەدا قاسملو بۆ پێوەندی لە گەڵ «عەلی متقی» یەکێ لە بەرپرسانی نەگیراوی تەشکیلاتی تارانی حیزبی تودە دەچێتە سەرشوێنێ دیار یکراو.(چێ ژوان). لەوێ پێوە دەبێ و دەگیرێ. پێوەندی لە گەڵ «عەلی متقی» دەبێ بەراسپاردەی « رادمنش » بوو بێ. چونکە کیانوری لەلاپەری ۳٥۱ی بیرەوەری یەکانیدا دەڵێ:« عەلی متقی لەگەڵ خسرووروزبە وحبیب سابیت ڕێکخراوی حیزبیان

---

۲ – کاک ئەسعەدی خودایاری بە نێوی نهێنی مەلاعەلی
۳ – سەید عبداللە اسحاقی ( چونە ناوی نهێنی ئەم دوو کەسەی نەزانیوە.»
٤ – کاک عەزیزی یوسفی

کاک جەلیل بۆئەوەی نووسینەکەی خۆی لەتووسینی نووسکرتێرەکەی دیکە شارەزاتر نیشان بدات، هێندێ تام وچێژی تایبەتی دەدا بەنووسنەکەی دوکتورقاسملو ی شەهید کە خۆی بەشداری کۆبوونەوەکە بوە. گەلاڵەی بەرنامەی نوێی حیزبیشی لێ زیاد دەکاو دەنووسێ: « ...لەم کۆنفرانسەدا کە سەید رەسول بەکۆبوونەوەی ناودەبا هێندێک بریاری گرنگ دەدرێ»

۱ – گەلاڵەی پێشنیاری نوێی بەرنامەی حیزب پەسندەکرێ وبۆیەکەم جار وشەی ئێران لەناوی حیزب زیاد دەکرێ ودەبێتە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.» ( بۆئاگاداری کاک جەلیلی گادانی وشەی «ئێران»سالی ۱۹۷۱لەکۆنفرانسی سێیەم لەنێو بەرانتێزدا لەناوی حیزب زیادکرا )پێداچوونەوە.

۲ – چەندکەس لەبەشدارانی کۆنفرانس و چەند غایب وەک ئەندامی ڕێبەری دیاری دەکرێن و کارەکانی حیزبی بە نێو خۆیان وکادرەکان دا بەش دەکەن.

۳ ــ بڕیاردرا لەو کات را پێوەندی راستەوخۆ بەشێوەی پێشوو بەحیزبی تودەوە نەمێنێ »

ئێستا ئەومەسەلەیە جێگای سەرنجە کە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەبێ نووسینی کام سکرتێر بەراست بزانن و مێژووی حیزبەکەیان بەگوێرەی نووسینی کام سکرتێر راست کەنەوە ولەمێژووی خویناوی حیزبەکەیان شارەزابن.؟ دخوا دوکتور قاسملو کە خۆی بەشدار بوە راست دەکا، یان دوو سکرتێرەکەی دیکە ؟» پێداچوونەوە.

بەرێوە دەبرد، لە گەڵ رادمنش بەرپرسی لقی تەشکیلاتی ئێران لە دەرەوە لە پێوەندیدا بوون.» (٧) بۆیە ئەم بڕوایە بە هێز دەبێ چونکە قاسملو لەکن راد مەنش گەراوەتەوە ئێران ودەبێ لەگەڵ نوێنەری ئەو پێوەندی گرتبێ.

قاسملو دەگیرێ و پاش ١٥رۆژ دوای ئەوەی بۆ فریودانی ساواک بەڵێنی هاوکاری دەدا، ئازاد دەکرێ. ئازادبوونی قاسملو دردۆنگی دەخاتە نێوبرادەرانی و بڕیاردەدەن لە ئێران وەدەر کەوێ و بچێتەوە ئورووپا. پارمەتی دەدەن خێزانیشی کە لە تاران بوو، بۆی دەگەیێننە کوردستان و دەچێتە کوردستانی عیراق و بە یارمەتی برادەرانی پارتی پاسپۆرتێکیش بەناوی« مدیحەکاظم »بۆ خێزانی پەیدا دەکاودەچێتەوە پراک لەرێکخراوی دەرەوەی حیزبی تودەدا کاردەکا و ئیتر هیچ پێوەندییکی لە گەڵ کوردستان نامێنێ.

بەلام با بزانین قاسملو خۆی دەڵێ چی؟: «... بەهەرحاڵ من گەرامەوە.«کیانوری» و هەموو ئەوانی دیکەی هەیئەتی ئیجرایی حیزبی تودە کە لە نێو خۆی ولات بوون چوو بوونە دەرێ و ئەوەی مابۆوە وەک «یزدی »و «علوی» گیرابوون. لە نەتیجەدا بڕیارماندا بۆ خۆمان فەعالیەتی خۆمان درێژە پێبدەین. لە جەرەیانی ئەم فەعالیتەدا، بۆ یەکەم جارلە عیراق پێوەندیمان لە گەڵ حیزبی شیوعی عیراق گرت، کە ئەو وەختە سێ چوار دەستەش بووو دەگەڵ هەرسێ چوار دەستەکە پێوەندیمان گرت. دەگەڵ پارتی پێوەندیمان گرت کە ئەویش دوو دەستە بوو ،بەم چەشنە و بەرە بەرە دەگەڵ رێکخراوەکانی کوردستانی عیراق ئاشنا بووین. ئەو بەرێوەبەریە بەو شێوەیە مابوو تاساڵی ١٣٣٧ کە بەداخەوە کاک عەزیز یوسفی و پاشان لە ساڵی دوایی کاک رەحمەتی شەریعەتی و غەنی بلوریان کە ئەویش ئەندامی کومیتەی کوردستان بوو گیران.( بەداخەوە دوکتورقاسملو هێندەي ئاگا لە تێکۆشان و بارو دۆخی حیزب نیە و کورتە مێژووی حیزب بۆ کادرەکانی باس دەکا. غەنی بلوریان ساڵی ١٣٣٧ تازە لە زیندان ئازاد دەبوو، نەک لەو ساڵەدا گیرا ـ د) و بەدوای ئەواندا تەشکیلاتی حیزب لێک هەڵوەشا. منیش کە ماوەیەک پێشتر چو بوومەوە دەرێ لە وێ مامەوە. بەمجۆرە ئەو رێبەرایەتیەش

تێکچوو ئیدامەکاری یەکە نەما.» (٨)

بە پێچەوانەی نووسینی دوکتورقاسملوو دوای رۆیشتنی ئەو بۆ ئوروپا تێکۆشانی حیزبی دیموکرات بەردەوام دەبێ و لە پاش سەفەری ئەو بە یەکجاری لە گەڵ حیزبی تودەی ئێران پێوەندی دەپچڕێ. ئەندامانی کومیتەی کوردستان عەزیزی یوسفی و رەحمەتی شەریعەتی و دوکتور مەولەوی لە تاران و عبداللەئیسحاقی لە کوردستان غەنی بلوریانیش دوای ٢ساڵ لە زیندان ئازاد دەبێ و لە مەهاباد لە ژێر چاوە دێری پۆلیس دا دادەبێ. هێندێ لە کادرەکانی حیزبی وەک جەلیلی گادان، قاسمی سولتانیان، هاشمی اقل الطلاب و هاشمی جەلالی و سمایلی قاسملو ئەسعەدی خودایاری لە ناوچەی موکریان لە دێهات دەسووڕێنەوە بێ ئەوەی بەرنامەی تەبلیغات و دروشم و تاکتیکی خەباتیان روون بێ و بزانن چدەکەن و ستراتیژی و دروشم و تاکتیکی حیزب چی یە.

## پەیمانی بەغدا وئاکامی بۆگەلی کورد

کۆدیتای ١٩ی ئاوگوستی ١٩٥٣کە راستەوخۆ بە نەخشە و یارمەتی سازمانی جاسوسی ئەمریکا هاتبوە کایەوە، نەک هەر حکوومەتی میللی مصدق دەرووخێنێ و رەشترین حکوومەتی دیکتاتوری نیزامی لە ئێراندا دێنێتە سەرکار، بەڵکوو هەموو چەشنە بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانە و دیموکراتیش لە وڵاتدا بە توندی سەرکوت دەکات. لە کوردستان بە سەدان کەسی تێکۆشەر و ئەندامی حیزب دەگیرێن و دەخرێنە بەندیخانەوە. حکوومەتی ئەمریکا بە ئاگاداری لە ریشەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی و دژی ئیمپریالیستی گەلانی ئێران، تەنیا بە هێنانە سەرکاری حکوومەتێکی دەستکرد و گوێ لەمست دڵی ئاو ناخواتەوە، دەبوایە پەیمانێکی نیزامی بە هاوبەشی ئێران و تورکیا و عیراق لە رۆژهەڵاتی نێوە راست دا بێنێتە کایەوە. بە نەخشە و هاندانی ئەمریکا ١٩٥٥/١١/٢٤ پەیمانێکی نیزامی بە ناوی (پەیمانی بەغدا) لە نێوانی ئێران و عیراق و تورکیا و ئینگلستان

دەبەسترێ ، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش وەک چاودێرلە لاوە بەشداری دەکات.دوایشۆرشی عیراق ورووخانی ڕێژیمی پاشایەتی لە عیراق ئەم پەیمانە بە ناوی سەنتۆ ناودێر دەکرێ. هەرچەندە ئە ویەیمانە لە جەوهەردا بۆ گەمارۆدانی سۆڤێتی پێشوو و وڵاتانی ئۆروپای رۆژهەلات سازکرا بوو. بەلام لە راستیدا ئامانجی بنەرەتی پەیمانی بەغدا لێدان و سەرکوتکردنی هەموو جەشنە بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازانەی گەلانی ناوچە بوو بە خەباتی گەلی کوردیشەوە. بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوەی کورد لە سێ وڵاتی ئەندامی پەیمانی سەنتۆدا، هەمیشە بۆ حکومەتە دیکتاتۆرەکانی ئێران و تورکیا و عیراق جێگای مەترسی بۆە و هەمیشە بۆ فریودان و سەرکوتکردنی لە هاوکاریدا بوون.

بە دوای بەستنی پەیمانی(بەغدادا) دایە کە رۆژهەلاتی کوردستان دەبێتە پێگەی نیزامی هاوبەشی ئێران و ئەمریکا لە ناوچەی لاجانی مامەشان پێگەی نیزامی جەڵدیان دەبێتە ناوەندی راونان و کوشتار و بەندیخانەی ئازادیخوازانی کورد و سەرکوتکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردستان.

هەوەڵین هەنگاوی حکوومەتی کۆنە پەرستی ئێران. پاش بەستنی پەیمانی بەغدا دژی گەلی کورد بریتی دەبێ لە پەلاماردانانی دوو بارەی جوانرۆییەکان لە ناوچەی کرماشان. وەک دەزانین ساڵی ١٩٤٨دەوڵەتی ئێران جارێکی دیکەش لەشکری نارد بوە سەر عەشیرەتی جوانرۆ کە چەکیان بکەن. پاش شەرێکی توند و بۆمباراتی ناوچە کە جوانرۆیی یەکان پاشە کشەیان کرد بوو. هێندێ چەکی کۆنە قورازەیەن دابوونەوە. بەلام ئەرتەش نەیتوانیبوو تەواو بەردەستیان بکا و بە سەریاندا زاڵ بێت. پاش بەستنی پەیمانی بەغدا ئەمجارە دەوڵەتی ئێران کە پشتی بە ئەمریکا و بە حکوومەتی نوری سەعید قایم بوو. لەشکرێکی زۆر دەنێرێتە سەر جوانرۆییەکان. یەکێ لە براکانی شا لە گەڵ ئەفسەرێکی ئەمریکایی بە سەر هرووژمی لەشکری ئێراندا چاوە دێری دەکات. فرۆکەکانی ئێران لە کرماشەنەوە هەڵدەستن و جوانرۆ بۆمباران دەکەن.

گۆڤاری ( MEJDU NARODNAYA JIZIN ) «ژیانی ناونەتەوەیی»

چاپی مۆسکۆ نووسیبووی:

«... له بەرزاییەکانی زنجیرە چیاکانی زاگروس، له هەرێمی کرماشان عەشیرەتێکی کوردی «جوانرۆ» دەژی. کوردەکان خەڵکێکی هەرە قەدیم و رزگاریخوازن. له رابردوودا عەشیرە تەکوردەکان له ئاسیای رۆژئاوادا، خاکێکی زۆریان به دەستەوە بوە کە بە کوردستان ناسراوە. ساڵی(١٥١٤)زایینی بەشێکی زۆری ئەم خاکە تێکە لاوی عوسمانی کرا. بەشێکیشی تێکەڵ کر بە ئێران. دوای شەری یەکەمی دنیاگر(کوردستان)ئەم خاکەی کە کوردەکانی تێدا دەژین له نێوان تورکیا و ئێران و عێراق و سوریادا بەشکرا. بە درێژایی سەدان ساڵ کوردەکان له کەمایەتی نەتەوایەتیدا بوون و بەرژەوەندی ژیانیان خراوەتە ژێر پێوە. له ئەنجامدا رۆژ بە رۆژ پتر نارازی دەبن. کوردەکان هەوڵ دەدەن لانی کەمی مافی نەتەوایەتی خۆیان وەدەست بێنن. عەشیرەتی جوانرۆ کە ساڵەهای ساڵ بە هێمنی ژیاوە، دوای شەری دووەمی دنیاگر کە جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی گەلانی رۆژهەلات پەرەی گرت، عەشیرەتی جوانرۆش جۆرە خود موختارێکیان وەدەست هێنا. هەر وەک رۆژنامەی(اطلاعات)دەنووسێ: عەشیرەتی جوانرۆ خۆی بە سەربەخۆ دادەنا وە نەیدەهێشت ژاندارم و لەشکری حکوومەتی بچێتە خاکی جوانرۆوە، ئەگەر پەیمانی بەغدا له رۆژهەلاتی نیزیک و ناوەراست دا ساز نەکرا بایە. ئەم عەشیرەتە له مەو بە دواش هەر ئاوا دەژیا. عەشیرەتی جوانرۆ بۆ رێکخەرەکانی پەیمانی بەغدا ببوە بەرهەڵست، چونکە له سنوورەکانی ئێران و عێراق له باری ستراتیژی یەوە مەڵبەندێکی زۆر گرنگی بە دەستەوەیە.

پێنجی مانگی فیورالی ١٩٥٦ دەوڵەتی ئێران بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ( جەم) هروژمێکی نیزامی بۆ سەر عەشیرەتی جوانرۆ دەست پێکرد. پاش بۆمباران و سووتاندن و وێرانکردنی دێهاتی جوانرۆییەکان، بە گوێرەی سیایی و ئەژماری رەسمی ستادی لەشکری ئێران نیزیکەی ١٠٠ کەس له جوانرۆییەکان کوژراون. (٢٠٠) کەس بریندار بوون. (١٢٠٠) کەس پیرە پیاو و ژن و منداڵ بە دیل گیراون» .(٩ )

حکومەتی ئێران بە هۆی پەلاماردانی عەشیرەتی جوانڕۆوە دەسەڵاتی بە سەر ئەم مەڵبەندەی کوردستانیشدا جێگیر کرد. گۆڤاری ئیتلاعاتی حەفتەیی نووسیبووی:«... پاش چواردە ساڵ ناوچەیەکی گەورەی گەلێک گرنگ تێکەڵاوی ئێران گرایەوە. لە ماوەی ئەم چواردە ساڵەدا دەوڵەتی ئێران چەند جارلەشکری نارده سەر ئەم ناوچەیە و شەڕی خوێناوی کرد، تەنانەت لە تارانەوە هێزی هەواییش بۆ یاریدەی لەشکر ناردرا. بەڵام نەتیجەی نەبوو.»(١٠)

هەنگاوێکی دیکەی حکومەتی شای ئێران بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی دیکتاتۆری دامەزرانی ساواک(سازمان امنیت واطلاعات کشور) بوو کە بە ڕێنوێنی و سەرۆکایەتی سازمانی جاسوسی ئەمریکا(سیا) کەوتە کار و یەکێ لە ڕەشترین ڕێکخراوی ڕەشە کوژی و ئەشکنجە و ئازار و درندەی جیهان بوو. لە گەڵ وەکار کەوتنی ساواک مەیدانی تێکۆشانی هێزەکانی ئازادیخوازانی ئێران بە جارێک وە تەنگ هەلات، لە کوردستان ئەندام و لایەنگرانی حیزبی دیموکرات و نیشتمانپەروەرانی شار و دێهات دەکەونە ژێر چاوەدێری و ڕاونانەوە. بە کردەوە جگە لە سووڕانەوەی چەند کادرێک لە گوندەکان و پێوەندی یان لە گەڵ ئەندامانی حیزبی هیچ جۆرە چالاکی و تێکۆشانێکی بەر چاوی حیزبی دیموکرات لە ناوچەدا خۆ نانوێنێ.

عبداللە ئیسحاقی وەک یەکێک لە ئەندامانی کومیتەی سەر کردایەتی دوای تێکچوونی لە گەڵ قاسملو لە ئوروپا دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و لە نێوان دوو بەشی کوردستاندا لە هاتوو چۆو سوڕانەوەدا دادەبێ. جار و بار لە ڕێگای دۆست و برادەری قاچاغچی نامە بۆ مەهاباد دەنێرێ و لەو ڕێگایە شەوە لە گەڵ برادەرانی تارانیش لە پێوەندی دادەبێ. لە مەهاباد کومیتەیەک بۆ پێوەندی لە گەڵ ئەندامانی شار و کادرەکانی ناوچە و عبداللەئیسحاقی لە تێکۆشاندا دەبێ. لەو ماوەیەدا هیچ نووسراوە و بەیاننامەی حیزبی بڵاو ناکرێنەوە.

# شۆرشی چواردەی گەلاوێژی عیراق و تەئسیری لە سەر کوردستان

شۆرشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ی عیراق ئەو دەم بەگەورەترین رووداوی ناوچە دەژمێردرا. ولاتانی رۆژ ئاوا و حکوومەتە دیکتاتۆرەکانی سەر بە پەیمانی سەنتۆی خستە دلە راوکە و ترسەوە. بزووتنەوەی رزگاریخوازی ناوچەی خستە جم و جۆل و بزۆاندانەوە. بە تایبەت بە رەسمی ناسینی کورد بەشەریکی عەرەب لە کۆماری عیراقدا، بلاو بوونەوەی دەنگی شۆرشگێری کورد لە رادیۆ بەغدا، راستە وخۆ کار دەکاتە سەر کوردەکانی رۆژ هەلاتی کوردستان و تینی تێکۆشانی زیاتریان وەبەر دەنێ. حکوومەتی ئێران لە لایەک لە ناوچەکانی سەر سنووری عیراق دەکەوێتە خۆ کۆ کردنەوە و لە لایەکی تریش پتر لە جاران ناوچە کورد نشین و کوردەکان دەخاتە ژێر چاوە دێری توندەوە. تەنانەت هێندێ لە ئەفسەرانی ئەرتەش دەست دەکەن بە راگوێستنی ژن و مندالیان بەرە و تاران و تەورێز و لە ناوچەیان دوور دەخەنەوە. دوای شۆرشی ١٤ی گەلاوێژی عیراق(١٩٥٨)، عبداللەئیسحاقی کە لە نێوانی کوردستانی عیراق و مەلبەندی مەهاباد دا لە هاتوو چوو سورانەوەدا دەبێ، لە لایەن کومیتەی سەرکردایەتیەوە داوای لێدەکەن بگەرێتەوە بۆ کوردستان ولە ناوچەی سنە تێکۆشانی خۆی درێژە پێبدات. بەلام لە جیاتی گەرانەوە ناوبراو بەیاننامەیەک بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بلاودە کاتەوە کە رێبازی حیزب و رادەی بۆچوون و تێگەیشتنی سیاسی نووسەرلەم بەیاننامە یەدا رەنگ دەدەنەوە. پاشان بەیاننامەکە بە ناوی(نامەیەک لە کوردستانی ئێرانەوە)دەنێری بۆ گۆڤاری «هیوا» لە بەغداو لە ژێر ئەم ناو و نیشانەدا بلاو دەکرێتەوە:

« نامەیەک لە کوردستانی ئێرانەوە»... تیشکی رۆژی رزگاری گەلان وادەمێکە رووناکتر و بە تینترلە پێشوو خۆ دەنوێنێ. بە درێژی مێژووی ژیانی ئینسان و بە

پێی یاسای تەبیعەتی کۆمەڵایەتی چینەکان و نەتەوەکانی عالەم بە دایم هەردەم لە خەبات و تێکۆشاندا بوون. بەشێک لەو تەقەلایە بۆ داگیر کەری و دەسەلات بە سەر وڵات و چەوسانەوەی بەرهەمی شان و پیلی نەتەوەکانی دیل و یەخسیربوە، بەشی تری ئەو خەباتە کە دایم کەوتوتە بەرامبەری تەقەلای داگیرکەری تێکۆشانی نەتەوەکانی داماو و ژێر چەپۆک بۆ رامالینی توقی ئەسیری و بەر قەراری ئازادی و ژیانێکی خۆش و بەختیار بوە. هەژاری و تالی ژیان و زۆر و زۆرداری داگیرکەران لە سەر نەتەوەکانی ژێر چەپۆک تێکۆشان و بزووتنەوەی ئەوانی رۆژ بە رۆژ رازاوە تر و بەرینتر کردوە.

وابە قەد نیو قەرن دەبێ کە بەرینی ئەو تێکۆشانە دەوری گۆراندوە وە بە بۆنەی بلاو بوونەوە و پەرەی بیرو باوەری ئینسان دۆستانە و مەرام و ئامانجی ئازادیخوازانە لە عالەم دا ئەو نەتەوانەی کە رزگار بوون و یان لە سەر پلەی دوایی رزگار بوونن پاش ئەوەی کە سەربەست بوون و دەسەلاتیان بە دەستەوە گرت ئیتر بێجگە لە وەی هێزی داگیرکەری لە ناو ئەو نەتەوانەدا ناتوانن خۆی دەرخات بەلکوو بەشی زۆری ئەو نەتەوە رزگار بوانە دەبنە پشت و پەنای نەتەوەکانی یەخسیر و زۆر لێکراو و بە پێی توانایی و هێزیان نەتەوەکانی دیل و یەخسیر یاریدە و بە وبۆنەوە بۆ پساندنی زنجیری دیلی هانیان دەدەن.

لە پاش روخانی دام و دەزگای ئیمپراتوریەتی روسی کۆن و هاتنە سەر کاری هێز و توانای میللەت دیمان بەچ جورێک دەوڵەتی سۆڤێت (شوروی)دەستی داگیرکەری ئیمپراتوری روسیای لە ئێران بڕیوە و چاوی لە تەواوی بنکە و خانو بەرە و شیرکەت و رێگای ئاسن و قەرزی داگیرکەرانەی ئیمپراتوری روسی کۆن پۆشی و بانگی دۆستایەتی خۆی راگەیاند کە وا ئێستاش هەر بەر دەوامە.

وا ئێستا نەتەوەکانی رزگار بووی عیراق و میسر و زۆر نەتەوەی تریش یاریدەی گەلی تێکۆشەر و دەس بەچەکی جەزائیر دەدەن کە قارەمانانە بۆ رزگاری و سەر بەخۆیی نیشتمانیان قۆڵیان لە ئیستعمارگەرانی فەرانسە هەڵمالیوە و دەخوازن بە سەر بەستی بژین. وە یان لە کاتێکدا کە داگیرکەرانی ئینگلیز و

فەرانسە لە گەڵ ئیسرائیل هار کراوی رۆژ هەڵاتی ناوە راستی ئیمپریالیزم کە هرۆژمی داگیر کەرانەی خۆیان بردە سەر نەتەوەی رزگا بوو و ئازادیخوازی میسر دیمان چۆن نەتەوەکانی چین و سۆڤیەت پیاوانە لە گەڵ نەتەوەکانی تر وەکوو سوریا و هیند و ئەندونزیا و... دەنگی پشتیوانی خۆیان لە بەرهەڵستی نەتەوەی میسر بە ئیمپریالیزم و هێرش بەران راگەیاند. ئەو کاتە دیمان هەر پاش هەرەشەی سۆڤیەت و دانی چەند سەعات وچان دوایی پێدانی هێرش و کوشت و کوشتاری نەتەوەی نەبەزی میسر کە زۆر ئازایانە بەرهەڵستی کردنی هێرش بەران شەڕی داگیر کەرانەیان وەستاند. وە هرۆژم بەرەگان بە هەموو هەڕەشە و گوڕەشەکانیانەوە لە خۆیان نووسان وە بە دەستی بەتاڵ و روو رەشی کشانەوە ئەو دەمە نەتەوەی ئازا و نەبەزی میسریش لەو کارەساتەدا سەر بەرز و پیرۆز ئالای حەقی حاکمیەتی خۆی لە سەر دەراوی کانالی سوئیز چەقاند. بێگومان پشتیوانیەکەی سۆڤیەت و چین لە گەڵ نەتەوەکانی عالەم یەکێک لە هۆیە کانی هەرە گەورەی پیرۆزی میسر لە بەرهەڵستەکەیدا دێتە ژمارەوە. جا کە وابوو لە ئەنجامدا بەوە دەگەین کە ئیمرۆ لە عالەمدا بەرەیەکی بەرین و بە هێز لە نەتەوەکانی رزگار بوو پێکهاتوە و لە بەرامبەر داگیرکەراندا بۆ یاریدە و هاندانی نەتەوەکانی ژێر چەپۆک ماو وەک قەڵایەکی نەرووخ راوەستاون.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە مێژووی گۆران (تحول) لەو چەند ساڵەی دواییدا ئەبینین لافاوی شۆرش و هرۆژمی رزگارکەری لە قەراخ گۆمەکانی ئەندونزیە و ڤیتنام دا ،تا کو قەراخ گۆمی میدیتەرانە و لە وێوە ئەلبان و قبرس رابگرە تا کو رۆژئاوای مەراکش و نیجیریان داگرتوە وە لە وێدا خۆی کێشاوەتە ناو جەرگی بازاری ئیمپریالیزم یانی ئەمریکای خواروو. بە کورتی قارەکانی ئاسیا و ئەفریقا تێکڕا راست بوونەوە و وا خەریکن کەلاکی پیس و بۆگەنی ئیستعمار کە دیاریی ئورووپای شارستانی بۆ خەڵکی قارەکانی ئاسیاو ئەفریقایە بە یەکجاری بنێژن.

کڵپەو بلێسەی شۆرشی رزگارکەری ئاسیا و ئەفریقا بە تایبەتی هی نەتەوەتەکانی عەرەب بە زۆربەی شۆرشی جەرگبڕ و پشت شکێنەری ئیستعمار لە

عیراق دا لەو چەند ساڵەی دواییدا کە وا ئێستاش پەیتاپەیتا پێ یەوە دەچێ تینی راستەقینە و هەست پێکراوی خۆی داوەتەخەباتی بەر دەوامی نەتەوەکەمان بۆ رزگاری و سەر بەخۆیی. زۆر بە رووناکی دەبینرێ کە تەواوی نیشتمانپەروەران و تێکۆشەرانی کورد هەستیان بەو تێن و تایە کردوە.

شۆرشی پیرۆز و سەرکەوتووی عیراق کە لاپەری رەشی دەور و زەمانی فیصل و عبدالئیلاه داداشی ئاغاکانی قەراخ چۆمی تایمز و لەندەن و نوری سەعید خائینی ژمارە یەکی رۆژهەڵاتی ناوەراستی ئیستعماری دراند وە ئاڵای بەرزو پڕ شانازی جمهوری عیراقی لە سەر کۆشکی شاهی کە مۆلگەی کۆبوونەوەکانی پەیمانی کۆنی بەغدا بوو داکوتا. وە بەشێک لە نەتەوە پچرپچراوەکەمان کە کەوتۆتە عیراقەوە لە ژێر سێبەری ئاڵای جمهوری عیراقدا هێندێ مافی نەتەوایەتی ستاند وە جمهوری لە قانونی ئەساسی نەتەوەی عەرەب لە وڵاتی عیراقدا بە شەریک دەزانێ ،ئەو کردەوە و کردەوەکانی تری ناسیۆنالیسمی عەرەب دەری دەخا کە ناسیۆنالیسمی عەرەب کەوتۆتە سەر ناسینی مافی کورد و پارێدەی نەتەوەی کورد بۆ رزگاری و سەر بەخۆیی کورد و کوردستان. دیارە کاربەدەستان و بەرێوە بەرەکانی ناسیۆنالیزمی عەرەب لە گرتنە بەری پارێدەی نەتەوەی کورد بۆ رزگاری و سەر بەخۆیی باشترین و لە بارترین رێگای سەرپانکردنەوەی ئیستعمار و نۆکەرانی ئیستعماریان هەڵبژاردوە. گرتنەبەری ئەو رێگا هەر ئەوەندە کە بە قازانجی کوردە قازانجی نەتەوەی عەرەبیشی بە بەرچاوی تێدایە. رووناکە کە نەتەوەکەمان لە هەر چوار پارچە دابچڕاوەکاندا بە چاوێکی زۆر حورمەتاویەوە دەروانێتە جوڵانەوەی نەتەوایەتی عەرەب کە واکەوتۆتە سەر باو پەیت پەیتا وڵاتەکانی عەرەب رزگار دەکات و تارمایی ئیستعمار لە رۆژ هەڵاتی ناوەراستدا دەخاتە ناو گۆمەوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر پاش روخانی تاج و تەختی فاروقی خائین بە دەستی شۆرشگێرانی هێزی میسر لە مەڕ خاوێنی ئامانجی شۆرشگێرانی و جوڵانەوەی نەتەوەی عەرەب رووناک بوە کە بنکەی هێزێکی پرتاقەتی نەتەوایەتی

ریشەی داکوتا و بە پەرەی خۆی ئیستعماری بریندار کرد و دوا برینی جەرگبڕی خۆی لە ناوەندی پەیمانی شەڕەهەلایسێنەری بەغدای کونی کرد.

دوا رۆژی بەرینی خەباتی گەلان باشتر و کاکلتر شوێن و ئامانجی ناسیونالیسمی عەرەب کە تا ئیستا هەر بە خاوێنی لە گەڵ ئامانجی نەتەوەکەماندا بەرێوە هاتوە دەر دەخا. کار بەدەستانی دەزگای دەولەتەکانی تاران و ئەنقەرە و بەغدای کون بە تایبەتی هی ئەنقەرە و تاران زوریان تەقەلا دا کە کورد لە ناو نەتەوەکانیاندا بتوێننەوە و زمان و کار و کردەوەی تایبەتی کوردایەتیان لە ناو هەلگرن. هەر بۆیەشە زۆر بە توندی بەرهەلستی زۆر داخوازی نەتەوەکەمان لە تورکیا و ئیراندا بۆ خوێندن بە زمانی کوردی دەک کە وا ئیستاش هەر بەردەوامە لە کاتێکدا هەر لە زووە نەتەوەکەمان بە خەباتی خۆی ئەو مافەی لە دەزگای دەولەتەکانی سەر بە ئیستعماری پێشووی عیراق ئەستاندوە لە ئەنجامدا کورد لە هەر چوار پارچە داپچراوەکاندا زمان ، کردەوە، ئاکار و هونەری خۆی پاراستوە و وەک میللەتێک ماوە. نەتەوەی عەرەب زۆر بە برایەتی و دۆستایەتی لە گەڵ نەتەوە کەماندا بەرێوە دەچو بە تایبەتی ئیستە بە بونەی بوونی حکومەتێکی میللی ئەو حورمەت و برایەتیە زۆر بەهێزتر بوە. تەقەلای دەزگای دەولەتەکانی تورکیا و ئیران بۆ تواندنەوە و پەرش و بلاوکردنی نەتەوەکەمان و هەر وەها تەقەلا بۆ لە بەین بردنی مافی نەتەوایەتی میللەتی کورد گەورەترین خیانەتە بە ئامانجی دۆستایەتی نەتەوەکانی فارس و تورک لە گەڵ نەتەوەی کورد و قەت لە لایەن نەتەوەکانی تورک و فارسەوە پشتیوانی نە کراوە بەڵکوو بە دایم بیری نەتەوەکانی فارس و تورک بە پێچەوانەی تەقەلای دەزگای دەولەتەکانی سەر بە ئیمپریالیزمی تورکیا و ئیران بوە. کورد چ لە ئیران و چ لە تورکیا و عیراق و سوریا دەستی برایەتی و خەباتی یەککگرتووی خۆیان بۆ روخاندنی دام و دەزگای دەولەتەکانی سەر بە ئیمپریالیزمی ئەو ولاتانە دابوە دەستی نەتەوەکانی ئازادیخوازی فارس و تورک و عەرەبەوە. هەر وەکوو لە عیراق سوریادا ئەوبرایەتی و خەباتەمان بۆ هێنانە سەرکاری حکوومەتێکی میللی بەرچاو دەکەوێ و ئیستا

زۆر بە تینتر لە پێشوو ئەو ئەرکە کەوتۆتە سەرخەباتی نەتەوەکەمان لە ئێران و تورکیا دا کە دەبێ دەستی یەکێتی و برایەتی بداتە دەست نەتەوەکانی فارس و ئازەربایجان و تورک و ئەقەلیەتەکانی میللی ئەو وڵاتانە بۆ هێنانە سەرکاری حکوومەتێکی نیشتمانی. برینی جوقەواری نۆکەرانی ئیستعمار لە عیراق و ناسینی بەشێک لە نەتەوەکەمان بە شەریکی نەتەوەی عەرەب لە وڵاتی عیراقدا مزگێنیەکی بەرچاوە بۆ رووناکی رزگاری نەتەوەی کورد کە یەکەم گزنگی ئومێدی رەزگاری پرژاندۆتە سەر سەر کوردەواریەوە. بەو جورە زۆر بە جوانی و بە رووناکی بۆمان دەردەکەوێ کە هەل و دەورێکی زۆر لە بار و راست بۆ ئازادی و بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوەکەمان وا لە پێشمانەوەیە.

هاونیشتمانانی خۆشەویست: حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە تەواوی چینەکانی میللەت لە کرێکاران و لادێییەکان و پیشەوەران و رووناکبیران و عەشیرەتەکانی نیشتمانپەروەر دەگێڕێتەوە زۆر لە پێشوو زیاتر کۆزیلەی خۆیان لە دەورەی ناوەند و ئالا هەڵگری نەتەوەکەمان حیزبی دیموکراتی کوردستان پتەو تر و نزیکتر کەنەوە. حیزبەکەمان بە وریایێکی بەرینەوە بە هاونیشتمانانی خۆشەویست رائەگەیێنێ کە هەر وەکوو تا ئێستا فریوی فێڵ و درۆ و دەلەسەکانی ئیستعمار و چلکاوخۆرەکانی ئیستعمارتان نەخواردوە پێویستە زیاتر لە پێشوو ئاگاداری جوڵانەوەی گێرە شێوێنی نۆکەرانی ئیستعمار و ئیمپریالیزم بن.

حیزبەکەمان دڵنیایە تا ئەو دەم خۆی لە باوەشی نەتەوەکەماندا ببینێ. ئیستعمار و نۆکەرانی زەفەری پەرش و بڵاوی پێ نابەن هەر وەکوو بە درێژی چواردەساڵ تەمەنی حیزبەکەمان تەقەلای دوژمن بۆ جیاکردنەوەی ئەو لە میللەت نەیتوانی سەرکەوێ.

حیزبەکەمان زۆر بە شانازیەوە هێزی بەتینترکردنی خەباتی رەزگاریخوزانەی خۆی لەو پشتیوانیە پڕ جەوهەرەی وەردەگرێ کە نەتەوەکەمان لە پاش کارەساتەکەی کودتای ٢٨ی گەلاوێژی ٣٢ لە وی کرد لە باوەشی خۆیدا پاراستی.

حیزبەکەمان هەر وەک قەلایەکی نەروخ بە پشت ئەستووری نەتەوەکەمان

بەرامبەر بە دوژمن راوەستاوە و بە یاریکاری هاو نەتەوەکانمان لە عیراق و تورکیا و سوریا دا بۆ پێکهێنانی ئاواتی پیرۆزی گەلی کورد و هەر وەها لە ئێران بە خەباتی پتەو و یەکگرتووی لە گەڵ نەتەوەکانی فارس و ئازەربایجاندا بۆ پێکهێنانی ژیانێکی خۆش و بەختیار بەرە و پێش دەروات. حیزبەکەمان بە پتەو بوونی خەباتی گەلان ئاسۆی ئازادی و رزگاری زۆر رووناک دەبینێ. بە یەکەوە لە ریزێکی تێک پەسیو و پتەو دا بە ژیری و وریایی یەکی ئازایانەوە بەرەو گزنگی رووناکی ئازادی و سەر بەخۆیی گەلان بۆ پێشەوە.

بژی ئاشتی بەردەوام ئامانجی پیرۆزی گەلان.

سەرکەوێ ئامانجی گەلانی یەخسیر بۆ ئازادی و رزگاری.

پیرۆز بێ ئاواتی جوانی پێکهاتووی نەتەوەکانی کورد و عەرەب لە عیراقدا.

سەرکەوێ خەباتی گەلی کورد بۆ ئازادی و رزگاری.»(١١)*

*ـــ ئەم بەیاننامەیە دەقەکەی بێ دەستکاری بلاو دەکرێتەوە. بەلام رێنووسەکەی دەستکاری کراوە.

دوای شۆرشی چواردەی گەلاوێژ کۆمیتەی(کوردستان)ی حیزبی دیموکراتی نیشتەجێ لە تاران (عەزیزی یوسفی، رەحمەتی شەریعەتی و وکتورعەلی مەولەوی) هەر وەک باسکرا بریار دەدەن کە عەزیزی یوسفی بچێتە عیراق و عبداللەئیسحاقی بنێرێتەوە کوردستان و ناوچەی سنەی بۆ دیاری دەکەن بچێتە وێندەرێ. عەزیزی یوسفی پێش ئەوەی بگاتەوە مەهاباد لە(بالانیش)لە رێگای نێوان ورمێ - مەهاباد دەگیرێ. بە گرتنی عەزیزی یوسفی کومیتەی سەرکردایەتی بە تەواوی لە کار دەکەوێ. دوو کەسیان(رەحمەتی شەریعەتی و دوکتۆر مەولەوی) لە تاران دەمێننەوە، عەزیزی یوسفی لە زیندان و غەنی بلوریانیش کە تازە لەزیندان ئازاد بوە لەمەهاباد خۆی بۆ مات دەکا. عبداللەئیسحاقیش لە کوردستانی عیراق دەبێتە ئەحمەد توفیق و بە تەنیا دەبێتە حیزبی دیموکرات و هەڵدەسورێ. « لە نێو برادەران باو بوو هەر وەختێک گوتبامان حیزب، یانی(ئەحمەدتوفیق).یان ئەگەر گوتبامان کاک ئەحمەد یانی( حیزبی دیموکراتی

کوردستان). هەر کات کاک ئەحمەد بە یەکێکی گوتبایە تۆ ئەندامی حیزب نی. تازە بە حەوت ئاوان نە دشۆراوە، لە ئەندامەتی دەکەوت و هەڵنەدەستاوە. » (١٢)

حکوومەتی عبدالکەریم قاسم چەشنێک لە دیموکراسی و دەرەتانی تێکۆشانی سیاسی بۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلانی ناوچەی رۆژهەلاتی نیوەراست پێکدێنێ.. ئازادیخوازانی کورد لە تورکیا و ئێران و سوریا روو دەکەنە عیراق و لە بەغدا کە بە(دارالسلام) ناوی دەرکرد بوو کۆ دەبنەوە. عبداللە ئیسحاقیش لە بەغدا بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان جێگیر دەبێ. هەوەڵین هەنگاوی تێکۆشانی لەم بەینەدا بریتی یە لە چاپکردنی رەسمی پێنج کەس لە رێبەرانی ناوداری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد(شێخ مەحمود، قازی محەممەد، شێخ سەعید، سەیدرەزای دەرسیم و مەلامستەفا بارزانی) لە سەر کارت پوستالێک و بە وەر گرتنی ئیجازە لە حکوومەتی عیراق بۆ کۆ کردنەوەی یارمەتی بۆ حیزب بلاویان دەکاتەوە.

لەم سەر و بەندەدا حیزبی تودەی ئێرانیش چەند کەس لە کادرەکانی خۆی دەنێرێتە بەغدا و لە گەڵ بزووتنەوەی رێکخراوی ئاشتیخوازانی عیراقی هاوکاری دەکەن و هەر لەو کاتەشدا تێدە کۆشن کە لە گەڵ ئێرانیش پێوەندی بگرن و بتوانن رێکخراوەی خۆیان بیوژێننەوە.

عبداللەئیسحاقیش کە بۆتە( ئەحمەد توفیق)لە گەڵ کادرەکانی حیزبی تودە لە پێوەندی دا دەبێ و لە رێگای ئەوانەوە لە کۆنگرەی ئاشتی عیراقیشدا بەشداری دەکات.

# گەڕانەوەی مەلامستەفا بارزانی بۆعیراق

مەلا مستەفا کە ماوەی یازدە ساڵ بوو لە ئاوارەییدا دەژیا، دوای شۆرشی عیراق بڕیار دەدا بگەڕێتەوە نیشتمان. لە گەڕانەوەدا دەچێتە چێکوسلۆفاکی و ماوەی بیست رۆژێک لە وێ چاوەروانی ڤیزادەکا. عبدالرحمانی قاسملو کە ئەو دەم لە پراک دەژی، دەچێتە لای مەلا مستەفا و بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران خۆی پێدە ناسێنێ و لە سەر وەزعی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە پتر لە دوو ساڵە لێی دوورە و هیچ ئاگای لێ نیە، ئەم ئاگاداریەی خوارەوە بە خەتی خۆی پێشکێش بە بارزانی دەکات :

« چەند اطلاعیک لە سەر حزبی دیموکراتی کوردستان «ایران»

کاری حزبی دیموکراتی کوردستان بە تایبەت پاش کودتای ساڵی١٩٥٣پەرەی گرت چونکو حزب دەستی پی کرد بەوە کە سەربەخۆ کار بکات و کاری کوردستان هەر خوی بەریتەپیش. ئەو ناوچانەی کە زورتر حزبی دیموکرات نفوزی تید اهەیە ئەمانەن: شاپور «سلماس» ،ورمی «رەضائیە» و دەور و بەری، مهاباد و سەردەشت و شنو و سندوس و تەواوی ناوچەی دەوروبەری ئەو شارانە. سەقز و بانە و دییەکانی دەورو بەری بانە .شاری سنە و دەوروبەری شاری کرماشان کە تازە حزب خەریکە تییدا تی بکوشی.

ئەو ناوچانەی کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی زور تیدا بە هیزە ئەوانەن، ناوچەی جەلالی و شکاکان، تەرگەوەر و مەرگەوەر ناوچەی منگوران و پیرانان و لاجان. دییەکانی دەوروبەری، ناوچەی جوانرویان و هەورامان. بزوتنەوە لە حدودی عراق، لە شنووە هەتا کرماشان زور بە هیزە. حزبی دیموکراتی کوردستان لە زوربەی ئەو دییانە سازمانی «منطمە»ی هەیە و چەند سازمان کومیتەیەکی بەخش تەشکیل دەدەن.... چەند کومیتەی بەخش یەک کومیتەی محلی تەشکیل ئەدەن و لە شارەکانیش کومیتەی شارستان هەیە، لە سەر کومیتەی شارەکان کومیتەی

مەرکەزیە کە خەبات ری نوینی ئەکات. ئەو سی نەفەرە کە ئیستا لە کوردستانی ایران کاری حزبیان بە دەستەوەیە ئەوانە کومیتەی مەرکەزین ١ عبدالله اسحاقی ٢عزیزیوسفی ٣ رحمتالله شریعتی. ژمارەی ئەندامانی حزب بە چاکی لیم مەعلوم نیە چونکو ئیمە جاری لە بەر نهینی بونی کارەکە امارمان کەمە. لە پاشان ئەوە سالیک زیاترە من لە کوردستان دورم لە حالیکدا لەو یەک سالەدا زور گورانی گەورە لە ژیانی سیاسی کوردستاندا هاتوتە پیش کە بە قازانجی بزوتنەوە و حزب بوە. بەلام هەر ئەوەندە دەتوانم بلیم کە ئەندامانی حزبی دیموکراتی کوردستان ایستا دەبی بە هەزار بیان ئەژمیری»( ١٢) (رینووس وریزمانی ئەم ئاگاداریە ی قاسملو دەستکاری نەکراوە.)

دوای گەرانەوەی بارزانی ئەمر عبدالرحمن قاسملوش دیتەوە بەغدا. لە زانکوی ئەدەبیات بەشی کوردی کار پەیدا دەکا و دەرس دەلیتەوە. خیزانیشی دینیتە بەغداو لە سەر راسپاردەی بارزانی لە لای ماموستا نوری شاوەیسی رەحمەتی لە وەزارەتی ئیسکان دادەمەزری.

عبداللەئیسحاقی لە بەغدا خانویک دەگری و لە گەل هیندی لە برادەران لەم خانوەدا دەژین. ئەوانەی لە گەل عبداللەئیسحاقی دەژین، بریتین لە:( کەریمی حسامی، قادرشەریف، سمایلی قاسملو، مەلاباقی، قاسمی سولتانیان، عەزیزی فەلاحی) جار و بار رحمانی قاسملوش دیت و هاتوو چو دەکا. روژیک قاسملو پیشنیار دەکا کە کوبوونەوەیەکمان هەبی و باسی وەزعی خومان بکەین. لە کوبونەوەدا قاسملو ئەم بەیاننامەیە دینیتە بەر باس کە ئەحمەد توفیق بە ناوی حیزب دەری کردوە و دەلی:« لە باری زانستی یەوە ئەم بوچوونە هەلەیە و بورژوازی عەرەب مافی نەتەوەی ژیردەست بە رەسمی نا ناسی و ئەمە لادانە لە ریبازی زانستی» جگەل لەوە لە هەلسورانی تەک نەفەری ئەحمەد توفیق رەخنە دەگری. عبداللەئیسحاقی لە وەلام دا دەلی:« رەحمانی بە حیزبی ناناسم. ئەو ئەندامی حیزبی تودەیە و دە یەوی حیزبی دیموکرات بەرێتە بەردەستی حیزبی تودە. جگە لەوە گیراوە لە تاران و سناواک ئازادی کردوە و جیگای گومانی

برادەرانە..»

بە دوای ئەوە دا ئیتر رحمانی قاسملو بە یەکجاری دەچێتە ماڵی خسرو توفیق و هاتوو چۆی خانوەکە ناکات. ئەحمەدتوفیق بە هاتوو چۆی کن مەلامستەفا و دوو زمانی لە قاسملو لای بارزانی رێگا بۆ خۆی دەکاتەوە. لەو کاتەشدا لە نێو پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق ناکۆکی پەیدا دەبێ. مەلامستەفا هەمزەعبداللە و ساڵح حەیدەری و خسروتوفیق و نژاد ئەحمەدعەزیزاغا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە حیزب دەر دەکا و ماموستا برایم ئەحمەد و تاقمەکەی لە جێی ئەوان دادەنێ و دەیانکات بە مەکتەبی سیاسی. ئەحمەدتوفیق لەم ناکۆکیەدا بۆدوو زمانی و شەیتانی دەورێکی نا حەز دەبینێ کە هیچ پێوەندیکی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان ومرۆڤێکی پێشکەوتوخوازەوە نابێ. لە سەر هەڵسوڕانی بێ مەسئولیەتی ئەحمەد توفیق نا کۆکی لە نێو ئەندامانی حیزبی دیموکراتی مەوجود لە عیراق توند دەبێ و دێنە سەر ئەم بڕیارە کە بچنە لای مەلامستەفاو باسی وەزعی خۆیان بکەن بەڵکو بتوانن ناکۆکی لابەرن.

شەوی ١٩٥٩/١٠/٦ رەحمانی قاسملو، مەلاباقی، عبداللەئیسحاقی، حەمەی حاجی سەعیدی و کەریمی حسامی و عەزیزی فەلاحی دەچنە لای مەلامستەفا. رەحمانی قاسملو بە مەلا مستەفا دەڵێ:« ئێمە خەبەرمان داوە هێندێ برادەرمان لە ئێرانەوە بێن. تا هاتنی ئەوان کەس لێرە نوێنەری حیزب نیە و ئەحمەد توفیقیش دەمێکە بۆ کار لە ئێران دیاری کراوە، بەلام لە حیزب یاغی بوە و ناگەڕێتەوە.....»

ئەحمەد توفیق دەڵێ : رەحمان ئە ندامی حیزبی تودەیە و ئێستاش شەو ورۆژ لە گەڵ هەمزە عبداللە و نژادلە گەڵ ئەم کاک کەریمە لە کۆ بوونەوە دایە. حەمەی حاجی سەعیدی و عەزیزی فەلاحیش ئەندامی حیزب نین. مەلا مستەفا کەباسی نژاد دەبیسێ تورە دەبێ و دەڵێ: «من ئەحمەد توفیق بە نوێنەری حیزب دەزانم. ئێوەش ئەگەر بەیانێک دەربکەن بە خائینتان دەناسێنم و لە عیراقتان وەدەر دەنێم» (١٤)

پاش ئەم هەڵوێستەی مەلامستەفای رەحمەتی کەریمی حسامی ورەحمانی

قاسملو رۆژێک دەچنە کن ماموستا برایم ئەحمەد کە تازە مەلا مستەفا لە جێی ماموستا هەمزە عبداللە ی دانابوو، کرد بووی بە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان. دوای بە خێر هێنانێکی سارد، کاک رەحمان دەڵێ:« کاک برایم ئێمە خەبەرمان داوە چەند برادەرێکمان لە ئێرانەوە بێن. هەتا ئەوان دێن کەس هەقی نیە بە ناوی نوێنەری حیزبی دیموکرات لێرە قسە بکات، تکایە ئێوە یارمەتی بە توند بوونی ناکۆکی نێو ئێمە مەکەن.»

ماموستا برایم ئەحمەد بە لەونێکی نا دۆستانە لە وەڵامدا دەڵێ:« ئێمە ئەحمەد توفیق بە نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستان دەناسین. ئێوە شەو و رۆژ لە گەڵ هەمزە و نژاد دژی پارتی کار دەکەن. ئێوە لە گەڵ شیوعیەکانن. بێجگە لە ئەحمەد توفیق ئێمە هیچ کەسی تر بە نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستان نا ناسین.»

هاتوو چۆی کن نژاد و هەمزەعبداللە، هاوکات لە گەڵ دوو زمانی ئەحمەدتوفیق رەحمانی قاسملو لە پێش چاوی مەلا مستەفا دەخات. دیارە پارتی هەر بەوەندەش واز ناهێنێ، کەریمی حسامی و رەحمانی قاسملو لە عیراق وەدەر دەنێن. بە دوای ئەوەدا کە بارزانی ئەمر عبداللە ئیسحاقی دەکا بە حیزبی دیموکراتی کوردستان، ئیتر ناو براو دەست دەکا بە نامە نووسین و هەڵبەستنی بوختان و درۆ بە ئەندامانی حیزب و لە رێگای دوو زمانی و هێنان و بردنی قسەو قسەڵۆک خۆی لە کن بارزانی خۆشەویست دەکا. لە لایەکی دیکەش رەسمی مەلامستەفا وەردەگرێ وبی هێندێ ئەندامی ناسراوی حیزبیان دەنێرێتەوە لەکوردستانی ئێران. دیارە دەورو بەری بارزانیش یەکی ئاوایان گەرەک دەبێ کە لەملاو لا خەبەریان بۆ کۆ کاتەوە.

بۆ ئەوەی مادەی خاو لە دوا رۆژدا بکەوێتە دەست ئەو زانا و مێژوو نووسانە کە بخوازن رۆژێک لە رۆژان مێژووی راستەقینەی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستانی ئێران بنووسن، کاکلی هێندێ لەو نامەو نووسراوانە باسدەکەم کە ئەحمەد توفیق بۆ بارزانی نووسیون و ماوەیەک خۆی پێوە ژیاندوون.

لە یەکەم نامەدا کە بۆ کومیتەی ناوەندی پارتی نووسیوەو روو نووسەکەشی لە

کەل رەسمێکی بۆ سەرۆک بارزانی ناردوە دەنووسێ:

«... بۆ زانیاری وە بۆ ئەوەی کە ئێوە زیاتر لە سەر ئەو کەسانە و یا ئەو هاوڕێ یانەی کە وا لە دیوی عیراق خزاون روون بینەوە بە پێویستم زانی ئەوانەی ژێرەوەتان بۆ بنووسم دیارە تکای هاوڕێ یانەم هەیە کە ئەم زانیاریانە لە چوار چێوەی کومیتەی مەرکەزی باشترە کە نە چنە دەر. چونکو جوڵانەوەی نا لە باری هێندێ لە وانە پێش ساڵێک لێرە هێندێ کۆسپ و قۆرتی بۆ هاوڕێ یانی پارتی خوڵقاند جا بۆیە کە ئەو جوڵانەوانە دوا براو بن بە پێویستم زانی ئەوانەی ژێرەوەتان بۆ بنووسم:

١ - کەریم ئەنوەری( عبدالرحمن قاسملوە) لە هاوینی ساڵی ١٩٥٦هەڵپە سێردراوە.( تەجمیدکراوە)

٢ - صالح توفیق( کەریمی حسامی یە)وەزعی لە مەر جێگاو رێگای تەشکیلاتی روون نیە.... لە ژێر رێک و پێکی حیزبی دا نەماوە.

٣ - جەلال ئەحمەد(عەزیزی فەلاحی یە) لە حیزب هەڵپەسێردراوە.

٤ - جەمال توفیق(حەمەی حاجی سەعیدە) ناو براو استعفای لە حیزب داوە

دیارە نامەی ئەحمەد توفیق درێژە و لە کۆتایی نامەکەدا دەنووسێ:« لە ئاخری باسدا لە هاوری یان دەخوازم هەر جورە ملاحەزەیەکیان لە سەر نا لە باری هاوری یانی ناو براو هەیە تکا دەکەم زوتر لە وەلامی ئەم نوسراوەدا بۆمان بنوسن چونکو هەر بەو زوانە وەزعی وانە وەک برادەرەکانیان نژاد و وانە روون دەکرێتەوە و کۆبونەوەی حیزبی ئاخرین بریاری خۆی لە سەریان دەر دەکا و رەسمەن بە ئێوە و هاورێی بە رێز ماموستا مستەفا بارزانی پێشکێش دەکا. تکایە بۆ هەمو جورە پەیوەند و کارێک کە لە گەل هاوری یان و یان لایەنگرانی «حزبی دیموکراتی کوردستان» پەیدا دەکەن بو وەی کە باشتر و لە بارتر بتوانن بە داماوە کانیان رابگەن و یان بووەی کە بو دوا رۆژ دەردی سەر و پەژیمانی بۆ ئێوە و ئێمە پەیدا نەکەن پیویستە لە پیشدا لە سەر ئەوانە لە چوار چیویکی حزبی دا باسیان لە سەر بگرێ. بە پێویستم زانی تکاتان لێ بکەم بۆ ئەوەی بتوانم نووسراوێکی پیرۆز

بایانه وه دمر بری سیاسەتی بنچینەیی حیزبی دیموکراتی کوردستان ساز بکەم چەند رۆژ پێش کردنەوەی کۆنگره خەبەر دارم بکەن تا کو دەگەڵ پەیام و پیرۆز بایی رەسمی کومیتەی سەر کردەیی حیزبی دیموکراتی کوردستان به کۆنگره پێشکێش بکەم.» سەرکەوتنتان دەخوازم. به حورمەتەوه نوێنەری کومیتەی سەرکردەیی حیزبی دیموکراتی کوردستان.(١٥) ٥٩/٩/١٥ بکر

سەرچاوەکان


١ – کەریمی حسامی، له بیرەوەری یەکانم، بەرگی یەکەم ،ل، ١٤٨ ــــ ١٥٠

٢ – خاطرات نورالدین کیانوری، تهران ، ١٣٧١ ، ل ٢٩٨

٣ – محمد روزگار، از انزلی تا دوشنبه، ستکهلم. ١٩٩٤، ل،١٦٥ ٢١٥ ، ٢١٦

٤ – عبدالرحمن قاسملو، پاشکۆی تێکۆشەر، دەورەی دووەم، ژماره ٢٧، ١٣٦٨

٥ – عبدالرحمن قاسملو ، چل ساڵ خەبات له پێناو ئازادی دا، ١٩٨٥ ، ل.٩٩

٦ – عبدالرحمن قاسملو، پاشکۆی تێکۆشەر، ژماره ٢٧. ل، ٧ ــــ ٨

٧ – خاطرات نورالدین کیانوری ، تهران، ١٣٧١ ، ل، ٣٥١

٨ – قاسملو هەمان سه رچاوه ، ل ، ٩

٩ – مێژدو نارۆدنایا ژیزن، موسکۆ ، ژماره ٤ ، ١٩٥٦

١٠ – اطلاعات هفتگی، تهران ، ١٩٥٦/٣/٢

١١ – گۆڤاری هیوا ، بەغدا، ژماره ٦ و٧ کانون دووەم ، ١٩٥٨

١٢ – سەعید کاوه ، ئاورێک له به سەر هاتی خۆم و..... ١٩٩٦ ، ل،٥٠

١٣ – مسعود البارزانی ، البارزانی والحركه التحرريه الكرديه، ١٩٩١ ل،٢٥٣ – ٢٥٤

١٤ – کەریمی حسامی ، له بیرەوەری یەکانم، بەرگی دووەم ، ١٩٨٧

١٥ – مسعود البارزانی ، هەمان سەرچاوه، ل ، ٢٥٩ ــــ ٢٦٠

## بەشی پێنجەم

# کوردستانی ئێران ساڵی ١٩٥٩

پێشتر باسی ئەوە کرا کە چەند کادرێکی حیزبی دیموکرات بێ ئەوەی بەرنامە و دروشم و ڕێبازێکی ڕوونی خەباتیان هەبێ لە دێهات دەسوڕێنەوە، ئەوەندەیە لە پێوەندی لە گەڵ خەڵکدا ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەپارێزن و ناهێڵن بڵێسەی تێکۆشان و خەبات بە جارێک دابمرکێ و بکوژێتەوە. بەڵام لە پاییزی ئەو ساڵە دا، جەلیلی گادانی یەک لەو کادرانەی کە لە دێهات دەسوڕایەوە و پێوەندی یەکی زۆری لە گەڵ خەڵک و ئەندامانی حیزب لە ناوچەکاندا هەبوو، بە هۆی کابرایەکی ساواکی ناسراو بەناوی بێژەنی میرموکری دەگیرێ و دەکەوێتە بەر دەستی ژاندارم و ساواکی حکوومەتی تاران. بە داخەوە کاک جەلیل لە بەرانبەر ئازار و ئەشکنجەی وەحشیانەی ژاندارمە و ساواکدا تاقەت ناهێنێ. وەزمان دێت و هەرچی دەیزانێ دەیڵێ. یەکی دیکەش لە کادرەکانی دێهات لە ناوچەی هەوشار بە ناوی هاشمی جەلالی دەگیرێ و بە گرتنی ئەو دوو کادرەی شارەزای ناوچەکان، زەبرێکی قورس وەرێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات دەکەوێ.

یەکێ ترلەو کادرانە دێهات، خوێندکارێکی زانستگای تاران بە ناوی(ئیسماعیل قاسملو)کە چەند ساڵ بوو زانکۆی بە جێ هێشتبوو، هاتبوە کوردستان و لە دێهات تێدە کۆشا و ناوچەکانی تێکۆشان و زۆربەی نیزیک بە تەواوی ئەندام و

لایەنگرانی حیزبی دەناسی.

لە مانگی رەشەمەی ۱۹٥۹ کاتێ لە کوردستانی عیراقەوە بۆ کاری حیزبی دەگەڕێتەوە کوردستانی ئێران لە ناوچەی بانە دەگیری ژاندارم دەکەوێ و دەیبەن بۆ تاران .ناو براو لە تاران لە ژێر ئەشکنجەی وەحشیانەی ساواک خۆڕاناگرێ و هەرچی دەیزانێ و دەیناسێ بە تەواوی دەیخاتە بەردەستی ساواک. ساواک لە گرتنی ئەندامانی حیزب کە سمایلی قاسملو ناوی بردوون، تاڵوکە ناکات. تەواوی گوند و شوێن و جێگای ئەندامانی حیزبی دەخاتە ژێر چاوە دێری و لە مانگی خەزەڵوەری ۱۹٥۹ پەلامارێکی توند و هەموو لایەنە بۆ سەرانسەری کوردستان دەست پێدەکا. ئەوەی دەفریای هەڵاتن دەکەوێ، رادەکا بۆ دیوی کوردستانی عیراق و نیزیکەی ۲٥۰ کەسیش لە ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دیموکرات دەگیرێن. گیراوەکان یەکسەر بۆ تاران دەبەن و دەخرێنە ژێر ئەشکنجە و ئازاری وەحشیانە و کەسیش ناتوانێ لە بەرانبەر ئەشکنجەی ساواک دا خۆ رابگرێ و هەموویان ئەندامەتی حیزبی دیموکرات دان پیدا دەنێن. «..... سمایلی قاسملو کە لە بەهاریدا دەگیرێ، نیزیک بە هەشت مانگ دوای گرتنی ئەو، ساواک لە ژێرەوە خەریکی لێکۆڵینەوە و ناسینی جێگا و رێگای ئیعتراف لە سەر گراوەکان دەبێ. ساواک بە لە سەر خۆیی لە نوکەوە ئەو ئەندامانەی کە دەبوایە بیانگرێ، شوێن و جێگا و رێگایان شارەزا ببوو. بە روونی دەیزانی لە کوێن و چۆن دەبێ بچن بیانگرن، کاتێک ساواک دەست بە کار بوو لە ۲٤ سەعات دا لە سەرانسەری کوردستان ئەوانەی کە دەبوایە بگیرێن گرتنی و لە زیندانی قایم کردن.»(۱)

ئەوەی لێرە و لەم گرتن و راو نانەدا بۆ سەرنجدان و لێ ورد بوونەوە دەبێ، ئەوەیە کە حکومەتی ئێران بێ ئەوەی بخوازێ سەری وە بەردێکی رەق دەکەوێ و بە ناچاری مەجبوور دەبێ لە گەڵ راستیەک روو بە روو بێ کە ماوەی ۱٥ساڵ بوو خۆی لێدە پاراست و نەیدەویست ناوی بێنێ. بۆ هەوەڵجار تەواوی ئەم خەڵکەی دەگیرێن، بە ناوی ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستان خۆ دەناسێنن. بە تاوانی ئەندامەتی لە حیزبی دیموکراتی کوردستان، ئازار و ئەشکنجە دەکرێن و بە

حەپسی دوور و درێژ و تەنانەت ئیعدامیش مەحکووم دەکرێن. پێشتر گەلێک لە ئەندامانی حیزبی دیموکرات دەگیران و ئازار دەدران بە حەپسی پێنجساڵ و چوار ساڵ و سێ ساڵ مەحکووم دەکران، بەڵام بە تاوانی ئەندامەتی لە حیزبی تودەدا. بە نووسینی پاکانە و بێزاری لە حیزبی تودە ئازاد دەکران. بە راستی دەزگای حکوومەتی تاران نەیدەویست نەیدەهێشت ناوی حیزبی دیموکرات بێتە سەر کاغەز و نێو ناوان و یادی کۆماری کوردستانی لە گەڵ زیندوو بکرێتەوە.

ئەمجارە نەیانتوانی ناوی حیزبی دیموکرات بشارنەوە. لە لایەک دەیانزانی کە حیزبی تودەی ئێران ئیتر ئەم نفوز و تەشکیلاتی جارانی نە ماوە. لە لایەکی دیکەش گیراوەکان خۆیان بە ناوی ئەندامی حیزبی دیموکرات دەناساند و سمایلی قاسملوش ئەم خەڵک و تەشکیلاتەی بە ناوی حیزبی دیموکرات ناساند بوو.

بێجگە لە وانەی لەم پەلامارەدا دەگیرێن، نیزیکەی ۱۸۰کەسێکیش رادەکەن و روو دەکەنە کوردستانی عیراق و لە سولەیمانی کۆ دەبنەوە و لە خانوێکدا بە ناوی کۆموون بە کۆمەڵ ژیانێکی دژوار و ناخۆش دەبەنە سەر. هێندێکیش بەلای حاجی ئۆمەران و دیانە دا رادەکەن و لە هەولێر دەگیرسێنەوە بە کوێرەوەری و برسیەتی ژیان دەبەنە سەر.

ئەحمەد توفیق هەر وەک لە عاسمانەوە گەزۆی بۆ باری بێ. ئەم کارەساتە دڵتەزێنە بە قازانجی خۆی دەقۆزێتەوەو خۆیان لێدەکاتە حیزب و ئەمجارە بە ناوی ( کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان) دەپەیڤێ و نامە دەنووسێ. لە کۆمووتی سولەیمانی هێندێ لە کادرەکانی خاوەن رابردو و تێکۆشەر لە هەڵبەز دابەزیی و تاک رەوی ئەحمەد توفیق وەدەنگ دێن. بەڵام ناوبراو بارزانی لە پشتەو بوختان وتۆمەتیشی لە جانتا دایە. ناکۆکی لە نێوانیان توند دەبێ. چەند کەسیان دێنە بەغدا و هەولێر و لە ژیانێکی دژوار دا خۆیان دەپارێزن. لە تاران دادگای نیزامی غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی و رەحمەتی شەریعەتی و سمایلی قاسملو و دوکتور عەلی مەولەوی بەئیعدام وئەبەد مەحکوم دەکات. ئەندامانی دیکەی گیراو تێکرابە حەپسی جۆر بە جۆر مەحکووم دەکرێن. رۆژنامەکانی پارتی و حیزبی

کۆمونیستی عیراق و چاپەمەنی دیکە دەنگی بێزاری و نارەزایی دژی حوکمی دادگای نیزامی تاران بەرز دەکەنەوە. ئەو لافاوی رەخنە و بێزاری هێزەکانی کوردستانی عیراق مەحکوم کراوەکان لە ئیعدام رزگار دەکا. هەر لەو کاتەشدا ئەحمەدتوفیق لەکوردستانی عیراق کومیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستان کە قەت لە کۆنگرە و کۆنفرانسێکدا هەڵنەبژێردراون ساز دەکا و ناوە کانیان بەمجۆرەی خوارەوە پێشکێش بە سەرۆک بارزانی دەکا :

( ناوی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران»

١ ــــ عەزیزی یوسفی مەحکوم بە ئیعدام چاوەروانی حوکم ئەندامی کومیتەی مەرکەزی

٢ ــــ رەحمەت الله شەریعەتی مەحکوم بە ئیعدام چاوەروانی حوکم ئەندامی کومیتەی مەرکەزی

٣ ــــسید عبدالله ئیسحاقی، کادری مخفی و حرفەای کومیتە ئەندامی کومیتەی مەرکەزی

٤ ــــ غەنی بلوریان مەحکوم بە ئیعدام چاوەروانی حوکم مشاوری کومیتەی مەرکەزی

٥ ــــ هاشم اقل الطلاب کادری مخفی و حرفەای حیزب مشاوری کومیتەی مەرکەزی

٦ ــــ هاشم حسین زادە کادری مخفی و حرفەای حیزب مشاوری کومیتەی مەرکەزی

٧ ــــ دوکتور علی مولەوی محکوم بە حەبسی ئەبەد مشاوری کومیتەی مەرکەزی

٨ ــــ قاسم سلطانیان کادری مخفی و حرفەای حیزب مشاوری کومیتەی مەرکەزی

ژمارەی ئەندامەکان و لایەنگرەکانی حیزب، حەوت هەزار ئەندامە ( ٧٠٠٠ ) (٢ )

---

ئەگەر سالی ١٩٥٨ عبدالرحمن قاسملو پاش ٢سال دووری لە ولات و لە ئوروپاوە تەشکیلات و رێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات لە کرماشانەوە تا ئارارت بە هەزاران ئەندامەوە پێشکێش بە بارزانی ئەمر دەکات، دوای سالێک ئەحمەد توفیق

دیارە کاک ئەحمەد توفیق وەتەبێ هەر لە خۆوە ئەم کومیتە ناوەندی یەی بە٧٠٠٠ ئەندامەوە ساز کرد بێ. ئەو پێویستی بەم ئیبتکار و و ژیرییە هەبوە. حیزب و ڕێکخراوی خاوەن ٧٠٠٠ هەزار ئەندام و دام ودەزگای ئاوا پێویستی بە کەرەسە و ئامرازی ژیان و کار ڕاپەراندن هەیە. بۆئەم کارە ئەحمەد توفیق سیایی و ڕیزی خەرج و پێداویستی حیزبی پیشکێش بە سەرۆک بارزانی دەکات و وەک بە ڕێز کاک مەسعود دەنووسێ، بارزانیش ئەو پارەتیەی داوە بە ئەحمەد توفیق. ئەمەش ڕیزی داواکاری یەکانی عبداللە ئیسحاقی یە بەخەتی خۆی:

خەرجی مانگانەی کادرەکانی حرفەیی ٥٩/١/٧

| | |
|---|---|
| ١ - جوانمێر | ٧ دینار |
| ٢ - سیامەند بانە و سەردەشت | ٧ دینار |
| ٣ - مامەند مەنگوڕ و گەورک و محالی دێبۆکری | ٧ دینار |
| ٤ - پیرۆت مەنگوڕ | ٧ دینار |
| ٥ - گولاوی میاندوا و ساینقەلا | ٧ دینار |
| ٦ - شەریف | ٧ دینار |
| ٧ - ئاسوس قاسید (پیک ) | ٧ دینار |
| ٨ - گمۆ | ٧ دینار |
| ٩ - سەعدون بە ماڵ و منداڵەوە نەقوستانە لە مەهاباد | ١٤ دینار |
| ١٠ - کرمانج بە ماڵ و منداڵەوە کرمانشا | ١٠ دینار |

---

دوای گیرانی ٢٥٠ ئەندامی حیزب و ئاوارە بوونی نیزیک بە٢٠٠ ئەندام و لایەنگرانی حیزب ، کومیتەیەکی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە ٣ ئەندام وچەند مشاور ساز دەکا و غەنی بلوریان کە وادەزانرا ئەندامی کومیتەی سەر کردایەتی بوە. دەیکاتە مشاور و حەوت هەزار ئەندامی یە ئەژماریشیان بە دوادا ڕیز دەکات و بە خەتی شەریفی خۆی دەیدا بە بارزانی نەمر. پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە کە ئەو دەم حیزبی دیموکرات هیچ کۆنگرە و کۆنفرانسیکی نەبەستوە و کومیتەی ناوەندیشی نەبوە. چەند کەس بە ناوی کومیتەی کوردستان کاریان کردوە و ئەحمەد توفیق لە پڕ لە عیراق کومیتەی ناوەندی داتاشیوە. پێداچوونەوە

١١ - ئاراس به ماڵ و منداڵەوە دەرەوەی بانە ١٠ دینار

١٢ - پولو بە ماڵ و منداڵەوە مەهاباد ١٠دینار

١٣ - ژین بە ماڵ و منداڵەوە خانێ ـــ پیران ١٠ دینار

١٤ - نیشتمان بە ماڵ و منداڵەوە نەغەدە ١٠ دینار

١٥ - شیروان بە ماڵ و منداڵەوە مەهاباد ١٠دینار(بۆئاگاداری

خوێنەران لە راستی ودروستی کاک ئەحمەد توفیق(شیروان)ناوی حیزبی نووسەرە و ئەو دەم بە ماڵ و منداڵەوە پارتی لە عیراقی دەری کردوە و لە چێکوسلڤاکیا خۆی گرتۆتەوە.)

١٦ - کاوە بە ماڵ و منداڵەوە نەغەدە و شنۆ ١٠ دینار

١٧ - ناسر رضائیە بە ماڵ و منداڵەوە ١٠ دینار

١٨- سایەقەلا بە ماڵ منداڵەوە میاندواو ١٠ دینار

١٩ - بلێسە بە ماڵ و منداڵەوە سنە ١٠ دینار

٢٠ - کورد پور بە ماڵ و منداڵەوە سنە ١٠ دینار

٢١ - باخەوانی بە ماڵ و منداڵەوە تاران ١٤ دینار

٢٢ - پیرۆز بە ماڵ و منداڵەوە تاران ١٤ دینار

٢٣ - هومید بە ماڵ و منداڵەوە تاران ١٠ دینار

٢٤ - جمشید بە ماڵ و منداڵەوە کرمانشا ١٠دینار

٢٥ - هیوا بە ماڵ و منداڵەوە سنە ١٠ دینار

٢٦ - ئارارات بە ماڵ و منداڵەوە شاپور (سلماس) ١٠ دینار

٢٧ - زرینگ بە ماڵ و منداڵەوە بانە ١٠ دینار

٢٨ - بێ باک بە ماڵ و منداڵەوە بانە ١٠ دینار

---

٢٦٥ ٢٦٥ دینار

**بۆ پاراستنی جێگا و ڕێگاکانی حیزبی و هاتوو چوونی کادرەکانی نهێنی**

١ ) دە تفەنگی برنۆی درێژ (پیادە) لە قەراری هەر تفەنگەی ٩٠دینار ٩٠٠ دینار

٢ ) پازده دەمانچەی چوک و گەورە ــ هەر یەکەی بە تەفاوەتی قیمەت لە٣٢ دینار تا ٣٦ دینار ٤٧٣ دینار

لانی کەمی :

١ ) شەش تفەنگی برنو ٥٤٠ دینار

٢ ) دە دەمانچە ٥٢٠ دینار

پاریدەی فوق العادە

٣ ) خەرجی ماڵەکانی حیزبی لە شارەکان

| | |
|---|---|
| ١ – ماڵ لە تاران | ٢١ دینار |
| ٢ – ماڵ لە مەهاباد | ١٣ دینار |
| ٣ – ماڵ لە نەغەدە | ١٣ دینار |
| ٤ – ماڵ لە ورمێ | ١٣ دینار |
| ٥ – ماڵ لە بەغدا | ٣٠ دینار |
| ٦ – ماڵ لە سولەیمانی | ٢٢ دینار |
| | ١١٢ دینار |

٤ – وەسایلی حەمل ونەقل وهاتو چۆ

| | |
|---|---|
| ١ – چوار ئێستر | ١٨٠ دینار |
| ٢ – دە ئەسپ بەزینەوە | ٣٦٠ دینار |
| ٣ – ترومبیلی جیب دوو دانە | ٩٠٠ دینار |
| ٤ ــ ترومبیلی لۆری دوو دانە | ١٧٠٠ دینار |
| | ٣١٤٠ دینار |

٥ – ئیجارەی سالیانەی لادێ یەکان بۆ مۆلگەی حیزبی لە ناو لادێ یەکاندا

١ – دێی «سالوک» بانە ١٨٠ دینار

٢ - دێی « ڕەفتە » مەهاباد مەتکوڕ ٩٠ دینار

٣ - دێی « گانی زەرد» خانی لاجان ٢٣٥ دینار

٤ - دێی « مۆڵەنی » خانی پیران ٢٧٠ دینار

---

٧٦٥ دینار

دوای ئەم ڕیزە داواکاریانە لە سەرۆک بارزانی. ئەحمەدتوفیق ڕیزە داخوزی یەکی دیکەشی بە زمانی فارسی نووسیوە و داویە بە سەرۆک بارزانی. ئەمەش دەقی داخوازیەکانە: ٥٩/١/٧

١ ) ٩ نفر کادر مجرد ازقرار هرنفر ٧ دینار

٢ )٣ نفر کادر مجرد از قرار هرنفر ١٠ دینار بسبب زندگی درتهران وکرمانشاه

٣ ) ٣ نفر کادر باعائله ازقرار هرنفر ١٤ دینار

٤ ) ١٢نفر کادر با عائله کم و متوسط از قرار هر نفر ١٠ دینار

٢٨ نفر ١٦٥ دینار

( الف ) احتیاجات فوری ما از نقطه نظر مالی

١ )ماهیانه حقوق ٢٨ نفر کادر حرفەای (مستمر) ٢٦٥ دینار

٢ ) اسلحه گرم ١٣٧٢ دینار

٣ ) ماهیانه نگهداری خانەهای حزبی در شهرها ١١٣٠دینار

٤ ) ماهیانه کمگ فوق العاده در سال ٩٥ مستمر ١٠٠ دینار

٥ ) وسایل حمل و نقل و امد وشد ٢١٤٠ دینار

٦ ) اجاره برای پایگاه حزبی دردهات ٧٦٥ دینار

---

٤٧٥٦ دینار

( ب ) مستمر ماهیانه

١ ) حقوق ٢٨ نفر کادر حرفەای ١٦٥ دینار

٢ ) خانههای حزبی در شهر    کمگ مستمری ١٠٠ دینار
کمگ فوق لعاده برای سال ١٩٥٩

١ ) اسلحه ١٠ قبضه تفنگ برنو پیاده و ١٥ طپانچه    ١٣٧٢ دینار
٢ )وسیله حمل ونقل ٢چیب...یالوکامیون باری    ٢١٤٠ دینار
٣ ) اجاری پایگاههای حزبی دردهات    ٧٦٥ دینار

---

٤٢٧٨

نووسراوەی داخوازی یەکانی کاگ ئەحمەد توفیق لێرەدا تەواو دەبن . ( ٣ )

له بەر ئەوەی عبدالله ئیسحاقی (ئەحمەد توفیق )له سالەکانی ١٩٥٨وه که بارزانی ئەمر پشتی دەگرێ و دەیکابە حیزب و ئەویش بە پشتیوانی بارزانی تا سالی ٦٩ بە ناوی کومیتەی ناوەندی و سکرتێری کومیتەی ناوەندی و نوێنەری کومیتەی ناوەندی لە کوردستانی عیراق فاعل موختار بوه و کۆنگرەی حیزبی گرتوه و ئەندامی حیزبی دەر کردوه و کوشتومیەتی و لە هەموو کارەکانیشی جێگای بروای شەخسی بارزانی ئەمر بوه و بە داخەوه نە حیزبی دیموکرات و نە هاوکار و هاو بیرەکانی ئەو دەمی هیچیان لە سەر نە نووسیوه و باسیان نە کردوه . بۆیە بە پێویست زانرا کە لە ڕێگای هێندێ نووسراوەکانی خودی کاک ئەحمەدەوه ناوی بێتەوه ناو نێوان و ئەندامانی حیزب و خوێنەرانی بە ڕێز تا رادەیەک لە کە سایەتی و چالاکی و هەلوێست و شێوەی ڕێبەرایەتی ناو براو لەو ماوەیەدا ئاگادار بن.

نامەی ئەحمەد توفیق بۆ سەرۆک بارزانی ١٩٦١/٥/٣١

ماموستای خۆشەویست وبەڕێز کاکە « شەریف »: زیاتر لە پێنج مانگە کە لە دیدارتان بێبەشم. جا بۆیە بە هەلی دەزانم باشتر سلاوی کوردانەتان پێشکەش کەم. وە لە بارەگای خوای تەعالا ساخی و سەر بەرزی خودان و ئێوە داو خوازی کەم. نەک من بەلکو ئەوانەی ئاواتە خوازی ساخی و سەر بەرزیتانن هەموو کوردی خاوەن شەرەف و هەستن. چونکو بڕیارە لە بەغدارا بگەڕێمەوه دەگەل هاورێکانم

بینینە خزمەت جاب ویە زۆری درێژە پێ نادەم. بە کورتی کابرای ئاشنامان بە هۆی کاکە عبیداللە و کاک سەید عزیز بە پەلە ویستبوومی. هاتم دیتم. زۆری وت لە دیداردا بۆتان دەگێڕمەوە. پاشی سالێ سلامالێ. بە دوای چەند سالدا وا ۳۵۰ دیناری قەرزی ئێوەی دا بەمن. وا بە هۆی هەلگری ئە نووسراوە پێشکەشە. دیارە ئەوەی دابوو بۆوەی کە من و باب و براکانم کاسبی و معامەلەی پێ وە بکەین. بەلام من وام بە باش زانی کە دەگەل براکانم دێینە خزمەتت. ئێوە هەر بە ناوی خۆتان ئە ودراوە بە قەرز بە ئێمە بدەن. من وام پێ پەسند و باش بوو. دوایەش هۆیەکەتان عەرز دەکەم.

ئەوەندەش ئاگادار بن کە من و هاورێکانم بۆ هێندێ ئیختلافی فکری لە سەر ڕێ ڕەوی حیزب دێینە خزمەتتان. دیارە بۆ زۆر کاری تریش. زۆر پەسند بوو بە حورمەت زۆر ڕێز لە برادەران بگرن چونکو زۆر لاون و حورمەت ئەویش ئی ئێوە لە سەر روحیەیان زۆر تەئسیر دەکا. بۆ وەی کە بە کورتیش لە جەرەیان خەبەردار بن «قادر حسن» کەوتۆتە سەر بار و باوێکی خوار و نیزیکی لە شیوعیەکان دەکا و بە نووسراوە شتی بۆ نووسیون. زۆر پەلە قاژەی کرد تا هاورێ کەمالیشی لە لەگە برد. ئێستا ناوبراویش زۆر بە چەپو چەوتی بیر دەکاتەوە. بەلام سەردرای ئەوەش زۆر لە بار بوو لە هاورێ کەمال ڕێز بگرن چونکو ئەو زۆر رابردوو خاوێن و پاک و خاوەن شەرەفە. ئەوەش بزانن کە « قادر حسن» * مان ئێستا وەلاناوە و

---

بۆ زانین «قادر حسن » هاشمی حسین زادەیە کە ئەحمەد توفیق لە نامەی سازکردنی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان دا ناوبراوی بە «کادری مخفی و حرفەای حیزب و بە مشاوری کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ناساندوە» بەلام لە نامەی سەرۆک بارزانیدا دەنووسێ : کەوتۆتە سەر بارو باوێکی خوار و نیزیکی لە شیوعیەکان « ئەم دابە دزێوە لە حیزبی دیموکرات دا، تا ئێستاش درێژەی هەیە. نیزیکی لە کومونیست و بیرو باوەری مارکسیستی. چەکی تاوان و بوختانە بە دەست کۆنەپەرستەوە.. «...کاک قاسمی سولتانیان و کاک هاشمی حوسێن زادە وەک کومیتەی کاتی لە گەل کاک ئەحمەد بوون. بەلام بیرو بۆ چوونیان لە گەل بەشێک لە کادرەکان بوو. هێشتا بەلایەکدا ساغ نە ببوونەوە. رۆژی وابوو دەبوونە کۆپالی ئەحمەد توفیق. رۆژی واش بوو دەهاتن لە لای کادرەکان دەمانەوە و نە دەچوونە لای ئەحمەد توفیق. کاتێکیش بە دوایدا دەناردن خۆیان نەدەگرت. نەیان دەوێرا بێ قسەیی ئەحمەد توفیق بکەن ...» (٥)

له کاراندا تداخلی نادەین و ئەگەر بێین بۆ خزمەتتان ناوبراو مان لە گەڵ نابێ. هیوام وایە ئەو دراوە بە جێگای ئەو دراوەی کە قەولتان دابوو بمان دەیەی دای ئەنێی. وا بزانم پەسندە کە هاتین بۆ لاتان باس لە سەر ئەم نووسراوە نەیەتە گۆڕێ باشترە. بە تایبەتی لە سەر دراوەکە چونکو من لە لای برادەران دەڵێم کابرای ناشناسمان گوتوویەتی ئێوە دەبێ ماموستا شەریف ببێتن. ئیتر دەستی بەرێزی مەزن خودان ماچ ئەکەم و ساخی و سەر بەرزی لە خوا داخوازم. بە حورمەتەوە. احمد کویستانی ۹۶۱/۵/۳۱» (٤)

وەک لە کردەوە و لە نووسراوە و چالاکیەکانی ئەحمەد توفیق دەر دەکەوێ، تەواوی ئەو ئەندامانەی حیزبی دیموکرات کە کەوتوونە بەر قین و غەزەب و لە سەر نووسین و دەرکردن و تەنانەت کوشتنیش وەک( ئەسعەدی خودایاری ئەندامی تێکۆشەری حیزبی دیموکرات) بەلای ئەحمەد توفیقەوە، تاوانیان« بیرکردنەوەی چەپ و نیزیکی لە شیوعیەکان و هاتو چۆی نژاد و هەمزە عبداللە و درنگتر نیزیکی لە مەکتەبی سیاسی پارتی و....» بوە. بەلام لە گەڵ ئەوەش بە ناردنی نامەی پیرۆز بایی بە بۆنەی جێژنی ئوکتوبر بۆ یەکێتی سۆڤیێتی پێشوو هەولی داوە کە وەری بگرن بەلکوو بچێتە سوڤێت و کەولی پێشکەوتنخوازی بەخۆ دابدا، ئەمەش نامەکانیەتی بۆ رێبەرانی سۆڤێت.

« هاوری یانی خۆشەویست کومیتەی ناوەندی حیزبی کۆمونیستی یەکێتی سۆڤێتی

پاش پێشکەش کردنی سلاوی هاورێ یانە. باشترین پیرۆزبایی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە بۆنەی جێژنی مەزنی شۆرشی ئوکتوبر، سەر فەسڵی تازە و نوێی ژیانی زەحمەتکێشانی جیهان، سەرکەوتنی توانا و گەورەیی شوراکان بە سەر دەزگای گەندەڵی قەیسەر و بورژوازیدا. بە ئێوە و لە رێگای ئێوەوە بە هەموو نەتەوەکانی یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤێتی سوسیالیزم پێشکەش دەکەم. نەتەوەی کورد کە نەتەوەیەکی زۆر لێکراو و بێ بەشە زۆر باش گەورەیی و گرنگی شۆرشی مەزنی ئوکتوبر و ئازادی و رزگاری نەتەوەکانی

قارەمانی سۆڤیتی هەست پێدەکات. بەم بۆنەوە بە پێویستی دەزانم کە شادی و خۆشی نەتەوەی کورد لە کوردستانی ئێران و بە تایبەت ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە بۆنەی هاتنی جێژنی مەزنی شۆرشی ئوکتوبر دەر بخەم و پێشکەشتانی بکەم. شادین بە وەی کە رێبەری خەباتی نەتەوەی کورد هاوری مستەفا بارزانی بە ناوی نەتەوەی کورد لە جێژنی مەزنی نەتەوەکانی سۆڤیتی دا بەشداری دەکات.

پیرۆز بێ جێژنی شۆرشی مەزنی ئوکتوبر.... سەرکەوێ یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیتی سۆسیالیستی قەلای قایم و لە رووخان نە هاتوو..... سلاوی نەتەوەی کورد بۆ نەتەوەکانی سۆڤێت دۆستی بە ئەمەگی هەموو نەتەوەکان.

بژی ئاشتی بەر دەوام . دیسان پیرۆز بایی وریز.» لە لایەن کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان ،عبداللە اسحاقی «زاگروس»
١٩٦٠/١١/١٠ (٦)

نامەی عبدالله اسحاقی « ئەحمەد توفیق »

« هاوری یانی خۆشەویست ، کومیتەی ناوەندی حیزبی کۆموونیستی یەکێتی سۆفێتی.

بەم بۆنەوە سلاوی هاوری یانەی خۆمان پێشکەش دەکەین.

بە دوای نامەی پێشووی خۆماندا کە لە رێگای هاڤالانی ئێوە لێرە( ) لە بارەی سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی ئێمە بۆ یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤێتی سۆسیالیستی پێشکەش کرا، روونکردنەوەی چەند خالێک بە پێویست دەزانین

. الف - ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتی پاش راوێژ بەم جۆرەیە:

١ - قاسم سلطانیان لە عیراق بە (کەمال ئەحمەد) ناسراوە

٢ - سلیمان معینی

٣ - عبدالله اسحاقی لە عیراق بە ( ئەحمەد توفیق) ناسراوە

تکامان ئەوەیە لە حالەتی جێبەجێ بووندا، ڤیزا بەو ناوانەی سەرەوە بن.

ب - زۆر باشتر و بە دەرفەتی دەزانین پێکهاتنی سەفەری دەستەی حیزبی بکەوێتە ئەو دەمە کە مستەفا بارزانی ڕێبەر لە یەکێتی سۆڤێتی بێ.

ج - سەبارەت بەو هەداری لە ڕادە بەدەری حیزب پێویستیمان بە لانی کەمی یارمەتی مالی بۆ ئەم سەفەرە هەیە.

لە گەڵ سڵاو و ڕێز. لە لایەن کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان. عبدالله اسحاقی« زاگروس»١/١١/ ١٩٦٠»(٧)

# خەباتی چەکدارانەی کوردستانی عیراق
# وتەئسیری لەسەر رۆژهەلاتی کوردستان

سروشتی جوغرافیایی کوردستان، هەستی نەتەوایەتی و هاوپێوەندی نەتەوەیی و زمان و کولتور و ئابوری و ژیان و نەریتی بەشە لێکدابراوەکانی نیشتمانی کورد، سەرەڕای داتاشینی سنووری دەستکردی ئیستعماری و داگیرکەرانە، کارێکی وایان کردوە کە رووداو و کارەساتی هەر یەک لە بەشەکانی کوردستان، کار دەکاتە سەر بەشەکانی دیکەش و زۆر یا کەم شەقلی خۆی لە سەر کۆمەلی کوردەواری دا دەنێ.

خەباتی چەکدارانەی خوارووی کوردستان ١٩٦١ و شوێنەوارەکانی لە سەر بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستانی ئێران لە دوو لاوە، یان لە دوو بارەوە پێویستیان بە شیکردنەوە و لێکدانەوە هەیە. لایەنێکی سەبارەت بەم فاکتەرانەی باسکراو، بریتی یە لە وریا کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی خەلکی رۆژهەلاتی کوردستان . دلسۆزی و نیشتمانپەروەری و هاودەردی. ویستی کۆمەلانی خەلکی ئەم بەشەی کوردستانی بۆ یارمەتی دان بە راپەڕینی خوارووی کوردستان هاروژاند و هەر لە سەرەتای دەستپێکی راپەڕینی ١٩٦١وە تا ئێمڕۆ کوردەکانی کوردستانی ئێران لە کات و دەم و قۆناخی ئاستەنگ و دژوار دا ئامێزیان بۆ پێشوازی و حاوانەوە و یارمەتی ئاوارە و لێقەوماو و چەکدار و تێکۆشەرانی خوارووی کوردستان والا کردوە و دەستیان لە هیچ یارمەتی و هاو دەردی یەک نەگێڕاوەتەوە.

لایەنەکەی دیکە بە داخەوە راست پێچەوانەی ئەوە لە سیاسەت و کردەوەی

ڕێبەرانی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو دا ڕەنگی داوەتەوە. لە دەستپێکی خەباتی چەکدارانەی ١٩٦١وە، تا ئیمڕۆ کە ئەم دێڕانە دەنووسمەوە، سیاسەت و کردەوە و ئاکار و هەڵویستی هێندێ لە ڕێبەرانی بزووتنەوەی چەکداری خوارووی کوردستان، بە بێ لە بەر چاو گرتنی داب و نەریتی هاو نەتەوەیی و هاونیشتمانی و هاوخەباتی لە گەڵ کوردەکانی کوردستانی ئێران بریتی بوە لە دەست تێکەڵکردن لە گەڵ حکوومەتگەلی دیکتاتۆر و کۆنەپەرست و کورد کوژی ئێران. ئەنجامەکەی بۆتە گرتن و ڕاونان و کوشتن و تەحویلدانەوەی ئازادیخوازانی کوردی کوردستانی ئێران و ساز کردنی تاقم و دەستەی جۆر بە جۆر بۆ لاوازکردنی خەباتی نیشتمانی کوردستانی ئێران و بە تایبەت دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. ڕێگا دان بە جاسوس و بەکرێگیراو و پیاو کوژانی حکوومەتی تاران بۆ ڕەشە کوژی و کوشتنی ئازادیخوازانی کوردی کوردستانی ئێران لە بەر چاو و لە ژێر دەسەڵاتی نا نیشتمانی هێندێ لە ڕێبەرانی کوردستانی خوارووداـ لە بەر ئەوەی نووسینەکەی من ڕووداوەکانی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان دەخاتە ژێر نووکی خامە و لە بەرنامەی دا نیە جارێ بێتە سەر باسی ڕووداوەکانی خوارووی کوردستان، ناچار بە وەندە ڕوونکردنەوە تا لە لەم باسە لادەدەم. چونکە لە خوارووی کوردستان لە سەردەمی بە ڕواڵەت دەسەڵاتی حکوومەت و پارلەماندا لەگەڵ کوردەئازادیخوازەکانی کوردستانی ئێران وتەنانەت لەگەڵزەحمەتکێشانی کوردلەکوردستانی خواروشدا کراوە ئەوەند داخدار و بە ئێش و ئازارە و ئەوەندەش زۆرە، قەت لە نووسراوەیەکی ئاوادا جێی نابێتەوە.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە هەرچی دژی بەرژەوەندی بزووتنەوەی کوردستانی ئێران کراوە، هەمووی لە ژێر دروشمی ( کوردایەتی ناڕەسەن وبەرژەوەندی ڕۆژئاوای (دیموکراسی وحکوومەت وپارلەماند) ئەنجامیان داوە وبەدڵی دوژمنی نەتەوەیی کورد هەڵس وکەوتیان کردوە. توێڵێی ڕۆژێک بێ ئەو حیزبانە خۆیان و یا نووسەرێکی بوێری سەر بەوان بەدان پێداناانی هەڵە و خەراپە و تاوان دژی بزووتنەوەی کوردستانی ئێران گرانایی ئەم بارە قورسە تۆزێ لە سەرشانیان

سوک بکەن و ئەم پەڵە رەشە لە داوێنیان بسڕنەوە و یا لانی کەم روناکبیرانی ئەم بەشەی نیشتمانی لەتو پەت کراو بە سەر ئەم سیاسەت و کردەوە چەپەڵانەدا بچنەوە و مەحکومی بکەن؟

لە ساڵەکانی ۱۹٦۳-۱۹٦٤ جگە لە ئاوارەکانی ئەندامی حیزبی دیموکرات کە ساڵی ۱۹۵۹ لە چنگی ساواک دەرباز دەبن و خۆ دەگەیێننە خوارووی کوردستان، هێندێکی تر لە خوێندکارانی کوردی زانستگای تاران و رووناکبیرانی ئازادیخواز کە دەکەونە بەر هێرش و راونانی ساواک، رادەکەن و خۆ دەگەیێننە بە رواڵەت کوردستانی ئازاد. ئەوانە بە بیرو باوەڕێکی ئازادیخوازانە و بە هیوای بە هێز کردنی رێکخراو و رێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان روو دەکەنە مەڵبەندی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو بەو هیوایە بتوانن لەم بەشەی نیشتمان و لە ژێر داڵدە و سێبەری بزووتنەوەی نیشتمانی کورد و ئاڵا هەڵگری دروشمی کوردایەتی دا وەحەسێن و بە گوێرەی توانا خەباتی خۆیان درێژە پێبدەن و هەر لەو کاتەشدا، ئەوەی لە توانایاندابێ، یارمەتی بە برایانی راپەڕیوی کوردستانی خواروو بکەن.
بەڵام بەداخەوە ئەوەی (بە بۆنیەوە چوو بوون وانەبوو کەبیریان لێکردبۆ وە.)
ئەو رووناکبیر و ئازادیخوازانە لە کوردستانی گەرمێن جگە لە بارو دۆخی نا لە باری نێو بزووتنەوەی چەکداری کوردستان، لە گەڵ ناتەبایی و بێ سەرە و بەری رێکخراوەیی و تەکڕەوی عبداللائیسحاقی روو بەروو دەبن. وەک پێشتر باسکرا، نا و براو نەک هەر گوێ بۆ راو راوێژ و بۆ چوونی کادر و ئەندامانی پێشکەوتوو خواز شل ناکا، بەڵکوو بە پشت ئەستووری سەرۆک بارزانی رێگای گرتن و چەک کردن و کوشتنی هاوڕێیانی و ئەندامانی حیزب دەگرێتە بەر. «... ........ کە من دەڵێم ئەحمەد توفیق دەستی دەرۆیی و کەس توانای بەربەرەکانی نە بوو. وابیرمەکەنەوە ناو براو شێر و تیری پێ بوە، بۆیە لێی ترساون. ترسان لە ناو براو دەست رۆیشتن بوە. پێشتر باسم کرد کە ئەحمەدتوفیق بە هۆی پێوەندی لە گەڵ دەزگای عیراق و پشتیوانی مەلا مستەفا هەر کەس دژایەتی کرد با یان دەگیرا. یان لە عیراق دەر دەکرا، ترسی تەسلیم کردنەوە بە ئێرانیش لەولا راوەستێ.» (۸)

# کۆنگرەی دووەمی حیزبی دێموکرات و تەشەنەی ناکۆکی نێو حیزبی

هەوڵ و تەقەلای ئەندامانی دڵسۆز بۆیەکێتی وتێگەیشتن وپێکهێنانی ڕێبەرایەتیەکی ڕێکو پێک و شەرعی تەنانەت لە ڕێگای پەنا بردنە بەر سەرۆک بارزانیشەوە فایدە نابەخشێ. ناچار چەند کەس لە کادرەکانی حیزب بە ناوی (کومیتەی ساخکەرەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان)ل بەیاننامەیەکدا لادان و سەرە رۆیی ئەحمەد توفیق روون دەکەنەوە. دوای ئەوە ئەحمەد توفیق بە پشتیوانی بارزانی دەست دەکا بە چەک کردن و راونان و بەگرتن دانیان. دامەزرێنەرانی کومیتەی ساخکەرەوە سەر لە نوێ تووشی هەلات هەلات و دەربەدەری دەبنەوە. ئەگەر لە پێشدا ئاوارەی دەستی ساواکی حکوومەتی تاران بوون، ئەمجارە لە بەردەستی ئەحمەد توفیق و چەکداری بزووتنەوەی کوردستانی خواروو دەبوایە راکەن و خۆ بشارنەوە. بڵاو کردنەوەی کومیتەی ساخکەرەوە و فشاری خوێندکار و روناکبیرانی تازە هەڵاتوو ئەحمەد توفیق وا لێدەکا کە چەند کەسێک کۆ بکاتەوە و سەرو سامانێک بە وەزعی پەرێشانی حیزب بدات. چونکە بە راستی بە پێچەوانەی فیشاڵ و حکایەتی هێندێ کەس حیزبی دیموکرات بێ کومیتەی ناوەندی و بێ پێرە و و پرۆگرام و بێ تەشکیلات هیچی بە سەر هیچەوە نامێنێ. «.....حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر بە نێو ما بوو. نە تەشکیلات و نە کومیتەی ناوەندی و تەجولانەوە و نە نووسین... وەک حیزبێکی هەڵسوڕ هیچ ناسارێکی دیار نەبوو. دەبوایە هەموو شتێک لە نووکەوە دەست پێبکرێتەوە.»(٩)

بۆ قەرەبو کردنەوەی ئەم قەیران و شپرزەییە ئەحمەد توفیق بە ئیجازەی

سەرۆک بارزانی دەکەویتە سەر بیری کۆنگرە ساز کردن. هێندێ لە کادر و ئەندامانی حیزب و تەنانەت چەند کەس لە ئەندامانی کومیتەی ساخکەرەوەش دەخوازن بچن و لە کۆنگرەدا بەشداری بکەن. بەلام چەکداری ئەحمەدتوفیق پێشیان پێدەگرن و ڕێگا نادەن بچنە شوێنی کۆنگرە.

ڕۆژی دەستپێکی کۆنگرە دیار نیە. بەلام بە گوێرەی دەقی بەیاننامەی کۆنگرە وا دەردەکەوێ لە مانگی سەرماوەزی ١٣٤٣ی هەتاوی، نوڤەمبری ١٩٦٤ زایینی کۆنگرە گیراوە. لە بارەی پێکهاتنی کۆنگرە و بڕیار و سیاسەت و ڕێبازی. هێندێ حکایەت و وردە نووسراوە لێر و لەوێ بلاو بوونەوە کە ناکرێ وەک بەلگەو دۆکۆمێنتی بڕوا پێکراو پشتیان پێ ببەسترێ. بۆ ڕوون بوونەوەی هەلویست و سیاسەت و بۆ چوون و رادەی تێگەیشتوویی بەرێوە بەرانی کۆنگرە و نووسەرانی بەیاننامەی کۆنگرە و هەر وەها بۆ ئاگاداری بەەری تازە پێگەیشتووی کورد باشترە دەقی بەیاننامەی کۆنگرەی دووهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان بلاو بکەینەوە. با ئەوەش بلێم کە رێنووسی بەیاننامەکە دەستکاری کراوە و هاتۆتە سەر شێوەی ڕێنووسی ئیستای کوردی. ئەویتر لە باری رێزمان وزاراو و دارشتنی دەستی لێ نەدراوە و هەروەک خۆیەتی. ئەمەش دەقی بەیاننامەی کونگرەی عبدالله ئیسحاقی یە:

## «بەیاننامەی دووهەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان

دووهەمین کۆنگرەی ح.د.ک لە مانگی سەرماوەزی ١٣٤٣لە ژێر سێبەری ئالای شۆرشگێرانە و دروشمی یەکێتی، خەبات، سەربەخۆیی و دیموکراتی لە نێوان لوتکەکانی چیای زاگرۆس دەستی پێکرد. لە سەرەتا نوێنەرانی کۆنگرە پاش خوێندنەوەی سرودی( ئەی رەقیب)بۆ بیرەوەری ڕۆژانی دیلی و کۆیلەتی هەڤالانی کە لە کۆت و زنجیری ئیستیعمار و نۆکەرەکانی شا و حکوومەتی تاراندا بەخسیرن. لە گەل بردنی نێوی یەک یەکیان رەشاش و تفەنگی پێشمەرگەکان دل و

دەروونی سووتاوی دۆل و چیاکانی دەزرینگاندەوە و رابردووی خوێناوی و بەربەرەکانی پڕ لە شانازی ح.د.ک.ی وە بیر دەخستەوە.

نوێنەرانی کۆنگرە هەر کامیان لە جێگایەک لە ژێر مەترسی گوللە و سەر نێزەی دوژمن بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەری خۆیان دەر باز کرد بوو، وە بە نێو یەکتریان نە دەناسی، لەهجە و بەرگ و پیشەیان یەک نەبوو بەڵام هەموو تێکڕازمان و ئاوات و دڵ و دەرونیان یەک بوو.

ئەو کۆنگرەیە لە مێژووی خەباتی کوردستان بۆ هەوەڵین جار بە شێوەیەکی تایبەتی و بە نهێنی و بە گورج و گۆڵی و ژیری و سەر بەرزی دوور لە چاوی پیس و گڵاوی حکوومەتە بە کرێگیراوەکانی رۆژ هەڵاتی ناوە راست پێکهات. بە داخەوە پێویستە بڵێین هێندێک لە هەڤاڵان دە بەندیخانەدا بوون و بەشێک لە نوێنەران لە بەر فشار و کۆسپەی دوژمنان نەیانتوانی لە کۆنگرەدا بەشدار بن. سەرەتای وتو وێژی دەستوری کۆنگرە بە (تەلاوەتی ئایەتی انافتحنالک )لە لایەن ماموستایێکی ئایینی خەباتکەر و کۆڵنەدەر دەستی پێکرد. لە پاشان یەکێک لە هەڤاڵانی بەرێوەبەر مێژووی ١٩ساڵەی خەباتی خوێناوی و پڕ لە ئازاری ئەندامانی ح.د.ک بە راپۆرتێکی هەمو لایەن و بەرین پێشکەش بە نوێنەرانی کۆنگرە کرد.

رابردووی ح.د.ک. لەکاتی جەمهوری کوردستان

لەو رۆژەوە کە ئاڵای خەباتی حیزبی دێموکرات پێچراوە دوژمنی نەتەوەی کورد و نەتەوەکانی ئێران یانی دارو دەستەی شا و ئیستیعمار توانای ئەوەیان نەبوو کە سینگی دیکتاتۆری و زۆرداری لە سەر سنگ و ملی ئێمە داکوتنەوە. بەڵکوو ناکۆکی و نا رێکوپێکی ناو خۆی حیزب لە ساڵی هەوەڵی دامەزرانی و کەم فامی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەرێوەبەرانی ئەو کاتی حیزب بۆراکێشاندنی کۆمەڵی وەرزێران و رەنجبەرانی تری لادێکان کە ئۆردووی بنچینەیی شۆرش ئەژمێردرێن و هەروەها هێنانە سەرکاری دەرەبەگ و فئۆدالەکان و بەشدار بونیان لە ناو کومیتەی ناوەندی حیزبدا و زاڵ بوونیان لە سەر جوتیار باعث بوو کە حیزب و نەتەوەکەمان لە مەڕ رێکو پێکی بناخەی شۆرشی رێگای بێ باوەری و نا لە باری

و لا لوتی بگرێته بەر.

سەرانی ح.د.ک. لە ساڵی ۱۳۲٥دا کە لە پشتیوانی ئۆردووی شۆرشگێڕی وەرزێر بێبەری بوون لە سەر بناخەی کۆمەڵایەتی پێی خۆی نە چەقاند بوو. هۆیەکانی بنچینەیی ئەو کایە بە دۆڕاندنی هەل و هەلکەوتی زۆر مێژوویی و پڕ دەسکەوت دەچوە سەر کاڵی و بێ تەجروبەیی بە رێوەبەران و پەروەردە و قالبوونیان لە ناو کوڕی تێکۆشان و خەباتی بەر دەوامی حیزبایەتی بوو. هەڕەشە و گوڕەشەی شا و ئەربابەکانی لە لایەکەوە قەول و قەراری چڵکاو خۆر وئۆکەرە کانی بەد فەڕی ئیستیعمار لە لایەکی ترەوە شوێنە ونکەی لە رابەرانی حیزب کرد بوو، بە سەر سوڕ ماوی و داماوی خۆیان تەسلیم بە سیاسەتێکی قەزاو قەدەرکرد.

ئەو بابەتە راستبوو کە ئەگەر یارمەتی و پشتیوان لە ناو دا نە بایە حکوومەتی خوێنڕێ و چڵکاو خۆری تاران بە دوو قۆڵی لە گەڵ ئیمپریالیزم زووتر لەوەش هێرش و شالاوی بۆ سەر جەمهوری کوردستان و ح.د.ک. دەهێنا. سەرانی حیزبی دیموکرات نە تەنیا لەو هەل و دەرفەتە بە رێکو پێکی ناو خۆو پتەوی دەولەت و قایمکردنی بناخەی لەشکری چەکدار و هێزی پێشمەرگە سودیان وەر نەگرت بەڵکوو لە بەر سەرینی خاتر جەمی پاڵیان دابۆوە و پێیان وابو و کە بێشکەی شۆرش هەتا هەتایە دەبێ بە دەست وان رابژێ. لە لایەکی ترەوە، رابەرانی لای تر بە هۆی راوێژکەرە لێنەزانەکانیان وایان ئەزانی کە ئەو «کۆرپە ساوایە» پێی هەڵگرتوە و ئەتوانێ ماف و ژێر پێی خۆی بپارێزێ.

بێخەبەر لە وەی کە ئەو مەلۆتکەیە لە بێشکەدا ئاسا بوو. هەر وەکی خۆشیان لە کاتی پێویستی بە پشتگیری پشتیان لەو مەلۆتکەیە تاساوە کرد و خۆیان خستە خەوی کەروێشکی. بە بەرچاو خستنی ئەو بابەتانەی سەرەوە پێویستە بە داخەوە ئیقرار بکەین پێش ئەوەی کە دوژمنی خوێنڕێ ئامادەگی پەیدا بک و توانایی تێکشکاندنی گەلی کوردی هەبێ سەرانی حیزب و کار بەدەستانی جەمهوری کوردستان مەیدانیان ب وەهەلکوتانە سەر نەتەوەی کورد لە ناو دەولەت و حیزبدا خۆش کرد بوو و هۆرەیان لە خۆمان بۆ قەڵشاندن و تێکدانی خۆمان سازکرد بوو.

تا گەیشتە رادەیەک کە دەستە و ئەژنۆ لە دوژمن راما بووین کە چمان بە سەر ئەهێنین وە کەی دوچاری چەرمەسەری و چارەرەشی ئەبین. لە کۆنگرەدا لێکدراوە کە کەم و کورتی خەباتی حیزب لە رابردوو و دەورەی حکوومەتدا ئەوە بوو کە سەرانی ح.د.ک. لە نێوان بەربەرەکانی «پارلمانتاریزم» و شۆرشی چەکدارانەدا دامابوون. لە لایەکەوە لە «مەجلیسی شورای ئیراندا» نوێنەری هەبوو کە لە «تریبوون» نەک بۆ هەڵگیرساندن و خۆشکردنی ئاگری شۆرش لە ناو دڵ و مێشکی خەڵک کەڵکی وەرنەگرت بەڵکوو زیاتر لە مەر تەئسیر و نفوزی خەباتی پارلمانی حیزبەکانی تاران بۆ دامرکاندنی بڵێسەی شۆرش چار و بار راوێژ دەکرا.

تەواوی ئەو چەک و چۆلانەی کە دەبوایە لە خزمەتی شۆرش بە کار هێندرابایە و بۆ پاراستنی حکوومەت و گیان و ماڵی نەتەوەکەمان هەڵسورابایە و لە رۆژی پێویستدا بێ سود و کەلک کەوتە دەست حکوومەتی تاران دوژمن و داگیر کەری ولاتمان. دیارە حیزب لە سەرە تادا لە کاتی خۆی دەیتوانی کە هەردوو لای خەبات یانی پارلمان و چەکداری وێکرا بگرێتە پێش و بە ژیری و وریایی لە تەواوی هەل و فرسەتە پێشهاتوەکان سود وەربگرێت وە فریو نەخوا. بەلام لە پێش ئەو کارە د ح.د.ک. ئەبوایە لەشێکی ساخ و بیرو راوێژێکی تەواو شارەزا و تێبینیەکی گرنگی لە مەر نەتەوەی خۆی و دوژمنەکانی هەبا. لە دنیای ئەو رۆژدا مرۆڤ دەکرێت هەم «خودای بوێ و هەم خورما» بەلام لە پێش ئەم ئاواتەدا لە سەری پێویست و فەرزە کە خۆی بناسێ و خودا و خورماش بناسێ تا بەتامی شیرینی خورما خۆی لێ نەگۆرێ و بە هەڵە نەچێ بە بردنی ناوی خودا خۆی تەفروتونا و خەڵکیش بە فریو نە بات. کورتی و کەم و کوری کەورەی خەباتی ح.د.ک. ئەوە بوو کە لە خەباتی چەکدارانەی «سمکۆ»، قەدەمخێر و هتد دەرس و سەر مەشقی وەر نەگرت. شێوەی زیندو و نەمری ئەو قارەمانانەی رێگای رزگاری و خەباتی بێکەڵک و سود هێشتەوە.

لەمەر تەسلیم بەدوژمن وهاتنەوەی سوپای داگیرکەر

هەر وەها کۆنگرە هاتە سەر باسی کشانەوە و تەسلیمی بێ قەید و شەرتی

حکوومەتەکانی کوردستان و ئازەربایجان کە کاتی خۆی حیزبی دیموکراتی قوام السلطنە لە گەڵ زۆر لە کاربەدەستان و خاوەن بیر و باوەڕ پێکراوانی سیاسی و حیزبی لە تاران قەرار و مەداریان بەستبوو وە بە چوونی قەوام بۆ موسکۆ و کۆبوونەوە دەگەڵ ستالین و دەورو بەرەکەی ئەوێ رۆژێ بە دەلیلی داتاشراو بڕینی خەڵکیان بەوە سارێژ دەکرد گۆیا ژێ ڕێێ خستنی چارەنووس و رەنج و کوێرەوەری نەتەوەکانی کورد و ئازەربایجان بۆتە قوربانی ئازادی گەلی چین.

لەو لاشەوە حیزبی تودەی ئێران و دەستەکانی میللی تر کە پێشوو بە زمان و قەڵەم و قەول و قەرار پشتیوانیان لە بزووتنەوەی رزگاری خوازانەی دوو نەتەوەی کورد و ئازەربایجان دەکرد تەنانەت بە جوڵانەوەی ئازادی ئێرانیان ناو دەبرد ویستیان بەو دەلیلە پڕو پوچانە خۆ حاشا دەن وەک کەو سەریان دە بەفر کرتبوو و لەشیان بە دەرەوە بوو دەیانویست ئەو راستیە بشارنەوە کە لەو کاتەدا تەواوی هێزی رەش و بەدفەڕی شا-ئیمپریالیزم و دوژمنە سوێند خورەکان کلکیان لێک بەستبوو لە تارانەوە بە دڵنیایی روویان کردە کوردستان و ئازەربایجان و ئەوانیش لە جیاتی بەربەستی لە پەلاماری ئەو دوژمنە هاو بەشیەبکەن. وە یالانی کەم لە پشتی جەبهە زەربەتی قورس بە شێوەی تێکدەرانە و سابوتاژ لە دوژمن بدەن خۆیان خستبوە گوێی گاو چوونە ناو خەوی سەرە مەرکەوە بەو مانایە مرتەقیان لە خۆیان بڕیو هەتا بە ناوی نا رەزایی بیرو باوەڕی «شۆڕشگێرانە و دیموکراتیانەیان» دەر نەبڕی. بەو جورە لەو دەمەوە تا ئێستا شا و ئیمپریالیزم و کۆنە پەرست دوژمنانی هاو بەشی نەتەوەکانی ئێرانیان بە سەر بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلەکانی ئێراندا زاڵ کرد. دوایە دیتیان قوام السلطنە بەریشی موبارەکی هاو پەیمانەکان و مسکو و تاران پێدەکەنێ. خو و رەوشتی سەران و سەرۆکی ئەو جورە حیزبانە لە مەر «ئەو دەستە و دەستکردن» بۆ وەشاندنی زەربە و خۆ گنخاندن و خۆ دەخەو خستن لە کاتی هەڵکەوتی شۆڕشگێرانە لە پاشە رۆژەکانی داهاتوودا یانی رۆژەکانی تەنگانەی ٢٨ی مرداد روونکتر و ئاشکراتر وەدیهات. لێرەدا بێجێ نیە کەیەندی رودەکی شاعیری مەزن لەو بابەتەوە

بەخەیێنە بەرچاو کە دەڵێ:« هرکەئاموخت ازگذشت روزگار ـــ هیچ ناموزد زهیچ ئاموزگار »

## نەخشی شۆرشگێری پێشەوا بارزانی

پێویستە بزانین کە هەر لەو کاتانەدا بوو کە قەومی بارزان لە کوردستانی گەرمێن بە رابەرایەتی پێشەوا بارزانی مستەفا کە قۆناخی خەباتی چەکدارانەی خۆی بۆ ناو کوردستانی کوێستان گواستبۆوە پاش ئەوەی کە تەجروبەی خوێناوی و پڕ لە شانازی ئەوان دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و حکوومەتی شای تۆپیوی عیراق لە کاتی پێویست و تەنگانە ح.د.ک. بە کاری ئەهێنا.

بارزانیان بێ ئەوەی چەک دابنێن بە سەر بەرزی و ژیری و گورج و گۆڵی دەستیان بە کشانەوەیەکی چەکداراتەی شۆرشگێری بۆ لای یەکەتی شورەوی کرد کە نە تەنیا چەک و تەواوی هێزی تەواوی حکوومەتەکانی ئێران و عیراق و تورکیا و فڕ و فێڵی ئیستیعمار نەیتوانی بەر هەڵستیان بکا. بەڵکوو گشت پسپۆرەکانی سیاسی و جەنگی دونیا لە دۆست و دوژمن لە مەڕ بەرزی بیرو راوێژی چەکدارانە و شۆرشگێرانەی بارزانیان و پێشەوا مستەفا بارزانی کۆڵنەدەر سەریان تێدا سوڕ ماوە. بەو هۆیەوە نە تەنیا ئابڕو و شەرەفی شۆرشگێرانەی نەتەوەی کوردیان کڕیەوە، بەڵکوو دەرسێکی مەزنی مرۆڤایەتی و بەر هەڵست و سەر بەرزی بوو بۆ هەموو تێکۆشەرانی خەباتکەری گێتی.

ئەو کردەوە شاز و پڕ لە قارەمانیتیە بۆتە ئالای سەر بەخۆیی بیرو باوەڕی نەتەوەی کورد وە بەو پەندە قوڵ و جوامێرانە نەتەوەی کوردی بە دونیا راگەیاند کە پۆلێکی سیاسی و چەکداری یەکگرتوو ژیرو پتەو لە ژێر سێبەری بیرو راوێژێکی فیکری و جەنگی ئەتوانێ نە تەنیا لە گەڵ لەشکرێکی پڕ چەک و چۆڵی دەوڵەتێک بەربەرەکانی بکا وە روو سوور و سەر بەرز سەرکەوێ. بەڵکوو توانای رووخاندن و تێکدانی ئەو حکوومەتانەشی هەیە کە بە هەموو چەک و چۆڵ و تفاق و بارمەیەک لە لایەن دەوڵەتە گەورەکانی ئیستیعماریش یارمەتی بکرێن. بەلام زۆر لە رابەرانی ئەحزاب و دەستە سیاسیەکان کە لە بەر بەهەڵە چوون لە سەر بیرو باوەڕی ناو

خۆو و لادان لە رێبازی کردەوە و عەمەلی شۆڕشگێرانە و چەکدارانە لە رۆژەکانی تەنگانە و پێویستدا دەستە و ئەژنۆ لە دوژمن رادەمێنن داماو و کەساس و بەستە زمان و عەبەساو خۆیان بۆ گەل و حیزب بێ کەلک و سود دەهێلنەوە. لێرەدا پێویستە بە سەر بەرزییەوە بڵێین کە زۆربەی ئەو ھەڤاڵانەی کە لە ماوەی حەڤدە ساڵی ژیانی رابردووی حیزبمان خاوەن بیرو راوێژێکی ژیر و پتەو، خاوەن مەسئولیەت و ئەرک و خاوەن قەڵەم و دڵ و دەروونێکی خاوێنی مرۆڤایەتی و کوردایەتی بوون. لە ماوەی ئەو ١٧ساڵەی خەباتدا بیر و کردەوەی سەرۆکی فیکری بارزانیان لە یاد نەکرد، ھەر ئەوانە ئاڵای یەکیەتی، خەبات، سەربەخۆیی و دیموکراتیان لە دەست دوژمن رفاند و کۆڵان بە کۆڵان، شار بە شار و پاتەخت بە پاتەخت لە سەرشان و شەپیلکی خوێناوی خۆیان راگرت و پاراستیان، تا گەیاندیانە سەر لوتکەی شاخەکانی زاگرۆس و لە ناودڵ و ھەناوی دوھەمین کۆنگرەی ح.د.ک. بەرزیان کردەوە.

لە ناو نوێنەرانی کۆنگرەدا کەم نەبوون ئەوانەی کە لە زیندان و رەشەچاڵەکانی تاران وەک «قزل قەلعە و لەشکری ٢ی زرھی» و قەسری قاجار جەزرەبە و شکنجە و چەرمەسەریان کێشاب وو و ھەزاران کۆسپە و کوێرەوەری و ھەرەشە و گورەشەی دوژمن سەر بەرزی و ژیری و بیرو باوەری کوردایەتی وانی تێک نە شکاند بوو.

لادانی کومیتەچیەکانی حیزبی تودەی ئێران

ھەروەھا لەو کۆنگرەیەدا کەم نە بوون ئەو نوێنەرانەی کە بە بیرو کردەوەی خۆیان شاھیدی زیندووی لادان و بە ھەڵە چوونی سەران و رابەرانی حیزبی تودەی ئێران لە دەوری ھاتنە سەرکاری حکوومەتی رەشی «رەزمارا» وە بەربەرەکانی لە گەڵ دروشمی میللی کردنی نەوت و تور ھەڵدانی نفوزی ئابوری و سیاسی ئیستیعماری ئینگلیس لە ئێران دوکتور محەممەد مصدق وە ھاوڕێ و ھاو خەباتەکانی وی لە « جەبھەی میلیی» یان دەکرد. وە لە کاتی تەنگانە و کرنگی مێژوویی و نەتەوایەتیدا بە دروشمی چەوت و چەپەڵ و نا لە بار ئاویان بە کورەکەی

ئاشی دوژمنانی سویند خۆری نەتەوەکانی ئێراندا نەکرد. لە کاتی گرینگدا کە دوکتور مصدق بۆ بەربەرەکانی لە گەڵ میلیتاریزم و دیکتاتۆری لە تەواوی حیزب و دەستەکانی سیاسی لە ناو مەجلیسی شورای میللی دا داوای دەکرد کە هەموو لە ڕێگای خەباتی نیشتمانی یەک بگرن، زۆربەی سەرانی ئەو حیزبە لە باتی تێکەڵبوون و خۆتێکێشان لە خەباتی گشتی نەتەوەکانی ئێران خۆیان بۆ زرم و هۆڕی چەکمەی دیکتاتۆری «رەزمارا» شل کرد بوو. هەرئەو لادانەی رابەرانی حیزبی تودەی ئێران لە کۆنگرەی دووهەمی حیزبی تودە بە کەم و کورتی بڕیاری لە سەر درابوو وە بوو بە هۆی هەڵوێستێکی چەوت و چەپەڵ کە زۆربەی بەرهەمی خەباتی نەتەوەکانی ئێرانیان بێ سود و کەلک هێشتەوە و غەدر و دوژمنایەتیەکی گرینگیان لە گەڵ حیزب و نەتەوەی خۆیان کرد. بە داخەوە دەبێ دەری بڕین وە ختایەک لە کەری شەیتانی هاتنە خوار کە ئاو لە ئاش برا بوو. کۆدیتای ۲۸ی مرداد سەرکەوت، هەر ئەودەمیش نەیانتوانی بەزیری و وریایی هێز و تاقەتی خەبات کۆکەنەوە و بە گۆڕینی هەڵوێست دەست بە پەلامار بۆ سەر دوژمن بکەن. بەلام ئەوە وەختیش هەر چەندە بەر یوەبەرانی ح.د.ک لە گەڵ گەلێک لە کادرەکانی ح.ت.ا. بە هۆی کۆ کردنەوەی ئەسناد و بەڵگەی حیزبی بۆ نیشاندانی نادروستی ڕێگای رابردوو وە دۆزینەوەی ڕێبازێکی ڕووناک لە سەر ئەو دروشمانە« ۱- تەقەلا بۆ هێنانەوە سەر کاری حکوومەتی میللی دوکتور مصدق ۲-رەواو روو خستنی میللی بوونی نەوت ۳ -بێ لایەنی ئێران » بە کومیتەی ناوەندی حیزبی تودەی ئێران پێشنیار کرا. بەلام پێشنیارەکەیان لە ژێر پێ هاویشت. هەر وەها پێشنیاری بە رێوە بەران و هاوالانی ح.د.ک. لە مەڕ گۆڕین و گوێستنەوەی تکنیک و تاکتیکی حیزبی لەوە پاش. یانی تێکەلکردنی ڕێگای خەباتی چەکدارانە لە گەڵ ڕێگای خەباتی شەقا می و پارلمانی. بە تایبەتی لەو لاتی کوردستان و ناوچەی فارس وە پاش گوێ درا.وە نەیانە ویست سەر لە نوێ کوێرەر ێگای پڕ لە هەڵە گێرە شێوینی کونیان بۆ ح.د.ک. برەنگێننەوە. لەو کاتە دایوو کە مەسئولان و رابەرانی حیزب لەش و گیاتی ح.د.ک. یان لەو رابەرانە جوێ کردەوە ڕێبازێکی تازە و نوێ

یان وه بەر چاوی خەڵک خست وه به گوێی ح.ت.ا. یان ڕاگەیاند که « برامان برایەتی و جیغمان جودایەتی.»

حیزبی دیموکراتی کوردستان وسیاسەتی دەرەوه

کۆنگره بڕیاری دا ح.د.ک. ئەبێ به باشی و گوڕج و گۆڵی لەو تەنک و چوڵەمەی سیاسی و ئابوری ئێران وه له هەڵوێست و وەزعی تایبەتی نەتەوەی کورد له ڕۆژهەڵاتی ناوه ڕاست به تایبەتی له گەڵ حکوومەته نیشتمانیەکانی بیلایەن، له گەڵ دەوڵەته پێشکەوتوەکانی گێتی پێویسته کەڵک وسود وەر گرن وه لەو هەل و فرسەته مەزنه بۆ دزگاری نەتەوەی کورد و نەتەوەکانی ئێران له هیچ فیداکاری و گیانبازیەک درێغی نەکەن.

حیزبی دیموکراتی کوردستان وشۆڕش

کۆنگره بۆی ڕوون بۆوه که پێشگرتنی ڕێگای خەباتی پارلمانتاریسم و هەڵبەز هەڵبەزی شەقامی بێجگه لەوه که خەڵکی ئێران زیاتر دوچاری سەرکوتی و مل کەچی و شل و شەکەتی و سەر شۆڕی ئەکا و به خەیانەتێکی مسەلەم به نەتەوەکان دەژمێردری سود و کەڵکی نیه.

کۆنگره سەلماندی که ڕێگای خەباتی ڕاستەقینه ڕێگای ڕزگاری نەتەوایەتی خەباتی چەکدارانه و شۆڕشگێرانەیه دژی ئیستعمار و چڵکاو خۆرانی (شاو حکوومەتی تاران) و تەفر و توناکردنی بناخەی هەیئەتی حاکمەی ئێران (سەرمایه داران و دەرەبەگی گەوره).بەڵێ تەنیا ڕێگای خەباتی چەکدارانه و شۆڕشگێرانەی خوێناوی که له سەر بیرو ڕاوێژێکی نوێ وتێبینیەکی ژیرانه ئەتوانێ تەنگ و چەڵەمه و چارەرەشی حیزبایەتی له ناو خەڵکی ئێران بنەڕەت بکا. یەکیەتی ئەو تۆ پتەو و نیشتمانی بۆ ڕزگاری نەتەوەکانی ئێران تەنیا له ناو کوری ئاگری شۆڕشدا وەدی دێت.

کۆنگره بڕیاری دا که له سەر شانی ڕابەرانی ح.د.ک. فەرز و پێویسته که هەر چی له توانایاندا هەیه به تەواوی هێز و باوەر و ڕاوێژی حیزبایەتی بۆ گەیشتن به ئامانجی مەزنی نەتەوەکانی ئێران یانی تێکوپێکدان و ڕوخاندنی ڕێژیمی بۆکەنیوی

شایەتی وە هەڵوەشاندن و لە ناو بردنی یاسا رەشەکانی هەیئەتی حاکمەی تاران و شاخ و لک و پۆپەکانی لە سەرانسەری ئێران. ئەبێ لە تەواوی حیزب و و دەستە سیاسیەکانی پێشکەوتووی ئێران بگێرێتەوە و داوا بکا کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی گشتی کۆنرە رێگای خەباتی پارلمانتاریسم (کە تەواوی خەڵک لێ ماندو بوون و پێی وەستاون تووڕی هەڵدەن و روو لە رێگای نوێی شۆرشگێرانەی ح.د.ک. بکەن. بە دڵ و دەروونێکی خاوێن بە بیرو هەستێکی تازە دەستی یەکیەتی و خەبات بدەنە دەستی ح.د.ک. لە مەڕ وەدیهێنانی یەکیەتیەکی پتەوی نیشتمانی بۆ ئازادی ئێران و رەزگاری نەتەوەکان.

تەجروبەی شۆرش لە کوبا و جەزائیر و گەلێک جێگای تر بە باشی وەدەری خست کە رێگای سەرکەوتنی شۆرش بە بێ هاندان و رێک خستنی چینی جوتیار و کێشانی وان بۆ ژێر ئاڵای خەباتی چەک و چەکدارانە لە چیاو دەشت و کێو پەیوەندی لە گەڵ چینە زەحمەتکێش و بەشخوراوەکانی نەتەوایەتی لە شارەکان شۆرش سەر ناکەوێ. هومێد و هیوا بەستن بە خەباتی سەر شەقامی خەتایەکی گەورە و رەنج بە خەسارێکی زۆری پێوەیە. هەر وەها پێویستە بزاندرێت کە خو و رەوشتی حیزبێکی سیاسی نەک لە رێی گفت و گفتار، بەڵکوو لە مەیدانی کردەوەدا نیشان ئەدرێت. لە ئێران لە ماوەی خەباتی خوێناوی گەلی ئێران دژی ئیستیعمار و شاو نۆکەرەکانی رێگای پارلمانتاریسم تەنیا و تەنیا رێگای خەبات ئەژمێر درا، چ بۆ (جەبهەی میللی) و چ بۆ ح . .ت، ا، و چ بۆ حیزب و دەستە سیاسیەکانی تر. لەو رێگایەدا تەنیا (جەبهەی میللی) بەرابەرایەتی مصدق توانی بە قەول و قەراری خۆی عەمەل بکا و بیر و باوەری خۆی وەدی بێنێ. بە سەر ئەو رێگەیەدا بە حکومەت بگا و نەوت میللی کا هەر وەها ئیستیعمار و شا هەیئەتی حاکمەی تاران وەهانکە هانک بخاو نیوە گیانی بکا. جەبهەی میللی گەرچی بۆ ماوەیەک توانی گەلێک کاری شۆرشگێرانە بکا، بەڵام توانایی راگرتن و پاراستنی ئەو هەنگاوە بەرز و شۆرشگێرانەی حکومەتی میللی دوکتور مصدق نەبوو. گەورە ترین کۆسپ و بەرهەڵستی لەم بابەتەوە دوو بەرەکی و ناکۆکی و لادانی بە

ڕێوەبەرانی ح.ت.ا. لە گەڵ جوڵانەوەی نەتەوایەتی ئێران بوو بە سەرۆکایەتی مصدق. ئەو حیزبەی کە چەندیەتی کۆمەڵایەتیەکی باشی پێکهێنابوو. بەڵام لە مەڕ چۆنیەتی شۆڕشگێرانەی حیزبیدا داماو و کەساس کەوتبوو وە لە ڕۆژی تەنگانە و پێویستدا شعور و فامی دیتنەوەی ئەو « ئاڵقە زنجیرەی کە بە هۆی وە دەستهێنانی ئەو تەواوی لەشی زنجیرە کە رادەکێشێت» نەیان بوو.

مەسەلەی جوتیار وگیروگرفتی ئەرزی

کۆنگرە لە سەر وەزعی ڕەش و ناکۆک و ژیانی نا لە باری جوتیار و توێژە زەحمەتکێشەکانی لادێ بڕیاری دا کە گۆڕانی ژیانی تاڵ و پڕ لە نیگبەتی ئەوان پێویستە بە بیرو راوێژێکی تێبینانەی زانستی چارە بکرێت.... شێوەیەکی شۆڕشگێڕانە دا بەشکردنی زەوی و زار و لە بەینبردنی پەیوەندی زاڵمانەی ئەرباب و رەعیەت کە بۆ ح.د.ک. لە پێشدایە بە لێکدانەوەیەکی قوڵ و تێبینیەکی نەتەوایەتی بەستراوەتەوە بە ڕزگاری سەر زەمینی کوردستان لە دەست داگیرکەر و چەوسێنەر و گەڕانەوەی زەوی و زار و خاوەنی ئەسلی کە لە٩٠٪ دانیشتوانی کوردستان پێک دێنن و ئەو ٩٠٪ رەگ و پێست و لەش و خوێن و ئێسکی حیزبی دیموکراتی کوردستان یان پێکە وەناوە.

کۆنگرە دەری بڕی کە تەنیا حیزبێکی شۆڕشگێڕی بە هۆی دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراتی ڕاستەقینەی نەتەوایەتی ئەتوانێ ئاسەری زوڵم و زۆرداری کە هەزاران ساڵە بەوە لە بەین ببا جوتیار و وەرزێری کورد خاوەن زەوی وزارو سەر بەخۆ و ئازاد و بەختیار بکا. ئاغاوەت و عەشیرەتە نیشتمان پەروەرەکان پێویستە تا گەیشتن بە حکوومەتێکی دیموکراتی و نیشتمانی کورد هەڵوێستی خۆیان بەرانبەر بە ڕێ و شوێنی سیاسی و ئابووری ح.د.ک. بەکردەوە و کردار لە ئاست چینی زەحمەتکێش و کوێرەوەری گێشی دێهات ڕووناک بکەنەوە و خۆیان نەکەنە دار دەست و وەرگێڕکەی حکوومەتی بۆگەنی شا و ئیستیعماری ڕزیوی بێگانە. ح.د.ک. لە جیاتی ئیسلاحاتی ئەرزی بێ جێ و ڕێی شا« شۆڕشی ئەرزی »یانی ڕزگاری یەکجاری و پتەوی خودی جوتیار و سەر زەمینی بن پێی جوتیار و

گشت دانیشتوەکانی کوردستان دەخاتە بەر چاو، هەر وەکی ئەو رێبازە لەپ رۆگرامی (بەرنامەی) حیزبماندا بە جۆری خوارەوە دەنووسێت ، «..حیزبی ئێمە سودی خۆی لە وەدا دەزانێ کە لە رێگای خەبات ورزگاری کوردستان لەخان وخاوەن مولکانی بەشەرەف کوردپەروەر بگێرێتەوە کە پشتی حکوومەتی تاران بە تەواوی بەردەن و بە دڵێکی خاوێن و بیرو باوەری کوردانە وە خۆیان لە باوەشی دایکی نیشتمان و رێبازی کوردایەتی باوێژن و پاڵ وە پاڵی ح.د.ک. حیزبی رەزگارکەر و شۆرشگێری نەتەوەی کورد بدەن و دەستی خەباتی ئەندامانی حیزب لە دەست گرن و بۆ روخاندنی ئیستیعمار و حکوومەتی تاران لە کوردستان و سەرانسەری ئێران هاو خەباتی حیزبمان بن. جا بۆیە ح.د.ک. لە مەر ئیسلاحاتی ئەرزی لە کوردستان بە شێوەیەکی کۆمەلایەتی و زانستی کوردانە هەنگاو هەلدێنێ.

ح.د.ک. لە سەر ئەو بیرو باوەرەیە کە زەوی وزار و کشت و کاڵ و دار و دەوەن وئاو وکانی کوردستان مافی نەتەوەی کوردە وە مافی رەنێوهێنان و دابەشینی ئەرز بە تایبەتی لە مافە تایبەتیە هەرە گرینگەکانی حکوومەتی دێموکراتیکی کوردە کە بە هۆی بەرێوە بەرانی ح.د.ک. وەدی دێت. ئەو کاتەیە کە حاکمیەتی نەتەوایەتی و حیزبی دیموکراتی کوردستان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە ئەرزو ئاو و زەوی و زارە دارستان دا دەبەشێت. مادەی ۳۹ ـــ بەندی نۆهەم ـــ بەشی شەشەم.

## لە مەڕ ناوەندیەتی حیزبی

کۆنگرە دەری بری کە بە هۆی فشار و گرتن و نەبوونی هەل و فرسەت ح.د.ک. نەیتوانیوە کۆنگرە پێک بێنێت و خاوەتی مەرکزیەتێکی قانوونی هەلبژێردراوی کۆنگرە یانی کومیتەی ناوەندی و خاوەن قانوون و یاسای حیزبی یانی پیرەو و پرۆگرام بێت هەر بەو بۆنەشەوە ح.د.ک. دوچاری گەلێک لادان و بە هەلە چوون و گێرەشێوێنی هێندێک لە کادرەکانی خۆی بوە. چەپگەری و راستگەری

سەردەمایێک ئاڵۆزکی و نا لە باری لە ناو حیزب خستبوو. رابەرانی حیزب لە مەڕ گیر و گرفت و دەر چوون لە شوێنی خۆیان و بەند نە بوون لە جێگایەکی تایبەتی وە هەروەها دەربازب وونی هێندێک لە هەڤالاتی رابەر بۆ ناوچەی تر وە گوێستنەوەی قۆناخی خەبات چار و یار بۆتە هۆی شێوەیەکی کاری قەردی. بێجگە لەم کەم و کوری سازمانی گیان و لەشی حیزب لە لایەن دوژمنانی جۆر بە جۆر وڕەنگ بەڕەنگ وەبەر شالاو و لێدان دراوە لە لایەکی ئیستیعمار و حکوومەتی شا بۆ تێکشکاندنی لەشی ح.د.ک. زۆربەی فشاری دڕندانەی خۆیان لە رێگای جەزرەبەی زیندان و کوشتن و بڕین و جاسوسی و... بە تەواوی هێزە رەشەکانی خۆیان ویستوویانە لەشی حیزبی ئێمە زامار و بریندار و کرماوی بکەن. لە لایەکی ترەوە دوژمنانی بیرو باوەڕی حیزبی بە پڕو پاگاندە و درۆ و دەلەسە و کڕین و بە هەڵە بردنی هێندێک ناسراوی روو رەش کە وەختی خۆی بە گرتنێک سەری خۆیان بۆ خزمەتی سازمانی ئەمنیەت شۆڕ کردوە و لە کاتێکدا هەم لە تورەکەیان دەخوارد و هەم لە ئاخوڕ وە گەلێک کارەساتی دیکە. ویستوویانە گیانی حیزبی ئێمە دوچاری مەترسی و ئازار و عەزاب بکەن. وە بۆ تێکدانی ریزی حیزب لە هیچ کێرە شێوێنییەکی چەوت و چەپەڵ کۆتاهی و درێغی یان نەکردوە. ئەو دوو چەشنە دوژمنانە گەرچی لە دوو لاو لە لایەن دوو تاقمی ناجوور لە گیان و لەشی حیزب بەربوون. بەڵام مەبەست و ئامانجی هەر دووکیان لە ناوبردن و کوژاندنەوەی ئاگری خەباتی ح.د.ک. بوە. کە ئەو ئاواتەی خۆیان دەبەنە بن گڵ و ژێر قەبری.

کۆنگرە بڕیاری لێ بورین و بەخشینی ئەو تاقمە کورد پەروەرانەی دەربڕی کە دەست و دڵ و دەروونی کوردایەتیان پاک ماوەتەوە. بێجگە لەو کەسانەی کە بە جاسوسی و خەیانەت دەستیان ئالودە کردوە. رێگەی گەڕانەوە و لێ بورین بۆ ئەو دەستە کورد پەروەرانە کراوەتەوە کە پاش دەربڕینی پەشیمانی و هۆی بە هەڵە چوونیان لە کارەساتەکانی رابردوو بە دڵ و دەروونێکی خاوێن و بیرو باوەڕێکی تازە خۆیان لە باوەشی ح.د.ک. باوێژنەوە.

# مەسەلەی نەتەوایەتی

کۆنگرە لە سەر مەسەلەی نەتەوایەتی بەشێوەیەکی تایبەتی و بەرژەوەندانەو تێبینێکی زانستی دوا. نەتەوەگەری زوڵم و زۆرداری نەتەوەیەکی بە دەسەڵات و لە سەر حوکم بە سەر نەتەوەکانی تری ئێران(کە لە هەر سەر زەمین و عەرد هاوبەشیەکی گرینگیان هەیەو هەرکامیان خاوەنی زمان و مێژوو خوو رەوشت و لیباس و ئاکار و سونەتی تایبەتین)لە مێژ زەمانەوە لە ئێران باو و بەردەوام بوە. ئینقلابی مەشروتیەت تەنیا مەبەستی تێکدان و سەرنخونکردنی پاشایەتی قاجار نەبوو. بەڵکوو هەڵوەشاندنی دەسەڵات و زۆرداری حکوومەتی مەرکەزی یانی ئاغایەتی نەتەوەی زاڵ بە سەر نەتەوەکانی تری خستە بەر چاو. بەڵکوو داوای هاوبەشیەکی راستەقینەی نەتەوەکانی لە نا وحکوومەتی تاراندا دەکرد(بۆ رێکو پێک خستنی حکوومەتێکی دێموکراتی و برایەتی هەموو نەتەوەکان لە هەر کار و باری سیاسی و جەنگی و...هتد) هەروەها سەر بەخۆیی نەتەوەکانی ئێران کە بریتی لە ئەیالەت و ویلایەت بوون بە شێوەیەکی گرینگ خرانە قالبی قانوونەوە بە ناوی قانوونی ئەساسی ئێران .هەر وەها مەبەست لە مافی هێنانە سەرکاری ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی لە قانوونی ئەساسی کە بەرهەمی خوێنی ئینقلابی مەشروتیەت بوو، وەدیهێنانی ئەو ئاواتە مەزنەی سەرەوە بوو کە لە ناو دەوڵەتەکانی ئورووپادا لە قەڵەم دراوە. پاش لە ناو چوونی بەرهەم و سەمەری ئینقلابی مەشروتیەت بە تایبەتی دوای کودتای ١٢٩٩ و هێنانە سەرتەختی پاشایەتی رەزاخان بە دەستی ئیستعمار، نە تەنیا نەتەوەکانی کورد و ئازەربایجانی و عەرەب. بەڵکوو خودی نەتەوەی فارس کە بناغەی زۆرداری و دیکتاتۆری پاشایەتی لە تاران لە سەر سینگی ئەو دامەزراوە. نەتەوەکانی تر دەچەوسێنێتەوە دوچاری

رۆژی رەش و کەساسی و زوڵم و زۆری کرد. شا و هەیئەتی حاکمەی تاران کە چڵکاو خۆر و نۆکەری ئیستعمارن. نەک گوێی خۆیان بۆ وەکار حستن و وەدیهێنانی ئەو بەشە گرینگەی قانوونی ئەساسی شل نەکردوە، بەڵکوو بە تەواوی هێزی رەش و فڕ و فێڵ لە هیچ بوختان و ساختەچیەتی و گێرەشێوێنی لەم باردوە کۆتایی ناکەن. روودانی جولانەوەی نەتەوایەتی کوردستان و ئازەربایجان لە سالانی ٢٤ ــ ١٣٢٥ بێزاری نیشاندان و دەربڕینی هەست و قینی نەتەوەکانی دژی دیکتاتۆری شا و حکوومەتی تاران بوو.

بۆ یەکەمین جار لە ئازەربایجان و کوردستان بە گوێرەی قانوونی ئەساسی دەستیان کرد بە وەکار خستنی ئەنجومەنی ئەیالەتی وویلایەتی وە وەدیهێنانی مافی نەتەوایەتی بە مانای(ئۆتونومی).بەلام هەموو شاهید بوون کە حکوومەتی شا و ئیستعمار بۆ پاراستنی تالان و خوێنمژی خۆیان چ بەزم و رەزمێکی خوێناویان و درندانەیان گێڕا و حازر نە بوون مافێکی نەتەوایەتی کە دەیان سال لە مەو بەر بە هێزی چەکدارانە و شۆرشگێڕانەی گەلەکانی ئێران قانوونی کرابوو وە مەبەستی مافی (ئۆتونومی ــ خودموختاری) بە ئاشکرایی و روونکی تێدا گونجاندرا بوو، بێننەدی.

پێویستە لێرەدا سەرنج بدرێت کە حکوومەتی شا و ئیستعمار نەک تەنیا لەم بابەتەوە بەڵکوو بە بەشەکانی تریش لە قانوونی ئەساسی نرخی پەرەکایەکیشی بۆ قایل نەبوون بۆ نموونە وەختایەکی حکوومەتی میللی مصدق بۆ پاراستنی مافی گەل و حکوومەتی خۆی بە گوێرەی قانوونی ئەساسی کە دەڵێ « شاحەقی نیە حکوومەت بکا، بەڵکوو تەنیا حەقی شایەتی هەیە » وە سەرۆک وەزیر لە بەرانبەر مەجلیس و قانووندا لێ پرسراوە و مەسئولیەتی هەیە. شایەتی مەقامێکی تەشریفاتیە و تەواوی وەزیران لە بەرانبەر سەرۆک وەزیردا مەسئولن نەک لە مقابل شادا، بیر و باوەڕ و کردەوەی خۆی دەرخست. هەموو دونیا شاهید بوو کە ئیستعمار و شا و چڵکاو خۆرەکانی چ کارەساتێکی خوێناوی و چەوت و چەپەڵیان بە سەر حکوومەتی میللی دوکتور مصدق و گەلی ئێران هێنا. جا لێرەدا بە باشی

و گرنگی روون دەبێتەوە کە هێنانە سەرکاری حکوومەتێکی دیموکراتی لە ئێران بەستراوەتەوە بە وەدیهێنانی مافی نەتەوەکانی ئێران وە ئەو دوو مافە لێک ناپسێندرێتەوە.

ئەگەر هاتوو بە چاوێکی زانستی کۆمەلایەتی لەو بابەتە بڕوانین بە باشی دەر ئەکەوێ کە پاش دامەزراندنی حکوومەتێکی یەکگرتووی نەتەوایەتی و دیموکراتی لە ئێران فەرز و پێویستە کە تەواوی ئەو هەریم و بەشانەی ئێران کە کورد و فارس و ئازەربایجان و عەرەبن بە گوێرەی هەلوێست و وەزعی تایبەتی نەتەوایەتی کە بریتی یە لە هاو بەشیی زمانی و مێژوویی، هاوبەشی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی، هاوبەشی سەر زەمین و عەرد، هاوبەشی ئاکار و سونەت و کار و خەباتی نەتەوایەتی ) ئەبێ مافی حوکم دانان و حوکم کردنی ناو خۆیی، مافی دانانی یاساکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و...هتد، بە سەربەستی سەربەخۆیی نەتەوایەتی وەدی بێت. هەر وەها مافی هەلبژاردنی ژمارەیەک لە نوێنەرانی ژیر و تێگەیشتوو خاوەن بیر و راوێژ لە هەر نەتەوەیەک بۆ دانانی پارلمانێکی خۆ ولاتی و حوکم رەوایی نەتەوایەتی، چ بە نێوی حکوومەتی ئوتونومی و چ بە نێوی حکوومەتی فیدرالی (یەکگرتوو)کار و باری سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی نەتەوەی خۆی بە رێوەبەرێت. هەروەها نوێنەری تایبەتی ئەو نەتەوانە لە حکوومەتی مەرکەزی و لە پارلمانی گشتی نەتەوەکان بەشدار و خاوەن مافی تایبەتی بن.

رێگای رزگاری و خۆشبەختی و بەرزیەتی ئێران و تەواوی ئەو ولاتە زۆر نەتەوانە(کثیرا لملە ) بە لێکدانەوە بۆ حەلکردنی مەسەلەی میللی بەو شوێن و رێبازە گرنگانەی ح.د.ک. بەستراوەتەوە کە لە مادەکانی ٤ و ٥ ی پرۆگرامدا بریاری لە سەردراوە. جا بۆیە ح.د.ک. لە کۆنگرەدا بۆی دەرکەوت لە مەڕ وەدیهێنان و رووناک کردنەوەی ئە حەقیقەتانەی سەرەوە ئەبێ لە تەواوی حیزب و دستە سیاسیەکانی پێشکەوتوو و لە گشت گەلەکانی ئێران بگیرێتەوە و داوا بکا کە لە پێناو پەیوەندیەکی پتەو و بنەرەتداری نیشتمانی و تێبینی و بیر و راوێژێکی

دونیا پەسند دەستی شۆرشگێری چەکدارانە بدەنە دەست یەکتر و لە رێگای هەڵوەشاندن و تێک و پێکدانی بناغەی زوڵم و زۆرداری حکوومەتی رەش و چەپەڵی شا و ئیستعمار هەل و فرسەت لە دەست نەدەن.

سەرماوەزی ١٣٤٣ ــــ نوامبری ١٩٦٤ دووهەمین کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان کومیتەی ناوەندی.»

کۆنگرەی دووهەم پێڕەو و پرۆگرامی حیزبی دیموگراتیش پەسند دەکات. ئەوە یەکەم بەڵگەی رەسمی دارشتنی قەوارە و بەرنامە و رێبازی سیاسی حیزبی دیموکراتە دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان. ( ئەمەش دەقی بەرنامەی پەسند کراوی کۆنگرەی دووهەمی حیزبە کە بە بێ دەستکاری بڵاو دەکرێتەوە.

« پێ رەوی ناوخۆی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

بەندی یەکەم «چونیەتی حیزب»

مادەی یەکەم ــــ حزبی دیموکراتی کوردستان حیزنیکی پیشرەوی پیشکەوتوە بە سەر ریبازی دیموکراتی و شورشگیری و لە مەر هەلویستی جەبهەکانی جیهانی لە بەرەی نەتەوەکانی سەربەخۆ و سەر بەستدا قەراری کرتوە.

مادەی دووهەم ــــ ح.د.ک. لەو ئەندامانە پێکهاتوە کە هاوبیر و هاوڕی و هاو ئامانجی خەباتی نەتەوایەتین بۆ ئازادی کورد و رزگاری کوردستان لە ژێر دروشمی پەسندی « یەکیەتی ، خەبات ، سەربەخۆیی و دیموکراتی »و پروکرامی حزب کە پیکهاتوە لە هەمو چین و کومەلی کورد بە تایبەتی وەرزیران ــــ کریکاران ــــ پیشەوەران ــــ روناک بیران ــــ بازرگانان و سەرمایەدارەکانی نیشتمانی دەتوانن بەشداری ریزی خەباتی حزبایەتی حزبی دیموکراتی کوردستان بن بە مەرجی قبولی پروگرامی حزب و گونجانیان لە ناو چوار چیوەی مەرجەکانی ئەندامیتی و پێوە هەستانیان بە پێ رەوی ناوخوی حزب.

مادەی سیهەم ــــ بیر و باوەری ح.د.ک. جهان بیتی(تیئوری ــــ نەزەریە) زانستی و پیشکەوتوانەیە لە ناو چوارچیوەی سود و مەسلەحەتی نەتەوایەتی

ونیشتمانی دا  ویی باوەری گورین وگورانە لەناوشنونی کومەلایەتی ونابوری و سیاسی وە کە واتە راپەرین و شورش بە ریبازیکی ئازادی و رزگاری نەتەوەی کوردی دەزانین.»(... ئەم دەقە لە هیچ بارێکەوە دەستکاری نەکراوە )

لە ٤١ مادەی دیکەی ئەم نووسراوەدا کە بە پێرەو و پرۆگرامی حیزبی دیموکرات ناو براوە، هیچ شتێکی کۆنکرێتی لە بارەی ئامانج و تاکتیک و ستراتیژی خەبات و روانگەی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابوری دوارۆژی کوردستانی تێدانیە. هەمووی دانانی شەرتو مەرجی ئەندامەتی و وەرگرتن و دەرکردن و سزادان و فێرکردنی کادر و دانانی کلاسی کادر و بەخشینی پلە وپایە و دەرەجە و.....هتد »..... کونگرە دوای نیزیک ١٨سال تێکوشانی نهێنی رێبەری نا دیار، کومیتەی ناوەندی هەلبژارد و مرنامە و  پیرەوی نیو خوی پەسند کرد. لە گەل ئەوەشدا کە بەرنامە و پیرەو ە کە لە گەل سەردەم نە دەگونجا و بەشێوەی گشتی لادانێک بوو لە رێبازی پێشکەوتوانەی حیزب و، هەر وەها پەسندکردنی هێندێک بریار لەو کونگرەیەدا، زۆر تر  ئارەزووی  تاکە کەسی بوون و وەک بەیاراتی سیاسی نە دەچوون و لە گەل بەرژەوەندی حیزب نە دەگونجان، بەو حالەش بەستنی کونگرەکە کاریگەریی خۆی لە سەر رەوتی دوا رۆژی حیزب بەخشی...... سەرەرای هەمووی ئەم کەم و کوری یانە کە لە کونگرەی دووهەم و بریاراتەکانیدا هەبوو، پێکهێنان و بەستنی کونگرەی دوو هەم لە هەل و مەرجی ئەو کاتەد انوختە گۆرانێک بوو لە بواری تەشکیلاتی حیزبدا و هەتا رادەیەک کۆتایی بە کاری فەردی و پەشێوی لە نێو ریزەکانی حیزب هێنا»(١٠)

کۆنگرەی دووەمی حیزبی دیموکرات بە بۆنەی کۆتایی کاری کۆنگرە بەیاننامەیەکی دیکەشی بەم جۆرە بلاو کردۆتەوە :......

«.. کۆنگرە لە ژێر دروشمی» یەکیەتی، خەبات، سەربەخۆیی، دیموکراتی» لە پێناوی خەبات و ئازادی و  رزگاری کورد و کوردستان ئەو ریزە مەبەست و بریارانەی خوارەوەی دا :

١ ـــ کونگرە بە  بریاری گشتی تەئیدی راپۆرتی کومیتەی ناوەندی کرد.

٢- به دەنگی گشتی تەئیدی شەشەمین کونگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان و بریارانی ئەو کونگرەی کرد.
٣- بریاری لە سەر تەئیدی سیاسەت و هەلویستی گورج و هەلسورانی بەرێوە بەرایەتی پێشوی حزبی دا بوپ شتگیری لە شورشی کوردستانی کەرمین.
٤- نوینەران بە گشتی سوپاس و تەقدیری ناوەند و بەریوەبەرانی حیزبی کرد بو دەوری دلسوزی و هەلسوریان بە یارمەتی مادی و مەعنەوی و گیانی بە شورشی کوردستانی کەرمین.
٥- کونگرە ئەو ریزە بریارانەی خوارەوە لە مەر جاسوس و خائینەکا ن و دەستە بەندی و حزب سازەکانی گیرە شیوین و ناحەزی ریزی حزبی دیموکراتی کوردستانی دەرکرد
**الف-** کونگرە بەیانی برواری ١٣٤٣/٧/١٢ی حزبی تەئید کرد کە لە ناو ئەو بەیانەدا لە ژی رعنوانی» لادان و سەر شیواوی چەند خویەرستی تا جوامیر بە ناوی کومیتەی ساخکەرەوە» دەستەبەندی یەکانی دژی حزبمانی تیدا ناوبراوە مەحکوم کران وە حوکمی خائینی دا بەرانبەر بە زوربەی هە لسور و بکیرەکانی ئەو تاقم و دەستانە. وە چەند کەسی لە وانە بە جاسوس وبە کریگیراو ناسین.
ب- بریاری تایبەتیە لە سەر دوکتور قاسملو کە بە جاسوس و دزی حزبی ناوبردوە،

لە بەندی ٩ی بریارەکەدا گوتراوە:...«کونگرە تورەیی و نارەزایی دەردەبری بەرامبەر بە هەلویستی کورد روشانەی( مەکتەبی سیاسی پیشوی دەرکراو برایم ئەحمەد و دارو دەستەکەی ) بو ناحەزی کردن لە کەل کادرە تیکوشەرەکانی حزبمان لە سەر داوای دەزگای جاسوسی حکومەتی تاران(ساواک) و پەیمانی سەنتو بە هوی جاسوسانی ناسراو وەک عیسی پەژمان و سەرهەنگ منصورپور و سەرهەنگ مدرسی و عباس ئارام و هاتوچوی ناوبراوان بو ماوەت و کردەرەش و ئیساوی و مالومە...»(.. لە بەر ئەوەی دەقی بەیاننامەکەم لە لا نەماوەو لە ولات گیرساوەتەوە ئەم بەشەم لە بەرگی سێ یەمی بیرەوەریەکانم وەرگرتوە ..)

دوای بەستنی کونگرەی دووەم لە نێوانی کادر و ئەندامانی ڕووناکبیرو خوێندکارانی کە ڕێگا نەدرا بوون لە کۆنگرەدا بەشداری بکەن و هەم لە نێوان بەشدارانی کۆنگرە و ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کونگرەدا ناکۆکی و دوو بەرەکی توند دەبێ سەر دەکێشێتە جیا بوونەوە. بەیاننامەی کۆنگرەی دووەم و هێرشی بۆ سەر پێشەوا قازی محەممەد و کۆماری کوردستان نارەزایی و نەفرەت لە نێو ئەندامانی حیزبدا پێک دێنێ. کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرە ناچار دەبێ بۆ هێور کردنەوەی هەستی ئاروژاوی ئەندامان و شوشتنەوەی ئەم بۆچوونە دژێوە ئەم بەیاننامەی خوارەوە بڵاو بکاتەوە:

## بەیاننامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان

بیرەوەری ١٠ خاکە لێوەی ڕۆژی شەهیدانی حکوومەتی میللی و دیموکراتی کوردستان

١٩ساڵ لە مەو بەرپاش هێرشی درندانەی حکوومەتی تاران بۆ سەر خاکی ئازاد و سەر بەخۆی حکوومەتی میللی و دیموکراتی کوردستان ئاڵقەی تەناف و سێدارە ڕیزی گوللە و ڕەشاش ناراستەی گەردن و سنگی باشترین و پاکترین ڕۆڵانی نەتەوەی کورد و ڕابەران و کار بەدەستانی حکوومەتی سەربەخۆ و دیموکراتی کوردستان کرایەوە و دوژمی لە مێژینە ولا تی سەر سەوزی کوردستانی بە خوێنی ئاڵی شەهیدان پاراو کرد. لە١٠ی خاکەلێوە دوژمنی داگیرکەر بە دەسکیسی ئیستحمار و بێگانە ڕۆژێکی ڕەشو تەماوی تری لە لاپەرەی مێژووی نەتەوەی کورد کردەوە.

لەو ڕۆژەد اپێشەو اقازی محەممەد سەرۆکی حیزب و کۆماری میللی و دیموکراتی کوردستان دەگەڵدوو هاورێ محەممەد حەسێنخانی سەیفی قازی وەزیری بەرگری و سەدری قازی نوێنەری شاری قارەمانی مەهاباد لە مەجلیسی

شورای میللی تاران له بەره بەیانی ئەو رۆژه دا به دزی شەهیدکران. بەو جۆره پەنجەی خویناوی دوژمنی سویند خۆری کەوته ناوجەرگ و هەناوی نەتەوەی کورد و له ناو ئەودڵ و دەرونه دەستو چنگورکی به خوێنی دوژمن وەک شەوه پێشەوای نەمری کوردی لێ رفاندین و له شەوه زەنگی ١٠ی خاکه لێوه له کاتێکدا کوردستان ماتەمینی هێزی بەدفەری داگیرکەری گرتبوو. زۆربەی خەڵک به پەرۆشی پەلاماری بێ رەحمانەی حکومەتی داتاشراوی ئێران بۆ سەر خاکی نیشتمانی خۆشه ویستمان و جگەر گۆشەکانیان له بەندیخانەدا بوون و به نا رەحەتی و لێو به باری سەریان نابوو، پێشەوای نەمر و هەڤاڵانی له داردران.

ئەو دارەی چوار چرا و سەر حەوزی بۆکان و... ئێستاش که ئێستایه بۆته جێگەیەکی سویند خواردنی کیژ و لاوی کورد که پەیمان و سویندی خەبات و تۆڵەی پێده خورێت. سوپای داگیر کەری دوژمن رووی کردەوه ئەرزی نیشتمانمان دەستی به هێرشی درندانه کرد، چی کاربەستان و رابەرانی حیزب و نەتەوەکەمان بوون کەوتنه بەر پەلاماری هێزی رەشی دوژمنی داگیرکەر و دادگاکانی داتاشراوی سەحرایی. بەت ەردەستی و سەرلێشێواوی پڕ.له ترسەوه کەوته کار و به سەدان نەفەر له رۆڵه ئازاد و به شەرەفەکانی گەلی به شەرەفی کوردی به ئیعدام و حەپسی ئەبەد مەحکوم کرد. لەو لاشەوه زۆر به خێرایی دەسته دەسته له رۆڵه بەوەفاکانی گەلی به شەرەفی کوردیان له شاری سابلاخ و بۆکان و سەقز له داردان دەیان قارەمانی تریان له گۆشەی بەندیخانەدا به دزی شەهید کرد و ئازار کوژیان کردن.

بەم جورەیه ریزی ئەو کاروانه شەهیدانه:

١-پێشەوا قازی محەممەد ٢-محەمەد حوسێنخانی سەیفی قازی ٣-ئەبولقاسمی سەدری قازی ٤- رەسولی نەغەدەیی ٥- محەممەدی نازمی ٦-حەمیدی مازوچی ٧- عبداللەروشنفکر ٨- عەلی شێرزاد ٩-ئەحمەدخانخەلیلخانی فاروقی ١٠- حەمەخان خەلیلخانی دانشوەر ١١-عبداللەخانخەلیلخانی مەتین ١٢- ئەحمەدخانی شەجیعی ١٣- حەمەبەکی

بابەخان بەگ ١٤- شێخ ئەمینی کەسنەزان ١٥- شێخ سەدیقی ئەسعەدی ١٦-عەلیاغای جەوانمەردی ١٧- رەسولاغای مەحمودی ١٨- علی سەرتیپ فاتحی جهانگیری ١٩- حوسێنخانی جەلالی کاتی نیاز .

**ئەو قارەمانانەی کە لە شەڕی رزگاری کوردستان شەهید کران:**

١ - محەممەدی ئاتوازادە ٢- خۆشەوی خەلیل بارزانی ٣- وەستابرایمی بەننا ٤- عەبداللە مینە خالند ٥- حەسەن برایماغای بریاجی بێشاسپێ ٦- ئاغاخان هەنارە شکاک ٧- ئەرشەد هەنارە شکاک ٨- کەریم شەری شکاک ٩-خالید جەلالی ١٠- ئەحمەد جەوزی قەرە قشلاخی ١١- حوسێن خالیاغا ١٢-ئەحمەدی وە ستاحەسەنی ١٣- ئەحمەدی خدرشموله .

ئەو دوو هەڤاڵە لە ژێر ئازارو ئەشکنجەی دەزگای جاسوسی ئێران لە بەندیخانەدا شەهید بوون:١ - مارفی پور زەریف پێشمەرگە ٢- هاشمی هەمزەوی ئەفسەر. ئیستعمار حەزیان بە خوێنی گەشی ئەو هەموو شەهیدانە رازی و تێر نەبوو چەنگی خوێناوی خستە ناو قورگ و گەرووی چوار قارەمان ئەفسەرانی شۆرشگێری حکومەتی میللی و دیموکراتی کوردستان:

١ - محە ممەد مەحمود قودسی ٢- عیزەت عبدالعەزیز ٣- مستەفاخۆشناو ٤- خەیروڵا عبدالکەریم. حکوومەتی سەر بەستراوی فەیسەل - نوری سەعیدی خاین شاری قارەمانی سلەیمانی یان بە خوێنی گەشیان سوور کرد و گردی سەیوان تەرمی ئەو شەهیدانەی لە ئامێزی خۆی گرت.

گڕی ئاگری خەبات و تێکۆشانی کوردایەتی و حیزبایەتی نەکوژاوەو هەڵیدایەوە. لە ناو ئەو گڕ و ئاگرە بەتینەدا حیزبەکەمان سەر بەرز قارەمانانە قالبوو لە کوری ئەو ملەو بەر بەرە کانیەدا ئێستا چەندین قوربانی داوە کە پێویست بە بیرەوەرین:

١ - هەڤاڵ ئیستوار رەجەبی خەڵکی سنە کە لە پەلاماری درندانەی حکوومەتی سەر بەستراوەی تاران لە ساڵی ١٣٣٨هێنایە سەر ئەندامانی حیزبمان لە قزلقەلا لە ژێر ئازار و ئەشکنجەی مەئمورەکانی سازمانی ئەمنیەت گیانی سپارد.

۲- هەڤاڵ رەحمان خەلیل سوارە خەڵکی ورمێ (رضائیه) هەر لەو ساڵەدا پاش ئازارێکی زۆر لە قزلقەڵا لە بەندیخانەی قەسری قاجار شەهید بوو. ۳- هەڤاڵ مەلا رەشید سوفی عەلی رەحیم گەورە قەڵایی لە ساڵی ۱۳٤۰ لە بەندیخانەی شاری سەقز پاش ئازار و ئەشکنجەیەکی زۆر حکوومەتی شای ئیسلام پەنا بە مەندیلەکەی خۆی خنکاندییان و تەرمەکەیان بۆ شەوی دوایی بە خنکاوی بردەوە بۆ خێزان و منداڵەکانی.

هەڤاڵانی تێکۆشەر و سەر بەرزی ح.د.ک. کە لە ریزی پێشمەرگەیی و گیانبازی حیزبی و بەرێوە بەرایەتی هێزی چەکدار و شۆرشگێری کوردستان تەواوی گیان و ماڵیان فیداکرد بوو بە دەست دوژمنانی نەتەوەی کورد تێرە باران کران، بەڵام لە کاتی شەهید بوونا دەنگی سرودی نیشتمانی کە لە گەروی وشک و زاماوی ئەوان دەر دەکەوت و یز ە ویزی گوللەی شای تێک پکاند و تەواوی خەڵکی سابلاخی لە خەوی خەفلەت راپەراند. ئەو پێشەوا و قارەمانانەی کە بە بیر و هەستێکی گەورە رایانگەیاندکە: بیر و باوەری ح.د.ک. زۆر بە تینتر لە ئاگری گوللە و باروت و بومبای دوژمنە، گەلێک بەرزتر لە سێدارەیەوە زۆر بە هێزتر لە مەرگ و مردنە. جا بۆیە ئەورۆ خوێنی گەشی ئەو شەهیدانە بۆتە کولاڵەی دەشت و مەزراکانی کوردستان لە سەر لوتکە چیاکانی نیشتمان بۆتە هێزو تین و تاقەت بۆ دڵی خەباتکاران لە ناو رەشە چاڵەکان و زیندانەکانی دوژمن هەر وەها بۆتە مەشخەڵی بیر و باوەری تەواوی ئەندامانی ح..د.ک.و تەواوی کوردی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر.«تاوانی ئەو شەهیدانە چبوو؟ ئایا وەتەن فرۆش بوون؟ ئایا تارانیان فرۆشت بوو یان ۲۰ میلیون خەڵکی ئیرانیان بە نەتەوەی کورد و عەرەب و ئازەربایجانەوە لە ژێر نیزامی جەببار و غەداری سەڵتەنەت و پاشایەتی هاویشتبوە ژێر پێی ئیستعمار و بە قیمەتی دیلی و یەخسیری ۲۰میلیون چەوساوە و بیندەسەڵات داوای «ظل اللهی» یان دەکرد ؟

دادگای داتاشراوی نیزامی شا غیرەت و شەهامەتی ئەوەی نەبوو کە بیر وباوەری مرۆڤایەتی و کوردایەتی شەهیدانی نەمر بلاو کاتەوە. چون بیر وباوەری

ئەوان حەقبوو دوژمنی خوێنڕێژ هەر وەک شەمشەمە کوێرە لەو ڕۆژە دەترسێ لە بیر و قسەی حەقی ئەوان دەسلەمیەوە هەر وشەیەک لەو بابەتەوە وەکو بۆمبایەک بوو بۆن او دڵی ڕەشی دوژمن

حکوومەتی سەربەخۆی کوردستان بۆ هەوەڵین کەرەت ئاوات و ئارەزووی خەباتکارانی نەتەوەی کوردی لە کوردستان وەدیهێنا:

کردنەوەی مەکتەب و قوتابخانە بە زمانی کوردی. و دەرخستنی چاپەمەنی، ڕۆژنامە وگۆڤاری کوردی بوو بە هۆی بوژاندنەوەی هەست و بیرو باوەری نەتەوایەتی و تیندانی ئاگری خەبات لە ناو دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر. لە پاش ٢٠ساڵ دیکتاتۆری و خوێنمژی حکوومەتی مەرکەزی تاران لە ژێر ڕسێبەری نیزامی ڕەش و چەپەڵی «پەهلوی» و هێنەتی حاکمەی ئێران بۆ هەوەڵینجار نەتەوەی کورد لە ئێران کەوتە نێو باوەش و ئامێزی دیموکراتی و ئازادی و سەر بەخۆیی. ئەو دیموکراسیە نەتەوایەتیە لە پێش هەموو شتێکدا ئەو مەعنایەی تێدابوو کە: زوڵم و زۆرداری ژاندارم و کار بەدەستە زاڵمەکانی تاران لە بەین چوب وو، سێبەری ڕەش و چەپەڵی حکوومەتی شایەتی تاران لە سەر کوردستان لا چو بوو. بە زۆری سەر نێزە لاوان و کورانی کوردیان بە « دیلی و سۆغرەیی» نەدەبردە «سەربازی» و گەلی کور بە نێوی ناحەز و چەوتی «دفاع ازوطن» بە گژ نەتەوەکانی تری ئێراندا نەدەکرا و براکوژی و شەری ناو خۆیی لە هێنچوو عومر و ژیانی رۆڵە کوردەکان لە ڕێگای خزمەت بە فەرهەنگ و معارفی ئیستعماری بە فیرۆ نە دەرۆیی. ژن و پیاوی کورد لیباسێکی نەتەوایەتی کە دەیان هەزا رساڵ لە مەو بەر خوو ڕەوشتی پێگرتبوو بە دڵنیایی دەبەری دەکرد و بەکاری دەهێنا. خاک و خۆڵ و ئاو و چیا و نیشتمانی خۆشە ویستی خۆی لە خۆی دەزانی و بە تەواوی هەستی دەکرد کە: بە بێ خەفەتی و دڵخۆریەیی بە ئازادی لە سەر خاکی کوردستان پیاسە و کار وخەبات دەکا و قانونی زۆرە ملی کاربەدەستانی حکوومەتی تاران لە گۆڕدا نەما. لە لایەن مەئمورینی حکوومەتی چەرمە سەر و ئازار هەڵگیرا. لە تەواوی ماوەی ٢٠ساڵ دیکتاتۆری ڕەزاشادا

نەتەوەی کورد لە سەر خاکی کوردستان وەک وەی وابوو کە لە نێو پۆلوی ئاگر،یان بە سەر سەر نیزەوەدیە . قازی محەممەد پێشەوا و سەرۆکی حکوومەتی دیموکرات لە کۆبوونەوەیەکی خۆی لە گەڵ پاشای ئێران لە تاران بە ئاشکرادەری بری کە:« پیاو هەرچی بچێنێ ئەویش دەدروێنێتەوە. حکوومەتی مەرکەزی لە ماوەی ۲۰ساڵاندا هەل و فرسەتێکی وا بوو کە دەیتوانی تۆوی برایەتی و داد پەروەری بە کوردستان وەربکا. بەڵام هەمیشە تۆوی ناکۆکی و زوڵم وزۆرداری چاند. هەمیشە سەر نیزەی چاند و ئێستاش بەرهەمی هەڵدەگرێتەوە...»

بیرەوەری یادی شەهیدانی رێگای رزگاری کوردستان بۆ لێو بەباری و هەناسە ساردی نیە. بەڵکوو بزێتەوکردنی هەست و بیر باوەری نەتەوایەتی لە سەر رێبازێکی نوێی شۆرشگێڕانە لە هەل و فرسەتێکی تازەی دونیای ئەورۆ دایە کە بۆ گەلی کور دهاتۆتە پێش. بیرو باوەری شەهیدانی ح.د.ک. دەبێ ببێتە هۆی ئەوە کە: بیرو راوێژی ئێمە لە کار و خەباتی نەتەوایەتیدا بێوچان بە تینترو هەنگاوی شۆرشگێڕانەی نەتەوەی کورد بە هێز تر و پتەو تر بکا.

ئەو شەهیدانە نەمردوون، نامرن، ئەستێرە گەشی ئاسمانی نیشتمانی دیل و یەخسیری کوردانن کە لە هەموو شەوە زەنگێکی خەباتی رزکارکەرانەی زیدی ئیستعمار دە فریای ئێمە دەکەوێ و رێگای شانازی ژیان رووناک دەکەنەوە. هەر وەکی پێشەوای نەمری کوردستان لە سەعاتی پێنجی سەر لە بەیانی ۱۰ی خاکە لێوەی ۱۳۲٦ی هەتاوی لە ژێر پەتی قەنارەدا بەدەنگێکی بەرز گوراندی:

ئەی حکوومەتی گەندەڵی تاران' وامەزانن بە کوشتنی قازی محەممەد بە سەر کوردستاند ئاغایی دەکەن. باش بزانن هەر دڵۆپێک لە خوێنی قازی محەممەد و شەهیدانی کوردستان دەبێتە قازی محەممەدێکی دڵ رەق.

شانازی و سەر بەرزی بە گیانبازی شەهیدانی رێبازی ئازادی کورد و رزگاری کوردستان

شاد بێ گیانی پاکی شەهیدانی رێبازی خەبات و تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

ئەمری بۆ شەهیدانی شۆڕشی پیرۆزی کوردستانی گەرمێن.
شەرەف و سەر بەرزی بۆ خەباتی نەتەوەکەمان و ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان
خاکە لێوە ١٣٤٤ . کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

ئەم بەیاننامەیەش کە پتر بەریز کردنی وشەی بێ ناوەرۆکی سیاسی ڕش کراوەتەوە، ناتوانێ لە هیچ بارێکەوە گۆڕانێکی بەرە و باشی لە حیزبی دیموکراتدا پێک بێنێ.

ئەحمەد توفیق کە بارزانی ئەمر کرد بووی بە حیزب ویشتی دەگرت. بە پشتیوانی چەکدارانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق نە پارەکانی دەگرێ و دەکوژێ و راویان دەنێ. دوای کۆنگرە سولەیمانی موعینی و سەدیقی ئەنجیری ئەندامانی کومیتەی ناوەندی دژی بۆ چوون وهەڵوێستی ئەحمەدتوفیق وەدەنگ دێن. سەدیقی ئەنجیری لە گەڵ برادەرێکی دیکە بۆ چاوپێکەوتنی سەرۆک بارزانی بەرەو بارەگای بارزانی دەکەوێتە رێ و لە(مامەرووتە) میوانی خالیدئاغای حسامی دەبێ و هەر لەوێ بێسەر و شوێن دەچێ.

لە بارەی کوژران و لە بەینچوونی کاک سەدیقی ئەنجیری قسەو باس زۆر کراون و لێک جیاوازن. نە ئەو دەم و نە پاشانیش حیزبی دیموکرات لە سەر ئەم کارەساتە نە هەڵوێستی گرت و نە باسیشی هێنا گۆرێ. تەنانەت ئەو کەسانەی کە دوای ئەحمە دتوفیق بە ناوی حیزبی دیموکرات هەڵدەسوڕان و کۆنفرانسیان دەگرت، قەت لەو جنایەتەیان نە کۆڵیەوە. زستانی ساڵی ١٩٦٦ کاتێ لە بلغارستان بووم. دوکتو رقاسملوی شەهید لە نامەیەکدا بۆی نووسیبووم :....» کاکە خەبەرێکی زۆر ناخۆش و سەیر. کاک نوری ئەحمەد تەها لێرە بوو. باسی ئەوەی دەکرد کە چەند مانگ لە مەو بەر لە رایەت بوە. لەوێ توشی بابی سەدیقی ئەنجیری بوە کە لە کورەکەی دەگەڕا. پاش ماوەیەک لە سولەیمانی موعینی پرسیوە، سولەیمان گوتوویە: بەڵێ ئەنجیری چەندمانگە ونبوە و دیار نیە و ئێمە بۆمان دەرکەوتوە کە ئەحمەدتوفیق لە بەینی بردوە....»

کا ک حەمەدەمینی سراجی لە نامەیەکدا کە لە ١٩٨٩/١/٦بۆ نووسەری ئەم دێرانەی نووسیوە دەڵێ : «.... لە هاوینی ١٩٦٦ سێ ڕۆژ دوای ئەوەی کە لە لێوژە بە یەکەوە لە گەڵ کاک سەدیق و سالار و مەلا سەید ڕەحمان و سەعید نانی نیوڕۆمان خوارد و ئەو بۆ دیتنی حەبیب بەرە و قەسر جێگای رادیۆی شۆڕش چوو. بوو بە دەنگۆ کە کاک سەدیق نانی نیوەڕۆی بەجێ هێشتوە و نەگەڕاوەتەوە. ماوەیەکی زۆر شایعەیەکی سەیر لەم بارەوە بڵاو دەکرایەوە. پەیگیری و دوا کەوتن بە دوای ئەم ڕوو داوەیەد نیشانیدا دوای ئەوەی حەسەنی برازای ئەحمەدتوفیق لە جەماعەتی رادیۆی شۆڕشی دووری خستۆتەوە و بەرە (وەسان)هەڵکشاون. ئیتر سەدیق بە زیندوویی نە دیتراوەتەوە. کاک هەژار ئەگەر لە بیری بێ و حاشای لێ نەکا خۆی ساڵی١٩٧١ باسی چاو پێکەوتنی ئەحمەد و هەرەشە و گوڕەشەی ئەوی کرد کە ئەگەر وابێ ووا بگرێ وەگ سەدیقی کە «تۆیاندوە» بەرهەڵستکارانی تریش دەتۆپێنێ. » چەند مانگ دوای بێ شوێن بوونی کاک سەدیق برادەرانی حیزبی شیوعی لاشەیەکی سەر براویان لە چەمدا دۆزیبۆوە کە پێ یان وابوو دەبێ کاک سەدیق بێ..»

- کاک یوسفی ریزوانی کە ماوەیەکی زۆر لە نێو بزووتنەوە و نیزیک لە کۆڕە سیاسیەکانی هەر تک دیوی کوردستان بوە لە نامەیەکدا بە تاریخی ٩٦/٤/١٥ دەنووسێ:«... کاک سەدیقی ئەنجیریان هێنایە عیراق و بە هۆی مام هەژار بانگێشتنیان کرد و بە دەستی حەسەنی ئیسحاقی وزەکی کامل خەڵکی ئاکرێ کە پێشمەرگەیP.D بوو. شەهید کرا. ئەو ئەندامە کارامەیە بۆ هەمیشە لە بیر کرا و لە هیچ حەدیسێک ناوی نەهێنرا، ئەو کە ئەندامی سەرکردایەتی حیزب بوو، لە حیزبیشدا ناوی گوم بووە لە هیچ لاپەڕەیەکدا باسی نە هاتە ئاراوە.»

- کاک حەسەن ڕستگار ڕۆژی ١٩٨٩/٣/٢٦لە وەلامی پرسیاری مندا سەبارەت بە سەربردەی سەدیقی ئەنجیری گوتی :«... کە خەبەری ونبوونی سەدیقمان زانی وە دوای کەوتم. چوومە لای خالید حسامی لە رادیۆ شۆڕش. چونکە سەدیق لە کن خالیدئاغا نانی نیوە ڕۆی خوارد بوو. خالیدئاغا گوتی :«سەدیق لای من بوە. دوای

نانخواردن کتێبێکی وەرگرتوە چوە لەو سەرە بیخوێنێتەوە، ئیتر نە هاتوتەوە. بەڵام راستی نە دەکرد. پاشان بڵاو بۆوە کە حەسەنی برازای عەولای ئیسحاقی کوشتویەتی. گۆیا حاسڵ وئەوانیشی لە گەڵ بوە. پێشتر دەمانچەیەک بە حەسەنی برازای عەولای ئیسحاقی(ئەحمەد توفیق)بوە کە دەمانچەی مرۆڤێکی بە ریز ون اسراوی کورد بوە.» من لیم پرسی ئەو مرۆڤەن اسراوە کێیە، دەیناسم ؟

مەلاحەسەن گوتی :» عەولای مام سەعیدیە. جارێک لێشم پرسی ئەو دەمانچەی تۆ بۆ بە حەسەنی ئیسحاقی بوە؟ چرژا، تێکچو. گوتی:(راستە ماوەیەک دابووم بە حەسەنی ئیسحاقی. لە کۆتاییدا مەلاحەسەن گوتی:» بێ شک خالیدی حسامی ئاگای لە کوشتنی سەدیقی ئەنجیری هەیە.»

- لە بارەی بێ سەر و شوێن چوونی سەدیق ئەنجیری مەلا عەولای حەسەن زادەش کە تا کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دیموکرات دەروێشێکی مێشک ژەنگاوی ئەحمەدتوفیق بوە و تا نە کراوەتە سکرتێری حیزب قەت باسی ئەم جینایەتەی ئەحمەد توفیقی نە کردوە لە حکایەتەکەی دابە ناوی(نیو سەدە تێکۆشان ) چۆن بوە دانی بەم تاوانەدا ناوە و دەنووسێ:»...صدیق انجیری بە نیشانەی نارەزایی لە رەفتاری تەکرەوانەی کاک احمدتوفیق لە گوندی( لیوژێ) لە ناوچەی ناودوشت کونجی قەناعەتی گرت و پاش ماوەیەک بە شێوەیەکی گوماناوی:'کوژرا. چەندساڵ پاش کوژرانی صدیق انجیری کاتێک احمدتوفیق و مەلاسەید رەشید لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگە رۆیشتن و چوونە نێو دەوڵەتی عیراق احمد توفیق لەلای مەلاسید رشید اعترافی کرد بوو کە صدیق بە دەستوری ئەو و بە دەستی سەید حەسەنی برازای لە ریگای لیوژێ بۆ سورەبان لە سەرەو ژێری وەسان( سێ گوندن لە ناوچەی ناودەشت و دۆلی بالەیان) کوژراوە.( ١٥ )

نەک هەر ئەو بەڵکوو هیچ یەک لەو کەسانەی کە ئەحمەد توفیق کرد بوونی بە کومیتەی ناوەندی و بە شەریکە تاوان. پاش رۆیشتنی ئەحمەد توفیقیش لەم جینایەتەیان نە کۆڵیوەتەوە و هەر باسیشیان نە کردوە.

- کاک سەعید کویستانی لە نامەیەکدا ١٩٨٩/١/١٥بۆی نووسیبووم دەڵێ: «...

هاوینی١٩٦٦ بۆ مەسەلەیەکی گرنگی دەرون حیزبی کە مەبەست پتەوکردنی حیزب و نیزیک بوون لە پارتی بوو، سەفەرێکمان بەرەو لێوژە کە دەفتەری سیاسی پارتی لە وێ بوو رێکخست. لە مامەرووتە شەوێ میوانی کاک خالید حسامی بووین. کاک سەدیقی ئەنجیری دەبوایە بمێنێتەوە چونکە بەیانی قەرار بوو بچێتە لای مستەفا بارزانی بۆ هێندێ وتوێژ لە مەر وەزعی حیزب کە پێکهاتبوو. قەرار بوو کاک سەدیق پاش دیتنی بارزانی بگەڕێتەوە بۆ دەربەند. بەڵام تاسێ رۆژ خەبەرێکی نەبوو. من دوای سێ ڕۆژ چوومە (مامەرووتە)لای کاک خالید حسامی و پرسیاری کاک سەدیق ئەنجیریم کرد. وەڵامی دامەوە کە چۆتە لای بارزانی هاتۆتەوە ئێرە و نەهاری خواردوەو کیسەم بۆ پڕ کردوە لە توتن و رۆیشتوە. پاش چەند رۆژ جارێکی دیکە چوومەوە بۆ پرسیار. ئەو جار قسەکەی پێشووی لە بیرنە مابوو گوتی، کاک سەدیق لیباسەکانی خۆی لە سەر چۆمی شوشت و گوتی: سەفەرێکی دوورم لە پێشەو زۆرم پێدەچێ، زۆرم نان بۆ دانێ. بە هەر حاڵ کاک سەدیق لە مامەرووتە سەری تێدا چوو. تەنیا کاک خالید دەزانی قاتڵی کاک سەدیق کێ یە. پاش ماوەیەک برادەرانی حیزبی شیوعی لە چۆمی نێوان گەلاڵەو دەرگەلە کەلاکێکی بێ سەریان دیتبۆوە لە نێوو نیشانەکانی دەرکەوت کە دەبێ کاک سەدیق بێ کوژرا بێ. کاکە گیان ئەوە گۆشەیەکی بچوک لە بە سەرهاتی کاک سەدیق. هیوا دارم ببێتە مایەی ئەوە کە شتێکی لە سەر بنووسی و یادێکی لێ بکەی.»

دوای بێ سەر و شوێنبوونی سەدیقی ئەنجیری هەر وەک باسکرا لە نێوان کومیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرەی دووەم ناکۆکی توندتر دەبێ. ئەحمەدتوفیق وەک زیز بوون لێیان دوور دەکەوێتەوە و دەچێ لە شێخان دادەنیشێ. توند بوونی ناکۆکی نێوان ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە نامەیەدا پتر خۆ دەنوێنێ کە شەهید سولەیمانی موعینی (یەکی رەزبەری ١٣٤٤ی هەتاوی -٦٥/٩/٢٣ز .بۆ نووسەری ئەم دێڕانەی ناردوە. کاک سولەیمان دەنووسێ: «....وەزعی ناو خۆشمان دیارە باشە ئەمما دیسان ماو مانە. چونکو سەرە خەر و پیاوی کەڵە و لێکەوتوو و خۆ بێن هەرماون کە دەیانەوێ وەک رابردوو بە بێ مەقسەد لێ خوڕن لغاو هەڵناکرن ئەمما

هەرچی دەگەن بۆ هەر جێگایەک دەڕۆن، یا وەک کەری غەریب سەر لە هەر دەرگایەک دەنێن لغاویان بۆ حازر کراوە. لوشکان داوێن، ئەمما لمبۆزی مبارەکیان شکاوە، بڕەم بڕەم و بگرەو دەرکەی جاران نەماوە، ماخولیابوون و پەکیان کەوتوە، لە حالی دەستەو ئەژنۆ دانیشتن دان و بەو زوانە یخدە خۆن...»(١١)

لە لایەکی دیکەوە ئەو روناک بیر و ئەندامانەی حیزب کە ناتوانن لە گەڵ سیاسەت وکەدەوەکانی ئەحمەد توفیق هاودەنگ بن، لێک کۆ دەبنەوە و کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان دادەمەزرێنن.

« ..... بەخۆشی یەوە ئەو رۆژانە کۆ بووینەوە بە نێوی(کومیتەی ئینقلابی حیزبی دیموکراتی کوردستان)شتێکمان پێکهێنا و بە سەرکەوتویی یەوە کۆتایی بە کارەکانی هێنا. خوا لە «پاراستن» بمانپارێزێ زۆر شت هەیە دەبێ بیزانی و بە نامە ناکرێ. کومیتەکەمان لە حەوت کەس لە گورە باشەکان پێکهاتوە کە ناکرێ لە بەر نە بوونی ئەمنیەت نێویان بنووسرێ تا بۆ خۆت دێی و بە تێکرایی چاومان پێک دەکەوێت. زۆر بە شەخسی تۆ هیوا دارین و بە تەواوی لە سەرت ساخ بووینەتەوە و حیسابت لە سەر دەکەین. لە سەر کاک رەحمانی قاسملو زۆرمان قسە کردوە.بە بلاو کردنەوەی قسەکانی ئەحمە دتوفیق کە دەڵێ ناو براو گیراوە و دوڕاوە، هێندێک وەزعی ناو براو بۆ ئێمە تاریکە. هیوا دارین بە تەحقیقاتی زیاتر بە هەموو لایەکمان ئەو مەسەلە روون کەینەوە دیارە نەزەری تۆ بۆ ئێمە لە سەر ناو براو گرنگە. هیوا دارین بێ تعصب لەو بارەوە تەحقیقات بکەی و نەزەری خۆتمان پێ رابگەیێنی، دوایی بڕیاری خۆمان دەدەین. کاکە گیان پەیکە کە بە پەلەیە و راناوەستێ .بەڵکوو زو و بگەرێیەوە لە نێزیک باسی تەواوت لە گەڵ بکەین و بڕیار و بەرنامەی کاری خۆمانت لە گەڵ باس بکەین. لە کۆتاییدا سەرکەوتنت ئاواتە خوازین، هیوادارین لە کارەکانماندا بە پشت ئەستوری رەفیقی وەک تۆ سەر کەوتوو بین و هەر وا بە سەر کەوتنی گەلی کورد تەواو بێت.»(١٢)

. هەر چەند لە بارەی پرۆگرام و سیاسەت و رێبازی ئەم کومیتە یە بەڵگە و نووسراوەیەک بە دەستەوە نیە، بەلام رۆژنامەیەک بەناوی( تیشک) وەک ئۆرگانی

ئەم ڕێکخراوە تازەیە ٣ژمارەی لێ بڵاو دەکرێتەوە. پێکهێنەرانی کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکرات بریتین لە:( حەمەدەمینی سراجی، سمایلی شەریفزادە، سالاری حەیدەری، سەنتار مەمەدی، سەعید کوێستانی، مەلا ئاوارە، مەلا عبدالله عبداللهی( سەرباز). وا دیارە کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکرات لە لایەک سەبارەت بە دژایەتی ئەحمە دتوفیق لەکەلیان و چاوەدێری و فشاری کار بە دەستانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق تێکۆشان و مەیدانی چالاکیان فرە تەنگە بەر دەبێ. لە لایەکی تر لە نێو خۆشیاندا یەکدەست و یەک ئامانج و بیرو ڕاو بۆچوون نابن. چونکە هەر بەدوای پێکهێنانی کومیتەی شۆڕشگێڕیدا زۆری پێناچێ تەنگەیان تێدەکەوێ

«.... لەو کاتە ئاسکە دا نامەیەکی سەنتاری مەمەدی هات و نووسرا بوو:لە و بارو دۆخەدا هەڵناکەم و خۆم ساز کردوە دەچمەوە کوردستان بە ڕێکەوت کاک حەمەدەمینی سراجی و کاک سمایلی شەریفزادە و کاک سالاری حەیدەری لە گوندی خەلانێ لە لای ئێمە بوون. دوای قسە لێکردن و ڕاوێژ لە گەڵ یەکتری هاتینە سەر ئەو ڕایە کە کاک سالاری حەیدەری بچێتە شارۆچکەی سیدەکان لای کاک سەنناری مەمەدی و لەو تەمایەی گرتوویەتی ساردی کاتەوە. ئەیەڵێت جارێ ئەو سەفەرە بکات. نامەیەکمان نووسی و کاک سالار بەرە و سیدەکان کەوتە ڕێ. کاک حەمەدەمین و کاک سمایلیش بەرەو جێگای دانیشتنی خۆیان گوندی سونێ گەرانەوە. من کە چاوە ڕوانی گەڕانەوەی سالارم دەکرد دوای چەند ڕۆژێک لە سیدەکانڕا نامەیەکی کە کاک سالاری حەیدەری بۆی نووسیبووم و بۆی نارد بووم بە دەستم گەیشت لە نامەکەدا نووسرابوو: «دوای ئەوەی کاک سەننارم دی و لەو بارەوە قسەمان کرد منیش هاتمە سەر ئەو ڕایە چیدیکە ڕانەوەستم و لە گەڵی برۆمەوە. پێم وایە دەبێ لە دێڵەزەرد بدەین و لێی نەترسین. دوژمن بەبرێکی کاغەزیە. »(١٣)

مەبەستی سالار لە دێڵەزەرد شای ئێران بوو. مەبەستی لە بەبری کاغەزیش . وەبیرهێنانەوەی قسەکانی مائۆتسەتونگ بوو. بە کورتی کاک سەننار و کاک سالار

بێ مەشوەرەت کردن لە گەڵ ئێمە عەزمیان جەزم کرد بوو بۆ شۆرشێکی چەکدارانە بەرەو کوردستان ڕێگایان داگرتبوو ڕۆیشتبوونەوە. دوای ماوەیەک هەواڵمان بۆ هات کە کاک سەنناری مەمەدی لە تاران دیتراوە و کاک سالاریش لە مەهاباد لە ماڵی خۆیانە...... هەر لەو سەرو بەندەد ابوو مەلا عبدولای سەرباز، واتە عبدولای عبدولاهی ڕۆیشتەوە و چووە ماڵێ و نە هاتەوە. ئێستا بەو پێ یە دەبێ بڵێم چوار کەس لەو حەوت کەسەی کومیتەی ئینقلابی حیزبی دیموکراتی کوردستان ما بووین..» (١٤)

وەک دەبینین کومیتەی شۆرشگێڕی حیزبی دیموکرات هەر لە سەرە تاوە تووشی لەنگ و لۆری دەبێ. ئەندامانی دیکەی کومیتەی شۆرشگێڕی دەیانەوێ جارێ لە ڕێگای کاری سیاسی لەن ێو ئاوارەکانی کوردستانی ئێران لە مەڵبەندی ژێر دەسەلاتی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو تێکۆشان درێژە پێبدەن. بەلام لە لایەن کاربەدەستانی بزووتنەوەی چەکدار ئەوەندەیان فشار بۆ دێنێ ناچار دەبن بەبێ ئامادەیی و دەرەتان و لێکدانەوەی بارو دۆخی خۆجێیی و دەرەوە، ڕوو بکەنەوە چیاکانی کوردستانی ئێران.

ساڵی ١٩٦٧ بۆ ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە ئێران ڕاونرا بوون و پەنایان بۆ کوردستانی عیراق و بۆ ناوچەی ژێر دەسەلاتی بزووتنەوەی چەکداری هێنا بوو، دەکرێ بە ساڵێکی ڕەش و شووم دابنرێت. بە تایبەت بۆ ئەو کەسانە کە ناچنە ژێر باری دیکتاتۆری و ملهوڕی ئەحمەد توفیقەوە. کار بەدەستانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق دەست دەکەن بە ڕاونان و گرتنی کوردە ئێرانیەکانی ئەندامی حیزبی دیموکرات و دەیاندەنەوە بە ئێران.

# گەڕانەوە بۆ کوردستانی ئێران وتووشبوونی خەباتی چەکداری

شەهید سولەیمانی موعینی کە لە پێشدا هاو کار و هاو دەستی ئەحمەد توفیق و کەسی دووەمی جەرەیانی عبداللە ئیسحاقی بوو، دوای تێکچوونی لە گەڵ ئەحمەدتوفیق دەکەوێتە بەر هەرەشە و مەترسی کاربەدەستانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق و لە ترسی گرتن و تەحویلدانەوەی بە حکوومەتی ئێران لە گەڵ هێندێ لە ئەندامانی حیزب دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی ئێران. بەر لە هەموو شت بۆ کاری تەبلیغاتی و روونکردنەوەی کۆمەلانی خەلک، گۆڤارێک بە ناوی( رۆژ ) وەک ئۆرگانی لقی ۳ ی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە ٦ لاپەڕە دا بەڕۆنیۆ بڵاو دەکاتەوە، لە سەرلاپەرەی هەوەڵی رۆژنامەکەدا نووسراوە:(یەکێتی ــــ خەبات ــــ سەر بەخۆیی ــــ دێموکراتی)

(کوردستان خۆرادەپسکێنێ و بە سەر هەمو وبەر هەڵستێکدا زاڵ ئەبێت )

دروشمی سەرەکی گۆڤاری رۆژ بریتی یە لە:«...بەرەی یەککگرتووی نیشتمانی نێوان حیزبەکانی شۆڕشی و نیشتمانی بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و داگیرکەری ئالای خەباتمانە بۆ ئازادیٚ ئێران و پێکهێنانی حکوومەتێکی نیشتمانی و دێموکراتی و دیاری کردنی لانی کەمی مافی نەتەوایەتی و پەرەی ئاشتی و ئاسایش لە جیهان. حاکمیەتی میللی و دێموکراتی ژیانی خۆش و بەختیاری نەتەوەی کورد ئامانج و دروشمی خەباتمانە. خەبات و سەرکەوتنمان بۆ قایم بوونی دۆستایەتی نێوان نەتەوەکانی ئازادیخواز و پشتگری بزووتنەوەی گەلانی ولات داگیر کراو و زیدی ئیمپریالیستی لە سەرانسەری جیهانە.

هەر چەند رۆژنامە کە لە بار  و دۆخێکی دژوار بە رۆنیۆ بڵاوکراوەتەوە، ناو ئاخنەکەی نیشانی دەدا کە لە لایەن خەڵکەوە پێشوازی لێکراوە و لە شوێنی گرنگی ئەرتەشی ئێران و دەزگا دەوڵەتیەکاندا دەستی هەبوە و بەڵگەی فرە نهێنی ئەرتەشی ئێرانی وە دەست هێناوە کە نیشانی دەدەن حکوومەتی ئێران لە راپەرینی چەکدارانەی حیزبی دیموکراتی کوردستان کەوتۆتە دڵە راوکەو بە لایەوە مەسەلەیەکی گرنگی رۆژ بوە. ئەمەش لەم تێلگرام و نووسراوانەدا دەر دەکەوێ کە لە نێوانی فەرماندەکانی لەشکری ئێراندا سەبارەت بە بار و دۆخی کوردستان لە گۆڕینەوەد ابوە و لە ژمارە ١و ژمارە ٣ ی ئوکتۆبری ١٩٦٦ و ژانویەی ١٩٦٧ گۆڤاری ( رۆژ )دا بەمجۆرەی خوارەوە بڵاو کراونەوە :

«..... نهێنی لە کرماشانەوە تیمسار فەرماندەی ئەرتەشی یەکەم. بەدوای نووسراوەی ١٣٩٨/١١/٧/٤٤ مەهاباد تیمسار یاریدەدەری ئەرتەشی یەکەم. بە دوای ژمارەی سەرەوەدا، ناردراوی ئەرتەشی یەکەم، بۆ ئاگاداری:

١- لە بارەی چوونی دوو ئەفسەری میسری بۆ پێنجوێن. لە بەر دووری لە ناوچەی ئاگاداری لەشکر لێکۆڵینەوەی لە توانا دانیە.

٢- لە بارەی دنەی عبدالناسر لە ناو کوردەکانی ئێران. هەر وەک لە ژمارە___ ١٩٦٥/١٤/٦/٤٤ی رەمز پێت راگەیەنراوە، رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە هۆی کۆمونیستەکانی عیراقەوە لە گەڵ دارودەستەی عبدالناسر پێوەندی یان گرتوە و لایەنگرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بانە و سەقز و بۆکان و مەهاباد و سەردەشت و نەغەدە و خانە و ورمێ و دەورو بەری شاپور و خۆی، بە تایبەت لە ناوچەی مەنگوڕان دژی بەرژەوەندی کیشوەری شاهەنشاهی دەبزوونەوە. ناوی ئەو کەسانەی کە تا ئێستا گەیوەتە دەستی جاسوسەکانمان بە هۆی ژمارە - ٧٥١ - ٢/٢١/٤/٤٤ پێشکەش کرا. »

ژمارە ٩٧٦٠ - ٢ /٢٦/٧/٤٤ سەر لەشکر ئەحمەدی، لە لایەن سەرتیپ ئەجمی نژاد، لە لایەن سەرۆکی ستادی لەشکری ٤ پیدە، سەرهەنگ ستاد مهام

١- تیپی ١٢ی خانە، بەدوای ژمارە ٩٥٣٧ - ٢/٢١/٧/٤٤ بۆ ئاگاداری

٢- سەرۆکی سازمانی ئەمنیەت وئیتلاعاتی ئازەربایجانی رۆژئاوا بەدوای ژمارە ٤٤/٧/١١/١٣٩٩٨ ناردراو لە لەشکری یەکەمەوە بۆ ئاگاداری.

٣- فەرماندەی ناحیە ١٠ی ئازەربایجانی رۆژ ئاوا، بە دوای ژمارەی سەردوەدا، ، تێلگرامێکی دیکە: «.... نهێنی و راستەو خۆ. لە لەشکری ٧ وە فەرماندەی تیپی ٢١و٢٠. بە گوێرەی ئاگاداری گەیشتوو رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بڕیاریان داوە کە ئەفراد و دار و دەستەی حیزبی بە دەستەی جیاوازی پارتیزانی دابەش بکەن و لە سەعاتێکی دیاریکراودا لە تەواوی ناوچە کورد نشینەکان، چەکداران بۆ ناوچەکانی جیاوازی سنووری هەرێمی رۆژ ئاوایان بنێرن و پاسگاکانی ژاندارمەری پەلامار بدەن و مەئمورەکان چەک بکەن و لە کاتی بەربەرەکانیدا بیشیان کوژن. مەبەستیان لەو کارە پێکهێنانی ناوچەی ئازاد و قایم و ئاژاوە نانەوەیە لە ئێراندا. گۆیا ئەفرادی حیزبی غەیرە قانونی تودەش هاو کاریان دەکەن. ئەمر بکەن تیپەکانی لەشکر ئاگاداری ووریایی تەواویان هەبێ. لەم بوارەدا توێژینەوەی ئاقلانە بکەن و نەتیجەش رابگەیێنن. ٥٥١٠ ٤٤/٨/١٩ سەرتیپ سلحشور.»

تێلگرامێکی دیکە : « .. زۆر بە خێرایی - تاران - بە گوێرەی ئاگاداری لە ناوچەکانی رۆژ ئاوا هێندێ رووداوە قەوماون. هەر ئاگاداریەکی تازە هەرکاتێ پێتان بگات، دەستبەجێ بە مەرکەزی رابگەیێنن. ٢٨٠٢ - ٢٠/ ٤٥/٨/٢٢ سەرهەنگ ئەمجەدی.»

## دەکرێ لەچەند بارەوە سەرنجی ئەم تێلگرامانە بدەین کە لەرۆژنامەی رۆژ دا بڵاو کراونەوە.

یەکەم : حکوومەتی ئێران تا ساڵی ١٩٥٩کە رێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات دەکەونە بەر پەلاماری ساواک و سەدان ئەندامی حیزبی دیموکرات دەگیرێن ودەکەونە بەر ئازارو ئەشکنجەو زیندانی دەکرێن. قەت ناوی حیزبی دیموکراتی نە

هیناوه. ئەندامانی حیزبی دیموکرات بە تاوانی تودەیی دەگیران وزیندانی دەکران.و حیزبی دیموکراتی بە دەستکردی بێگانە ناودەبرد * بەلام ئیستا ئیتر حیزبی دیموکرات بە هێزێکی مەترسیدار بۆ (کیشوەری شاهەنشاهی) ناو دەبات.

دووهەم - بە درۆ ناوی ئەفسەرانی میسری دێنێتە گۆڕێ بۆ ئەوەی خەباتی حیزبی دیموکرات بە بێگانەوە بلکێنێ.

سێیەم - ترسی لە خەباتی چەکدارانەی حیزبی دیموکرات لە رادەیەکدایە سەرەرای هاو کاری بزووتنەوەی چەکداریی کوردستانی عیراق، مەلبەندی کوردستان دەکاتە ناوچەیەکی نیزامی و پادگانی جەلدیان دەکاتە ناوەندی زیندان و کوشتاری ئازادیخوازانی کورد و فەرماندەی گشتی ژاندارمەری ئیران دەگرێتە بەرپرسی پەلاماردان و لێدانی کوردستانی ئیران.

حکوومەتی ئیران بە ئەرتەش و ژاندارم و هاوکاری بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عیراقیش دلی ئۆقرە ناگرێ، جاش و زۆلەکوردان چەکدار دەکات و بە گژ شۆرشگێرانی حیزبی دیموکراتیان دادەکات. سوپەهبد ئووەیسی فەرماندەی گشتی ژاندارمەری ئیران سەرەک عەشیرەت و ئاغا و کوێخاگەلی ناوچە لە پێگەی جەلدیان کۆ دەکاتەوە و داوایان لێدەکات :

١ پێویستە بۆ لە ناو بردنی (بە قسەی ئەو) چەتەکان و سەقامگرتویی و هێمنایەتی ناوچە، لە گەل ئەرتەش و ژاندارمەری هاوکاری بکەن.

٢ - ئەو سەرەک عەشیرەت و ئاغایانەی کە دەولەت بروایان پێدەکات، دەبێ خۆیان و کوڕ و کەس و کاریان چەک هەلبگرن و نابێ ئەو چەکەش بدەن بە رەعیەتو ژ محەمەتکێشان. نابێ بە هیچ جۆر رێگا بدەن (چەتەکان) تخوون ئاوەدانی بکەون.

---

ئەوە نەک هەرحکوومەتی ئیران،بزووتنەوەی کوردی هەمیشە بەدەستکردی بێگانە تاوانبار کردوە، بەلکوو کۆنە پەرستی نێو حیزبی دیموکراتیش هەمیشە ئەندامانی تێکۆشەر و زیر و خاوەن بیرو راو بە شەخسیەتیان بە تودەیی ناو بردوە. تەنانەت لەم دواییانەشدا بە تایبەت کە دوکتورقاسملوی شەهید (ئەخلاق و دیموکراسی) هێنا بوە نێو حیزبی دیموکرات، ئەوانەی دەنگیانان دەر بڕیبایەو رەخنەیەکی دلسۆزانەی بۆ بەرژەوەندی بزووتنەوە و حیزبی دیموکراتی گرتبایە، بە تاوانی لایەنگری لە بیرو باوەری تاقمی حەوت کەسی و بە تودەیی تاوانبار دەکران و باهاسانی لەحیزب دەر دەکران.

# کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان

ئەندامانی کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە هێشتا لە ناوچەی بەروالەت ئازاد کراوی کوردستانی عیراق دەمێننەوە هەول دەدەن بەڵکوو سولەیمانی موعینی بگێڕنەوە و کارێکی وا نەکرێ کە ژانەسەر و کۆسپ بۆ بزووتنەوەی کوردستانی عیراق سازبێت. بەڵام لە بەرانبەر هەست و ویستی سادقانەو دڵسۆزانەی ئەندامانی کومیتەی شۆڕشگێڕدا، جگە لەوەی کە بزووتنەوەی چەکداری کوردستان پێشمەرگەیەکی زۆر بۆ کوردستانی ئێران وەدوای سولەیمانی موعینی دەخات کە بە زیندوویی یا مردوویی بیگرن و بیهێننەوە، بە ئەندامانی کومیتەی شۆڕشگێڕیش رادەگەیێنن کە: «...بۆ کوردە ئێرانیەکانی دانیشتووی کوردستانی عیراق تاقە دوو رێگا هەیە: (توانەوە لە ناو شۆڕش و دەست لە ئێران هەڵگرتن. یا چوونەوە بۆ ئێران و دەست لە عیراق هەڵگرتن. دەنا رێگە نادەین ئەوانەی لێرەن بچن لە ئێران حیزبایەتی بکەن.»)*
(لەنامەی سراجی بۆنووسەر)

ئەم هەڕەشە و پێڕاگەیاندنە ئەندامان و لایەنگرانی کومیتەی شۆڕشگێڕی دەخاتە مەترسی گرتن و دانەوەیان بە ئێران. بە تایبەت کە وەک باسکرا چەند

---

* بە داخەوە لەو کاتەوە تا ئێستاش کە ئەم دێڕانە دەنووسمەوە ئەم سیاسەتە درێژە لە لایەن هێندێ لە رێبەرانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراقەوە دژی ئازادیخوازانی کوردستانی رۆژهەلات بەرێوە دەچێ و بەرژەوەندی نەتەوەیی دەخرێتە ژێر بەرژەوەندی شەخسی و تاقمگەری و حیزبایەتی بەرچاو تەنگ و بە ناوی(کوردایەتی)ش ئەم سیاسەتە چەوتە دە رازێنەوە.

کەس لە ئەندامانی حیزبی دیموکرات دەگرن و تەحویلی ئێرانیان دەدەنەوە . بە دوای ئەو هەرەشە و پێڕاگەیاندنەدا ئەندامانی کومیتەی شۆرشگێری لە ناوچەی نیزیک سنوور دادەگیرێنەوە خوارێ و لە سەنگە سەر گلیان دەدەنەوە. لە ئاکامدا ناچار دەبن ناوچەی ژێر دەسەلاتی بە ترسی بزووتنەوە بەجێ بێلن و روو بکەنەوە چیاکانی کوردستانی ئێران و لە نێو گەلەکەیاندا خەبات بدۆمێنن.

لەو ماوەیەدا لە ناوچەی لاجانی پیرانان، کوڕە جوتیارێکی هەژار ی خەلکی گوندی (چەڕان )بە ناوی مرادشیرێژ لە دەست زولم و زوری ژاندارمەی حکوومەتی وەگیان دێت و یاغی دەبێ. چەند کەس لە دەوری خۆ کۆ دەکاتەوە و ژانە سەر بۆ کاربەدەستانی دەولەتی و ژاندارمە ساز دەکات. لە چەند پێکهەلپرژانێکدا لە گەل ژاندارمە، کار بەدەستانی دەولەتی دەزانن خۆیان مراد شیرێژیان بۆ لە بەین ناچێ. بە گوێرەی سیاسەتی هەمیشەیی دێنە سەر ئەو بڕیارە کە هێزەی لە خۆی بۆ سازکەن. چەند قولە ئاغای وەک حەمەدەمین چیچو، مرادی دروی، رەسووی عبدالصمد و رەسووی خەرابە و ئارەحمانی شێلمجاڕان چەکدار دەکەن و وە دوای مراد شیریژیان دەخەن. ئەو خۆ فرۆشانە بە بیانووی راونانی مرادشیرێژ دەست دەکەن بە راو و رووت و ئازاری دێهاتیەکان و لە ژاندارم خەراپتر ئاگر دەکەنەوە.

کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکرات پاش ئەوەی لە گەل سولەیمانی موعینی یەک دەگرنەوە، بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کوردستانی ئێران لە پەرش وبلاوی رزگار بکەن و لە ژێر رێبەرایەتی و ناوەندێکدا کۆی کەنەوە و تەبلیغاتی رێژیمی ئێرانیش لە بارەی بوختانی ( چەتە و ئەشرار) بەبزووتنەوەی کورد پوچەل کەنەوە، مرادشیرێژ و تاقمەکەشی رادەکێشنە ژێر کونترۆل و لە کۆبوونەوەیەکی بەریندا «...بیست و یەک کەس بۆ رێبەرایەتی بزووتنەوە هەلدە بژێرن و بڕیار دەدەن تا پێکهێنانی کۆنگرەی سێ یەمی حیزب، لە جیاتی ناوی (حیزبی دیموکرات) بە ناوی ( کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان) خەبات درێژ پێبدەن. »*

---

* لەبارەی مراد شیرێژەوە زۆر قسە کراوە. چونکە ئاگاداری تەواوم بەدەستەوە نیە، ناتوانم زیاتر باسی بکەم. بەلام هیوادارم ئەوانەی لەمەسەلەی مراد شیرێژ ئاگادارن، نەهێلن خەباتی کوڕە جوتیارێکی کورد هەروا بێدەنگ وناو پوش بەسەر بکرێ.

سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە سێ کەس لە ڕێبەرانی کومیتەی شۆرشگێری(سولەیمانی موعینی و حەمەدەمینی سراجی و سمایلی شەریفزادە) هەریەک بە جیاو بە گوێرەی دەرفەت و دەرەتانیان نامە بۆ ڕێبەرایەتی حیزبی تودەی ئێران دەنووسن و لە گەڵ ڕوونکردنەوە بار دۆخی وڵات وهەل و مەرجی خەبات داوای هاو کاری و پشتیوانی لە حیزبی تودە دەکەن. ڕۆژنامەکانی( ڕوژ وتیشک) یش بۆ ڕێبەرایەتی حیزبی تودە دەنێرن. لە ئەنجامی نامە نووسین و پێوەندیدا، ڕێبەرایەتی حیزبی تودە دێتە سەر ئەو بڕیارە کە لە نێزیکەوە پێوەندی یان لە گەڵ بگرێ و لە بارەی هاوکاری و چۆنیەتی خەبات و هەڤالبەندی وتو وێژیان لە گەڵ بکات.لە ئەنجامدا ڕوژی ۱۹٦٨/٢/٢٩ لە بەغدا کۆبوونەوەیەک لە لایەن دوکتور رادمنیش سکرتێری حیزبی تودە و دوکتور قاسملو و سولەیمانی موعینی، حەمەدەمینی سراجی و کەریمی حسامی پێک دێت. لە سەرەتاوە سولەیمانی موعینی دەڵێ :«پێم خۆشە بزانم دەستەی نوێنەرایەتی لە هەر تک لاوە کێن؟ ئەوەندەی پێوەندی بە کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتەوە هەیە، کاک کەریم و کاک حەمەدەمین و من بەشداریین. * پێم خوشە دوکتوررادمنیش نوێنەری خۆیان بڵێ. دوکتورقاسملو ڕوو دەکاتە سولەیمان ودەپرسێ:« کاک سولەیمان باشترە ئێمە لە سەر یەکتر ڕون بینەوە. پێم خۆشە بزانم ئێستا بیرو ڕات لە بارەی منەوە چۆنە؟

کاک سولەیمان دەڵێ: « پاش دیتنی کاک کەریم لە سەر تۆ هیچم نیە،بۆم ڕوون بۆتەوە ئەوەی لە سەر تۆ گوتراوە هەو نەبوە.

دوکتور رادمنیش دەڵێ: «لە لایەن حیزبی تودەی ئێرانەوە من و دوکتور قاسملو ئەو ئێرە ئامادەین .»

پاش چوار ڕوژ ئاخافتن و باس و لێکۆلینەوە بە تێکرایی دەنگ لە سەر بڵاو

---

*هەر ک گەڕاینەوە و برادەرانمان کرتەوە کۆبوونەوەیەکمان پێکهێنا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و دارشتنی پلاتفۆرمی کار. بۆ بەڕیوەبەرایەتی ۲۱کەس دیاری کران کە لە وانە یەکیان نێوەن..» نامەی حەمەدەمینی سراجی بۆ نووسەر.(١٦ )

کرینه‌وه‌ی ئه‌م به‌یاننامه‌ی خواره‌وه ساغ بوونه‌وه:

«... له سه‌ره‌تای مانگی فیوریه‌ی ۱۹٦۸ کۆبوونه‌وه‌ی راوێژی ده‌سته‌ی نوێنه‌رایه‌تی بیروی سیاسی حیزبی توده‌ی ئێران و کومیته‌ی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان پێکهات. چه‌ند رۆژ درێژه‌ی هه‌بوو. پاش گۆرینه‌وه‌ی بیروڕاو و تووێژی به‌رده‌وام له باره‌ی گشت مه‌سه‌له‌کانی به‌ر چاو، کۆبوونه‌وه گه‌یشته ئه‌و ئه‌نجامانه‌ی خواره‌وه:-

۱ - له باره‌ی ڕێبازی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

نوێنه‌رانی کومیته‌ی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان، به درێژی ڕێبازی سیاسی ئه‌و حیزبه و جولانه‌وه‌ی چه‌کداری که ده‌ست پێکراوه، روونیان کرده‌وه. پاش ده‌ربرینی بیروڕای به‌شداربوه‌کانی کۆبوونه‌وه ده‌رکه‌وت که له هێلی بنچینه‌یی ڕێبازی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستان و حیزبی توده‌ی ئێراندا هیچ ناته‌بایی یه‌ک نی یه. ئه‌م هێلانه به‌مجۆره‌ی خواره‌وه کورت ده‌کرێنه‌وه:

ئه‌لف - ح. ت. ا و ح. د. ک بزووتنه‌وه‌ی خه‌لکی کورد له کوردستانی ئێران به به شێک له بزووتنه‌وه‌ی گشتی گه‌لانی ئێران ده‌زانن. ح. د. ک خه‌باتی تێکڕایی گه‌لانی ئێران دژی ئیمپریالیزم و ڕێژیمی دژی دیموکراتی و دژی گه‌لیی شا به ئامانجی بنگه‌هی خۆی ده‌زانی.

ب - ح. ت. ا و ح. د. ک بزووتنه‌وه‌ی میللی گه‌لی کورد به به‌شێکی جیا نه‌بووه‌ی بزووتنه‌وه‌ی دیموکراتی گه‌لانی ئێران ده‌زانن. رماندی ڕێژیمی کۆنه په‌رستی شاو دابینکردنی دیموکراسی و مافی ئینسانی بۆ هه‌موو خه‌لکی ئێران ئامانجی هاو به‌شی هه‌ر تک حیزبه.

ج - هه‌ر تک حیزب له سه‌ر ئه‌و باوه‌ره‌ن که گه‌لی کورد مافی خۆیه‌تی وه‌ک هه‌موو گه‌لانی ئێران چاره نووسی خۆی به ده‌ستی خۆی دیاری بکا. دروشمی میللی ح. د. ک بریتی یه له: دابینکردنی مافی نه‌ته‌وایه‌تی گه‌لی کورد له کوردستانی ئێران، له سنووری چوار چێوه‌ی ولاتی ئێراندا. ئه‌و ئامانجه به شکلی ئیتحادی داخوازانه‌ی گه‌لانی ئێران له پێکهێنانی یه‌ک ده‌وله‌ت دا(اتحادفدراتیو)

خۆ دەنوێنێ.

د - هەر تک حیزب لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە کوردستانی ئێراندا وەرزێران هێزی گرنگی شۆڕشن. هیچ جوڵانەوەیەک لە کوردستان بە بێ بەرز کردنەوەی دروشمی روون و ئاشکرا بە قازانجی ورزێران ناتوانێ سەر بکەوێ. تەنیا بە راکێشانی وەرزێران و زەحمەتکێشانی دیکەی کوردستان بۆ لای شۆرش، دەکرێ قوڵتر بکرێ و جوڵانەوەی میللی بکرێ بە بزووتنەوەیەکی بەرینی دیموکراتی گۆمەڵایەتی. بۆ ئەو ئامانجە پێویستە دروشمی روون بۆ وەرزێران بە گوێرەی بارودۆخی هەر ناوچەیەک، لە دابەشکردنی زەوی یەوە بگرە تا نەدانی قیستی زەوی و ئیجارە بەرز بکرێتەوە.

٢ - لە بارەی راپەڕینی چەکدارانە :

هەر تک حیزب لە سەر ئەو باوەڕەن کە بزووتنەوەی چەکداریی ئێستا کە لە کوردستانی ئێران ساز بوە، ئەنجامی فشاری کۆنەپەرستی ئێرانە بۆ سەر کەلی کورد و سەر کوتکردنی هەموو چەشنە خۆ تواندنێکە بۆ بەرگری لە مافی میللی و دیموکراتی گەلانی ئێران. هەر تک حیزب ئەم راپەڕینە چەکداری یە بە هەنگاوێکی بەسەر دابڕاویی دەزانن و بە کارێکی لە باری دادەنێن و دەستخۆشانە لەو هاورێیانە دەکەن کە توانیویانە هەڵوێست و بزووتنەوەی چەکدارانە بپارێزن. بە لە بەر چاو گرتنی هەل و مەرجی ئێستا، ئامانج بریتی یە لە: پاراستنی ئەم بزووتنەوە چەکداری یە ، بە هێزک ردنی سیاسی و رێکخراوەیی ئەو، پەروەردەکردنی کادر و ئامادەکردنی زەمینەی فیکری لە نێو خەڵکی کوردستانی ئێران و سەرانسەری ئێراندا بۆ پەرە پێدانی ئەو بۆ ناوچەکانی تری کوردستانی ئێران و ئێران بە چەشنی گشتی. سەرەرای بارو دۆخی بابەتی و شۆرشگێری ب بۆ ئەو کارە پێویستە رێکخراوەکانی حیزبی لە کوردستان زیندوو بکرێنەوە و بە هێزبکرێن. لە شارەکانیش بنکە و رێکخراوی حیزبی پێک بێنن، ئەو دەم دەکرێ وردە وردە و بە بێ شێواوی خەباتی چەکدارانە پەرە پێ بدرێ.

٣ – لە بارەی شکڵی ڕێکخستنی تێکۆشان لە کوردستان :

ئەلف – هەر تک لا ڕێک کەوتن کە لە کوردستان بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان خەبات بکرێ و ڕێکخراوەکانی ئەو حیزبە زیندوو بکرێنەوە،

ب – هەر تک حیزب لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە چوار چێوەی وڵاتی ئێراندا هەموو ڕێکخراوە مارکسیستی یەکان لە حیزبی چینی کرێکاری ئێران، حیزبی تودەدا کۆ ببنەوە. حیزبی دیموکراتی کوردستانیش لە بارەی ڕێکخراوەیی و سیاسی و فکری دەبێ بۆ ئەم یەکێتی یە خۆی ئامادە بکات. بە لە بەر چاوگرتنی هەل و مەرجی ئێستا لە کوردستان پێویستە لە پلەی یەکەمدا ڕێبەرایەتی مارکسیستی لە حیزبی دیموکراتی کوردستان دابین بکرێ. پاشان وردە وردە بکرێ بە حیزبێکی مارکسیستی بە بەرنامەیەکی مارکسیستی یەوە.

ج – دەستەی ڕێبەرایەتی ح. د. ک ڕایگەیاند کە مەسەلەی یەکێتی ڕێکخستنی حیزبی سەرانسەریی ئێران لە هەوەڵین کۆنفرانس و کۆنگرەی خۆیدا دێنێتە گۆڕێ و تێدەکۆشێ کە هاودەنگی کۆنفرانس یان کۆنگرە بۆ ئەنجامی ئەم یەکێتی یە وەدەست بێنێ.

د – بڕیار درا ڕۆژنامەی کوردستان جارێ هەر وا بە شێوەی پێشوو لە ئوروپا بلاو بکرێتەوە.

هـ – تا ئەو کاتەی کە یەکێتی ڕێکخراوەیی پێک نەهاتوە، هەرتک لا ڕێک کەوتن لە بارەی هەموو هەنگاوە سیاسی یە گرنگەکان کە پێوەندی یان بە بزووتنەوەی خەڵکی کوردەوە هەبێ و هەر پێوەندی یەکی لەو بارەوە لە گەڵ هێزا ڕێکخراوە سیاسی یەکانی دەرەوە و ژوورەوە دەگیرێ پێکەوە ڕاوێژبکەن و بۆ هەنگاو نان و پێوەندیی ناوا ڕێک کەون

و – هەر تک لا ڕێک کەوتن هەل و مەرجێک پێک بێنن کە پێوەندی بەردەوام و ڕێک و پێک لە بەینیاندا بە ر قەرار بێ.

٤ – لە بارەی داخوازی یەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان :

١ – دەستەی نوێنەرایەتی ح. د. ک. داوا لە حیزبی تودە دەکات کە:

ئەلف - بۆ پەروەردەی کادرلە کوردستان یارمەتی پێویست بکا و بۆ فێر کردنی رێ و شوێنی کاری رێکخستن و پەروەردەی سیاسی کلاسی ماوە کورت (یەک مانگەو دوو مانگە) لە کوردستانی ئێران و یا عیراق ساز بکرێ.

ب - هێندێ لە هاوڕێ یانی کورد بۆ پەروەردەی نیزامی و فەننی بۆ ماوەی سێ تا چوار مانگ بۆ دەرەوە بنێردرێن.

د - هەموو ساڵێ هێندێ خوێندکاری کورد (نیزیکەی پێنج کەس) بۆ خوێندن بنێردرێنە وڵاتانی سۆسیالیستی.

- بۆ ئامادە کردنی ئەو شتانەی کە بۆ هەل و مەرجی ئێستا پێویستن، بۆ پاراستنی بزووتنەوەی چەکدارانە لە کوردستانی ئێران بۆ چەک و تەقەمەنی هەنگاو بهاوێژرێ.

- رادیۆی پەیکی ئێران سەرنج بداتە بزووتنەوەی چەکداریی گەلی کورد بە تایبەت لە بەرنامەی کوردیدا ئامانج و دروشمەکانی ئەو جولانەوەیە بلاو بکاتەوە و گەلانی ئێران وریا بکاتەوەو تەبلیغاتی کۆنە پەرستی ئێران و ئیمپریالیزم پوچ کاتەوە.

- یارمەتیەکی مالی بە ح. د. ک. بکرێ، و بۆ داهاتووش یارمەتی بەر دەوام و رێک و پێک لە بەر چاو بگیرێ. ویستی ح. د. ک ئەوەیە پێویستە ئەو پەری یارمەتی بکرێ بۆ ئەوەی لە پلەی یەکەمدا وەزعی کادرەکان و خاو و خێزانی گیراوەکان و پێشمەرگە رێک و پێک بکرێ. لە گەڵ پەرە گرتنی جولانەوە یارمەتی مادیش پەرە پێبدرێ.» ( ئەم بەیاننامەیە لەبەرگی ۲ بیرەوەری یەکانی نووسەر وەرگیراوە .)

بە داخەوە نێوەرۆکی ئەم بەیاننامەیە هەر لە سەر کاغەز مایەوە. دوو بەرەکی و کێشە و هەرای نێو خۆی رێبەرایەتی حیزبی تودە، رێگای ئەوەی نەدەدا کە یارمەتی بە بزووتنەوەیەکی چەکداری بکرێ لە کوردستانی ئێران. یان ئەگەر وردد تر روونی کەینەوە، رێبەرایەتی حیزبی تودە خەسلەتی شۆڕشگێری و وزەی خەباتی شۆڕشگێری لە یاراندا نە بوو. هەر بیریشیان لە مەسەلەیەکی ئاوا نەدە

کردەوە. لە کۆبوونەوەی بەغدا دوکتور قاسملوو هەولی دا کە ئەو رۆژنامەیە هەر لە ئورووپا وەک ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بلاو بکرێتەوە. حەمەدەمینی سراجی و سولەیمانی موعینی و کەریمی حسامی وتەنانەت دوکتور رادمەنیش-ش دژی ئەوە بوون. نە دەکرا حیزبی دیموکرات لە کوردستان و دوو کەس لە ئورووپا ئۆرگانی حیزب بلاو بکەنەوە. ئەو کارەی کە عەلی گەلاوێژ و دوکتور رەحیمی قازی لە باکو دەیان کرد. *

ئەوەی رێبەرایەتی حیزبی تودە لە دەستی دەهات و دەیکرد، بە قەولی شەهید حەسەنی قزلجی، راوی سەر کاغەز بوو، بۆ مێژوو دەبێ بگوترێ کە ئەوەشیان ئەنجامدا کە لە جێی خۆیدا باسی دەکرێ.

پاش کۆبوونەوە سکرتێری حیزبی تودەی ئێران یارمەتی یەکی مادی پێشکێش

---

*رێبەرایەتی حیزبی تودەی ئێران لە ژێر تەئسیری بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عیراق، تەکانی لە خۆدەدا کە ئەویش مەسەلەی کورد بێنێتە گۆڕێ. هەموو هەوڵ و تەقەلاشیان ئەوە بوو کە بەهۆی دوکتور رەحیمی قازی و دوکتور عەلی گەلاوێژ و دوکتور قاسملوو لە ئورووپا یەکێتی رێکخراوەیی حیزبی تودە و حیزبی دیموکراتی کوردستان پێک بێنن، وەک لە گەل فیرقەی ئازەربایجان پێکیان هێنابوو. دیارە کەریمی حسامی و حەسەنی قزلجی ــــ شیان بۆ ئەم مەبەستە وەک زاپاس لە بەر چاو گرتبوو. یەک دوو جار کەریمی حسامی و حەسەنی قزلجی یان لە بولغارستانەوە بردە پراک لە چیکوسلۆڤاکیا. عەلی گەلاوێژ یشیان لە باکووە هێنا بوو. دوکتور قاسملوش هەر لە پراک بوو کە باسی مەسەلەی کورد لە کوردستانی ئێران بکەین. ئاخرە کەی هاتینە سەر ئەو رایە کە رۆژنامەیەکی کوردی لە ئورووپا دەر بکەین. ئەوان دەیانگوت:« رۆژنامەکە ناوی( مەردوم) بێ بەکوردی. ئێمەش دەمانگوت بە ناوی ( کوردستان) دەربچێ. پاش باسێکی زۆر بریار درا کە( کوردستان لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە) دەربچێ حیزبی تودە موخاریجی چاپ و بلاو کردنەوە وە ئەستۆ بگرێ. دوکتور قاسملو بە سەر نووسەری رۆژنامە و ئەردەشێسی ئاواتسیانیش کە ئەندامی بیرۆی سیاسی حیزبە تودە بوو، بە بەر پرسی سیاسی رۆژنامەکە دیاری کرا کە یەک وشەی کوردی نەدەزانی. عەلی گەلاوێژ هەر لە بەر ئەوەی کە دوکتور قاسملو بە سەر نووسەر دیاری کرا، هاوکاری نەکرد. رۆژنامەی کوردستان بە یارمەتی قاسملو، حەسەنی قزلجی و کەریمی حسامی، ٢٦ ژمارەی لێ دەر چوو. کاک محەممەدی موهتەدی لە بواری نووسین و کاری تەکنیکیش یارمەتی کردوە.
پێداچوونەوە

بە سولەیمان و حەمەدەمین دەکات. بڕیار درا ئەوان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان. ئەوان دەچنە سلێمانی و تا ڕۆیشتن لە وێ جێگا و شوێنی ئەمین و دڵنیایان لە لایەن برادەرانی حیزبی کۆمونیستەوە بۆ دابین دەکرێ و ماوەیەک لە وێ دەمێننەوە، ژن و منداڵی کاک سولەیمانی موعینی لە سەنگەسەر دەمێننەوە و حەسۆ میرخـن ڕێگایان نا دات لە سەنگەسەر وەدەر کەون و بچنەوە لای مێردیان. کاک سولەیمان نامەیەک بۆ خوالێخۆشبوو کاک ئیدریس بارزانی دەنووسێ و داوا دەکات، ڕێگای ژن و منداڵی بدەن بچنەوە لای ئەو. لەو ماوەیەدا کە چاوەڕوانی وەڵامی نامەکە و هاتنی ژن و منداڵی دەبێ، کاک حەمەدەمینی سیراجی بە پێچەوانەی بڕیاری کۆبوونەوەی بەغدا کە بڕیار درا بوو لە گەڵ مائۆییستە ئێرانیەکانی لای مام جەلال لە بەگرە جۆ پێوەندی نەگرن. دەچێ پێوەندی یان لە گەڵ دەگرێ و یەکیش لەوان بە ناوی ( کورشی لاشایی )کە پاشان چۆوە تاران و بوو بە هەڵسوڕێنەرێکی ساواک) لە گەڵ خۆی دەباتەوە کوردستان. ماوەیەک دوای گەڕانەوەی حەمەدەمینی سراجی،سولەیمانی موعینی-ش لە گەڵ خەلیل شەویاشی کادری حیزب فریوی قالەتەگەرانی دەخواو بەرەو کوردستانی ئێران دەگەڕێتەوە. هەر چەندە برادەرانی حیزبی کۆمونیست ئامۆژگاری دەکەن کە قالە تەگەرانی جێگای بڕوا نیە و لە گەڵ ئەو نەڕوات، بەڵام سولەیمان ناوبراو وەک چاو ساخ و یاریدەری ڕێگا لە گەڵ خۆی دەبا و دەکەوێتەرێ، ئەویش سولەیمان دەبا تەحویلی سەدیق ئەفەندی دەدا. ناوبراو دەیانگرێ و بە دەست بەستراوی هەرتکان دەیبنێ بۆ بارەگای بارزانی . لە وێ ١٩٦٨/٥/٢٠بە پێچەوانەی هەموو داب و شوێنێکی ئینسانی هەر دووکیان دەکوژرێن. خەلیل شەویاش شرتو گوم دەکرێ و تەرمی سولەیمانیش دەدەنەوە بە حکومەتی ئێران و بە هێلیکۆپتەر بە شاراندا دەیگێڕن و ڕۆژی ٩٦٨/٥/٢٢ دەیبەنە مەهاباد و بە خەڵکی نیشان دەدەن.

ڕاپەڕینی چەکدارانەی کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر چەندە ١٨ مانگ لە بەرانبەر هێرشی بە ربڵاو و دڕندانەی حکوومەتی ئێراندا خۆی ڕادەگرێ و ئەو دوڕگە ئارامە دەشلەقێنێ کە شای ئێران شانازی پێوە

دەکرد، بەلام سەبارەت بە بارو دۆخی نا لە باری خۆ جێیی و دەرەوە و نە بوونی پشتیوان و یارمەتی و بەر تەنگیی ەودا و و ناوچەی راپەڕین و گەلێک هۆی بابەتی دیکە تووشی شکان دێت. رێبەرانی ناسراو و چالاکی بزووتنەوە، وەک مەلا ئاوارە، سمایلی شەریفزادە، سولەیمان و عەولای موعینی، سەید فەتاح و گەلێک لە تێکۆشەرانی دیکە شەهید دەکرێن.

کۆمیتەی ناوەندی حیزبی تودەی ئێران لە مانگی نوامبری ١٩٦٨دا نامەیەک بۆ تەواوی حیزب وڕێکخراوە دێموکراتیەکانی جیهان دەنووسێ و داوایان لێدەکات دژی جنایەتی حکوومەتی ئێران لە کوشتاری ئازادیخوازانی کورد دەنگی بێزاری خۆیان بەرز کەنەوە .

. بە دوای بلاو بوونەوەی نامەی حیزبی تودەی ئێراندا، هەر چەند نەناوی حیزبی دیموکراتی تێدا هاتبو، ونەباسی کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکرات کرابوو، زۆر لە حیزب و ڕێکخراوە دێموگراتیەگانی جیهان لە بەیاننامە و بلاوۆک و رۆژنامەکانی خۆیاندا دژی هێرشی ئەرتەش و ژاندارمەی حکوومەتی تاران بۆ سەر کوردستانی ئێران و گرتن و کوشتاری ئازادیخوازانی کورد دەنگی ئیعتراز و بێزاری خۆیان بەرز کرد بۆوە.

ئەنجومەنی هاو دەردی و یارمەتی بە گەلان لە پاریس بە بۆنەی هێرش و کوشتاری حکوومەتی ئێران لە گوردستان نامەی خوارەوە بۆ {کومیسیۆنی مافی مرۆڤ لە کۆری نەتەوە یەککگرتوەکان} دەنێرێ: «..... نیویورک، بارەگای نەتەوە یەککگرتوەکان.٩/٤/١٩٦٩. جەنابی سەرۆکی کومیسیۆن !

ئەنجومەنی ئێمە لە وەزعی یەکجار زۆر ناخۆشی گەلی کوردستانی ئێران لەو دواییە د اناگادار بوە. بە تایبەتی کە دەزانین ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان ئەویش نە یەکجار بەدەست ژاندارم و سەر بازی ئێرانی کوژراون. ئەو زوڵم و زۆری هەموو کوردستانی ئێرانی تەنیوەتەوە. چونکە هێزێکی زۆری لەشکر و ژاندارم بۆ سەر کوتکردنی کوردەکان بۆ ئەو ناوچەیە ناردراوە. هەر وەها سەرنجی ئێوە ب زیندانی کردنی ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان رادەکێشین. ژمارەی دروستی

گیراوەکان لە وەزعی ئیمرۆ دا بۆ ئێمە روون نیە.بەلام وەزعی ژیانیان لە بەندیخانەدا زۆر جێی نیگەرانیە.

جەنابی سەرۆک! بۆ خاتری بەشەر دۆستی و ریز گرتن لە مافە ئەساسیەکانی ئینسان داواتان لێدەکەین کە ئەم راستیە بە ئەندامانی بەشداری نەتەوە یەکگرتوەکان را بگەیێنن بۆ ئەوە کە لە لای کار بەدەستانی ئێران کارێکی وا بکەن کە گەلی کوردستانی ئێران هەرچی زوودتر لەو زۆرداری یە رزگاری بێت. جەنابی سەرۆک! هیواداریین کە داخوازی ئێمە قبوڵ بکەن و لە هەموو توانای خۆتان بۆ پێشگری لە زۆر داری دەوڵەتی ئێران لە کوردستان بە کار بێنن. ئیحترامی بەرزی خۆمان پێشکێش دەکەین.» پاریس.سکرتێری گشتی. کلۆد بوس شەن. (١٧)

پاش شکانی بزووتنەوە لە نێوان خەباتگێرانی بزووتنەوەدا تا کۆکی پەیدا دەبێ. هێندێکیان دەچنە لای مام جەلال و لە بەکرە جۆ دەگیرسێنەوە. هێندێکی دیکەیان دەگەرێنەوە بۆ ناوچەی ژێر دەسەلاتی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق. ئەوانیش هێندێکیان چەک دەکەن و حەوت کەسیشیان کە بە دەستەی سالح لاجانی ناسرا بون، دەگرن و دەیاندەنەوە بە حکومەتی ئێران و لە پێگەی نیزامی جەڵدیان ئیعدام دەکرێن. دانەوەی ئازادیخوازانی کوردی کوردستانی ئێران بە حکوومەت ئێران، یەکێک لەو کارە ناحەز و چەپەلانەی کار بەدەستانی بزووتنەوەی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق بوو کە وەک خاڵێکی رەش لە مێژووی ئەو بزووتنەوەیەدا تۆمار دەکرێ. «... لە شۆرشی ئەیلولدا چەند هەڵەیەکی تر کرا کە بە تایبەتی زیانیان لە پارتی و شۆرش دا، چ لە بارەی ناو بانگەوە و چ لە بارەی پەیوەندیمان بە هێزە نیشتمانپەروەرەکانی پارچەکانی تری کوردستانەوە. یەکێک لەو هەلانەی کە پارتیمان بە کارێکی ناڕەواو زیان بەخشی دادەنێ، وە کە بە تایبەتی دوژمنانی شۆرشی ئەیلول و میللەتی کوردمان لە بۆ پروپاگاندە و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بە کاریان هێنا بگرە بە شێوەیەکی تایبەتی دژی شۆرشی ئەیلول و پارتیمان، دانەوەی لاشەکەی (سلیمانی معینی ) بە ئێران بوو.»( ١٨ )

هەر چەند بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی پارتی دوای کۆنگرەی ٩ پێ لە(چەندهەڵەیەک) دەنێ، بەڵام بەداخەوە هەڵە و کەم و کوری یەکان روون ناکاتەوە و بە تایبەت لە مەسەلەی شەهیدکردنی تا رەوای سولەیمانی موعینی، نەک هەر ئەم کردەوە دزێوە مەحکووم ناکات، بەڵکوو تەنیا (دانەوەی لاشەکەی بەئێران) بە هەڵە و بەکارێکی نارەو دادەنێ. جگە لەوە حیزبە سیاسیەکانی کورد لەهەڵە ونەزموونی تاڵی خۆیان دەرس وەرناگرن. پارتی دیموکراتی کوردستان کەلەکۆنگرەی نۆیەمدا دان بەهەڵەکانی شۆرشی ئەیلول دادەنێ، بەڵام پاش کۆنگرەی نۆیەم هەڵەو خەتای گەلێک گەورەتر سەبارەت بە حیزبی دیموکراتی کوردستان وگەلی کورد لەکوردستانی ئێران دووپات دەکاتەوە. ( ئەم باسە بۆ بەرگی سێ یەمی پێداچوونەوە رادەگرین.)

## چارە نووسی عەولای ئیسحاقی( ئەحمەد توفیق)

لە چەند لاپەرەی پێشوو دا بە کورتی و بە گوێرەی ئەو بەڵگە و ئاگاداری یانەی بە دەستەوەبوون، باسی سیاسەت ورێبەرایەتی و رەوشت و هەڵسورانی ئەحمد توفیق کرا. لە بارەی بیر و راو بۆ چوون و هەڵوێستی سیاسی عبدالله ئیسحاقی(ئەحمەدتوفیق)هیچ بەڵگەو نووسراوەیەکی نووسینی خۆی بەجێ نەماوە و یا من دەستم پێرانە گەیشتوەن. لە نێو ئەندامان و هاو کارەکانیشیدا لە سەر بیر و بۆ چوونی سیاسی ئەحمەدتوفیق کەس هیچی نە نووسیوە و باسیشی نە کردوە. لە راستیدا جێگای خەبات و تێکۆشانی ناو براو لە حیزبی دیموکرات دا، خاڵی ماوەتەوە. تەنیا مەلا عەولای حەیاکی( عبدولاحەسەنزادە) کە سەر دەمێک وشکە سۆفی بیر و بۆ چوونی ئەحمەد توفیق بوە. لە حکایەتەکەیدا بە ناوی (نیوسەدەخەبات) باسی کردوە و دەنووسێ :(......لە باری سیاسیەوە تا کۆکی لە سەر بیرو باوەری چەپ و دیموکراتی و پێشکەوتنخوازانە کە دوکتور قاسملوو

لایەنگری بوو، لە گەڵ بیرێکی ناسیونالیستی بەر چاو تەنگانە بوو کە کاک ئەحمەدتوفیق بە سەمبولی دەژمێردرا.... هەر چی کاک عبداللەاسحاقییش بوو، بە هەر دەلیلێک کە خۆی پێی قانیع بوو حیزبی دیموکراتی کوردستانی کرد بوو بە کلکەیەک لە پارتی دیموکراتی کوردستان و بە کردەوە لە ژێر رێبەرایەتی پارتی و شەخسی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا دا بە رێوە دەرویشت...... زۆر جار کادرەکانی ریزی پێشەوەی حیزب بە دژی رێبازی چەوتی اسحاقی کە ئێستا ئیدی بە کردەوە حیزبی لە دەستی خۆیدا قەبزە کرد بوو و زۆر جار بە گاڵتە پێیان دەگوت حیزب، راوەستان. بەڵام بێ سود بوو. چونکە لە لایەک بۆ خۆی بێ بەزەییانە لە گەڵ موخالیفانی دەجولایەوە و تەنانەت پەنای بۆ تێیرۆریش دەبرد(نمونە تیرۆری شەهید اسعد خدایاری)، لە لای دیکەش پشتیوانی بێ ئەملا و لای خوا لێخۆشبوو بارزانی لە ناو براو دەرەتانی هەر جۆرە گەشە کردنێکی لە رەوتی پێچەوانەی رەوتی ئەحمەد توفیق بەر تەسک کەرد بووە»(١٩)

عبدولای ئیسحاقی تا سەفەری ئورویا وتێکچوونی لە گەڵ دوکتور قاسملو لە سەر بیر و باوەری توندی تودەیی خەباتی چینایەتی درێژە پێداوە و پاش غەنی بلوریان یەکێ لە ئەندامانی چەپی کومیتەی پێنج نەفەری کوردستان بوە. پاش کۆدیتای دژی حکوومەتی دوکتور مصدق ١٩٥٣، و لە بەر یەک هەڵوەشانی رێکخراوەکانی حیزبی تودە و چوونی بۆ کوردستانی عیراق. لە ژێر کار کردی کەش و هەوای کوردستانی عیراق و بیر و بۆ چوونی ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەوسای عیراق، بە بۆ چوونی خۆی گێژ دەگۆڕێ و دەکەوێتە سەر هەوای بە رواڵەت (کوردایەتی). بەرهەمی ئەم گێژ گۆران و کوردایەتیەکەی بریتی دەبێ لە گەشە کردن و پشکوتنی بیر و باوەری ئانتی کۆموونیستی. ئەم بیر و باوەڕە دەگاتە رادەیەک کە کادر و ئەندامانی حیزبی دیموکرات بە تاوانی بیر و باوەری چەپ و تەنانەت تۆمەت وە پاڵدانی لایەنگری لە کۆموونیستەکان لە حیزب دەر دەکا و دەیانکوژێ. (کتێبی رەش و سەیری کۆمونیزم لە ئێران) نووسینی تەیموری بەختیار دەدابە کادرەکانی حیزب کە لە

دیهات بۆ خەڵکی بخوێننەوەو دژی حیزبی تودە باسی لە سەر بکەن. هاوڕێی گیانی و کادری حیزبی کە سەر دەمێک جێگای بڕواو موتمانەی خۆی بوون، بەتاوانی (نیزیکی لەشیوعیەکان) لە لای مەلامستەفای رەحمەتی رەش دەکا و بەدەر کردنیان دەدا.(بڕوانە نامەی ئەحمەدتوفیق بۆ سەرۆک بارزانی لەم کتێبەدا). دیارە ئەحمەد توفیق لە بیر و ناخی خۆیدا، لەم بوارەشدا ساخ نابێتەوە و لە گەڵ خۆی لە کێشەدابوە. لە گەڵ بیر و هەڵوەستی ئانتی کۆمونیستی، هەوڵی داوە لە گەڵ سۆڤیەت پێوەندی بگرێ و یا بانگی بکەن بچێتە سۆڤیەت. ئەحمەد توفیق بۆ (کوردایەتیە)کەشی بناخەیەکی تیئۆری زانستی دا نا ڕێژێ و بۆ خەباتی ڕەوای کوردایەتی ڕێبازێکی ڕوون و ڕەوایەتی دیاری ناکا. تەنیا بە شێوەی ناسیونالیزمی بەر چاو تەنگ بە دروشم و وشەی سەر زارەکی بێناوەرۆک و خەیالیی و بریقەدار دەور و پشتی خۆی گێژ دەکا و هەر بەو دروشم ووشە بێناوەڕۆکانەش خۆی لە سەرۆک بارزانی نیزیک دەکاتەوە. بەیاننامەی حیزبی دێموکرات کە بە ناوی (نامەیەک لە ئێرانەوە)لە گۆڤاری هیوا دا بلاو کراوەتەوە و ڕاپۆرتی کومیتەی ناوەندی و بەیاننامەی کونگرەی دووەمی حیزبی دێموکرات، تا رادەیەک پلەی تێگەیشتنی سیاسی وشارەزایی لە مەسەلەکانی نێونەتەوەیی و مەسەلەی ناسیونالیزمی کاک ئەحمەد توفیق نیشان دەدەن.

«.....بۆ ئەوەی تێبگەین کونگرەی دووەم چەندە لە خەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان دوور کەوتبوەوە، رەنگە ئەوەندە بەس بێ کە بزانین لە بەیاننامەی کۆتایی کونگرەدا، ئەوەی ئیحترام و ئیعتیبارە بە کۆماری کوردستان و ڕێبەرەکانی رەو انەبینرابوو و بێ بەزەیی یانە درابوونە بەر پەلامار. وەختێک ئەو بەیننامە بلاو بۆوە لە هەموو جێگایەک لە گەڵ بێزاری و تورەیی بەدەنەی حیزب بەرەورووبوو...... ئەگەر چی شتێک بە ناوی «هەیئەتی سکرتاریای حیزبی دیموکراتی کوردستان» دروست کر ابوو. بەلام بە کردەوە جارێکی دیکە حیزب بوو بە احمد توفیق و احمەد توفیق بوو بە حیزب.» (٢٠)

ڕاستی یەکەی ئەوەیە شێوەی ڕێبەرایەتی ئەحمەدتوفیق بەپشتیوانی ڕاستەوخۆی

بارزانی نەمر دەبێتە هۆی لاواز بوون و لە بەر یەک بڵاو بوونی ریزەکانی حیزبی دیموکرات و جیابوونەوە و لە بەین چوونی کۆمەڵێک ئەندام و کادری حیزبی دیموکراتی کوردستان و تەریک بوونەوە و بێدەسەلاتی و لە ئاخریدا خۆشی سەری تێدا دەچێ و زیانێکی قورسیش وە حیزبی دیموکراتی کوردستان دەکەوێ.

هێندێ کەس ئەحمەد توفیق بە ناسیۆنالیست دادەنێن. بەلای منەوە ئەو هسووکایەتیە بە ناسیۆنالیزم. چونکە کابرای ناسیۆنالیست ئەگەر راست بکاو بۆ ئازادی نەتەوەکەی خۆی تێبکۆشێ، بەر لە هەموو شت بەرژەوەندی شەخسی و حیزبایەتی فیدای بەرژەوەندی گشتی مەسەلەی رزگاری نەتەوەکەی دەکا. دروشم و وشەی بریقەداری ناسیۆنالیستی، ئابرووی نەتەوە پەروەریش دەبەن.

کوردەکانی کوردستانی ئێران- ئەندامانی حیزبی دیموکرات - کە سەبارەت بە خەبات و تێکۆشانی سیاسی دژی رێژیمی دیکتاتۆری شا ئاوارە و دەر بەدەر ببوون و روویان کرد بوە بەشێکی تری نیشتمانی لەت و پەتکراویان . لە جیاتی ئەوەی لەم هەل و مەرجی پێکهاتوو کەلک وەربگرن و یەکێتی خۆیان بپارێزن و رێکخراوی حیزبی خۆیان بە هێزبکەن و لە کوردستانی بەشی خۆیان بنکە و شانە و رێکخراوی پەرش و بڵاوی خۆیان رێک و پێک بکەن، لە کوردستانی عیراق توشی دوو بەرەکی و ناکۆکی بێجێ و نارەوا دەبن و(توشیان دەکەن ). هەموو توانای خۆیان بۆ یارمەتی بە بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی خوارووی تەرخان دەکەن، ئەوانیش لە جیاتی ئەوەی بۆ بە هێزکردنی حیزبی دیموکرات و بزووتنەوەی کوردستانی ئێران یارمەتی یان بکەن، دەستیان دەخەنە نێو و دابڕ دابڕیان دەکەن و(مەلایی وجەلالی)یان لێ سازدەکەن. پاشانیش دانەوە بە ئێران وبە کوشتن وراونان پاداشیان دەدەنەوە. هەروەک ئێستاش پاش سی و چەند ساڵ بە داخەوە سیاسەتی هێندێ لە رێبەرانی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو بۆ لێدان و کپ کردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی ئێران راست لە جوار چێوەی ویست و بەرژەوەندی حکوومەتی ئاخوندی ئیسلامی ئێراندا دە جوڵێتەوە. پێشمەرگەی کورد دەکەنەپاسەوانی سنووری دەستکردی ئێران و شانازی ناوی (مەرزدارانی

غیور) بۆخۆیان تۆمار دەکەن.

عەولای ئیسحاقی بۆ خزمەت به بزووتنەوەی کوردستانی عیراق و بۆ راپەراندنی ئەمر و فەرمانی بارزانی سەری پێوە نە بووە، هەر کردەوەیەکی چەپەڵیش کە بەرانبەر بە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کرد بێ، هەموو بە حیسابی خزمەت بە بارزانی داناوە، تاقە کەسیووە بە فەرمانی رێبەرایەتی بزووتنەوە چۆتە تاران و لە گەڵ بالیۆزخانەی ئەمریکا بە یارمەتی شێخ موعتەسەمی حسامی پێوەندی گرتوە.(٢١) یەکەم کەس بووە ساڵی ١٩٦٢ خۆی گەیاندۆتە لوبنان و دانا شمیدت هەواڵدەری ئەمریکایی لە کەش و هەوایێکی دژوار و پڕ لە مەترسیدا هێناوەتە کوردستان و دەنگ و باسی کوردستانی بە دنیا راگەیاندوە . بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ناو براو بە ئەمری سەرۆک بارزانی لە ناوچەی باڵەکایەتی و سنووری کوردستانی ئێران دوور دەخرێتەوە و دەینێرن لە گوندی کانی ماسی، ناوچەی بادینان لە ژێر چاوە دێری ئەسعەد خۆشەوی رەحمەتی دا نیشتەجێی دەکەن. دوور خستنەوەی ئەحمەد توفیق بۆ کانی ماسی و راکردنی لە نێو بزووتنەوەی کوردستانی عیراق بۆ بەغدا و پەنا گرتنی لە لای حکوومەتی بەعسی دوژمنی کورد و پاشان بێ سەر و شوێنکردنی و مانەوەی خوارزاکانی لە بەغدا پاش نەمانی ئەحمەد توفیق، مەتەڵێکن هێشتا لە تاریکیدا ماونەوە و روون نەکراونەوە. ئەوەی لە ژێر زەرە بینێکی قەوی سیاسیدا بەر چاو دەکەوێ وا دەگەیێنێ کە رۆیشتنی ئەحمەد توفیق لە کانی ماسی یەوە بۆ نێو حکوومەت لە جەنگەی شەڕدا، دەبێ بە نەخشەو پلان و ئاگاداری کار بەدەستانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق بوو بێ. ئەگەر وابێ دەبێ ناو براو لە بەغدا پێوەندی خۆی لە گەڵ سەری پاراستبێ و خەبەر و ئاگاداری پێویستی بۆنارد بێ( بەتایبەت کە بۆ ئەم جۆر هکارانەش لێهاتوویی هەبوو) دیارە ئاخرەکەی سەرە هەودای ئەم پێوەندی و چالاکی یە دەبێ کەوتبێتە دەستی بەعس و ئەوانیش ئیتر مۆڵەتیان نەدابێ و لە بەینیان بردبێت. هەر وەک لە گەڵ خوا لێخۆشبوو عبدولرەحمانی زەبیحی کردیان.

لەم بۆ چوونەدا پشت به چەند بەڵگەی گریمانی دەبەستم:

یەکەم - ئەوە کە دوای رۆیشتنی ئەحمەد توفیق بۆ لای حکوومەت خوا لێخۆشبوو ئیدریس بارزانی بە نوێنەرانی حیزبی دیمۆکراتی دەڵێ:« رۆیشتنی ئەحمەد توفیق و مەلا سەید رەشید کاری شەخسی خۆیانە و لە سەر حیزب حیساب ناکرێ». لە گەڵ ئەوەش کە پێشتر ئەوان تەنیا ئەحمەد توفیق یان بە حیزبی دیمۆکرات زانیوە.

دوەم - کاک مەسعود بارزانی پاش ئەوەش کە ئەحمەد توفیق رادە کاو دەچێتە نێو حکوومەت، لە نووسراوەی خۆیدا بە( تێکۆشەری هەڵکەوتو )ی ناو دەبا کە(خزمەتی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێرانی) کردوە. لە کاتێکا ئەگەر کەسێکی دیکە ئەو کارەی کرد بایە، بێگومان لای سەر کردەکانی بزووتنەوە بە جاش و بە خائین ناو دەبراو بە نیشتمانپەروەریان نەدەزانی.

سێ یەم - پاش راکردنی و چوونی بۆ نێو حکوومەتی بەعس هاوکارەکانی هەر بە سکرتێریان داناوە. جگە لەوە بۆ چوونێکی کاک ئەمیری قازیش لەم بوارە دا جێگای سەرنجە. کاک ئەمیر کە لە ئەحمەد توفیق زۆر نیزیک بوە و شارەزای سیاسەت و ئاکاری بوە، لە نامەیەکدا کە بۆ رەخنە لە بیرەوەریەکانی من بە هاواری حامیدی گەوهەری یەوە هاتوە، دەنووسێ : «... هۆی دوور خستنەوەی کاک عەولای ئیسحاقی( ئەحمەدتوفیق) بێگومان ئەوە بوو کە بە رێوە بەرایەتی ئەو کاتەی شۆرشی کوردستانی گەرمێن دەترسا کاک عەولا خۆ بکەیێنێتەوە کوردستانی کوێستان لە وێ شۆرش دەست پێبکا و بە شێوەیەک تەنگ و چەڵەمە بۆ شۆرشی کوردستانی گەرمێن پێک بێ.» ( بەبۆچوونی کاک ئەمیری ئەحمەد توفیقێکی بە بێ رەزا مەندی سەرۆک بارزانی ئاویشی نە دەخواردەوە و بە هەموو تواناش دژایەتی کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیمۆکراتی دەکرد کە لە کوردستانی ئێران چەکی دەست دابوویە و تاوچەی شڵەژاند بوو، ئێستا بۆیە دوور خراوەتەوە نەوەکوو بچێتەوە لە کوردستانی کوێستان شۆرش دەست پێبکا.) کاک ئەمیر هەر لە نامەی ناو براودا ئەحمەد توفیق بە(ئازا و رەشید و نیشتمانپەروەر و کار لێهاتو و نەسرەو توو و لە مەیدانی کوردایەتی دا ماڵ نە ویستوو و دەست بڵاو و چاو

ئەترسی ناو دەبا.»

ئەحمەد توفیق پاش ماوەیەک لە جەنگەی شەردا لە کانی ماسی یەوە بە نێو هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا رادەکات و خۆ دەگەیێنێتە پەنای لەشکری عیراق و لە بەغدا لە کن حکوومەتی بەعس دەبێتە پەنا بەر. نیزیکەی دوو سالان لە گەل دوو خوارزای خۆی بە سەر بەستی لە بەغدا دەسوڕێتەوە و لە چالاکی دا دەبێ. سالی ١٩٧٢ لە پڕ ئەحمەد توفیق وون دەبێ و خەبەری گرتنی بلاو دەبێتەوە.

هەر چەندی ئەو دەم لە حیزبی دیموکرات دەرکر ابوو، بەلام دەفتەری سیاسی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بۆ دۆزینەوە و ئازاد کردنی هەولێکی زۆر دە دا. تاقە وەلامێکی کە نوێنەری حیزبی دیموکرات لە بارەی ئەحمەد توفیقەوە لە حکوومەتی بەعسی وەر دەگرێتەوە هە رئەوە دەبێ،کە پێی دەلێن:« ئەحمەدتوفیق ویستوویەتی بچێتە دەرەوە، بردوومانە لە سنووری سوریا بەرەلامان کردوە.» درنگتر لەم لاو لا بلاو دەبێتەوە کە ئەحمە دتوفیق لە زیندانی ئەبو غریب ئیعدام کراوە. هەرچی بێ لەبەینچوونی ئەحمەد توفیق بە دەستی دوژمنی کورد زیانێکی گەورە وداخێکی دلتەزێن بوو. رەوانی شاد وجێگای بەهەشتی بەرین بێ.

پاش دوور خستنەوەی ئەحمەد توفیق بۆ ناوچەی بادینان، چەند کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هەلبژێردراوی کۆنگرەی دووەم وهیتر لە هیچ بارێکەوە نە سیاسی و نە کولتوری و کۆمەلایەتی چالاکی و تێکۆشانێکی یان نامێنێ. لەناوچەی ژێردەستی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو دادەنیشن. جار و باریش سەری یەکتر دەدەنو لەلایەن پارتیشەوە مانگانە یارمەتیەکی کەمی مالی یان پێدەکرێ. ئاخرەکەی لە مانگی یولی١٩٦٩کۆبوونەوەیەک پێک دێنن و ناوی دەنێن (کۆنفرانسی دووەمی)حیزبی دیموکراتی کوردستان.

کۆنفرانسی دووەم وە نەبێ لە بواری رێبازی سیاسی و رێکخراوەیی و رێ و شوێنی حیزبی شتێکی وا بوو بێ کە بە کۆنفرانسی حیزبی بژمێردرێ. بەلام دیسان هێندێ لە ئەندامانی حیزبی کە لە سەر هێل و رێبازی ئەحمەد توفیق کۆ بوونەوە و هەر لە سەرهەمان رێباز و بۆ چوونەدا کۆتایی بە کۆنفرانس دێنن، ئەو

ئەندامانەی حیزبی دیموکرات کە لە گەڵ کومیتەی شۆرشگێری بەشداری بزووتنەوەی چەکداری بوون، نەک هەر بۆ کۆنفرانس بانگ ناکرێن و بۆ یەکێتی ریزەکانی حیزب و یەکگرتنەوە هەنگاوێک ناوێژن، بەڵکوو بە تاوانی خەباتی چەکداری دژی ریژیمی سەرە رۆی ئێران خەتا باریش دەکرێن : «...... ئەم کۆنفرانسە لە زۆر بارەوە فەقیری و بێ دەرەتانی پێوە دیار بوو. لە نێو خۆی وڵاتەوە هیچ نوێنەرێکی تێدا بەشدار نەکرابوو. ئەوانەی لە عیراقیشدا دەژیان و «تاوان»ی بەشداری لە راپەرینی ٤٧ - ٤٦ یاندا لە سەر بوو، بەشی زۆریان نەیانتوانیبوو نوێنەر بۆ کۆنفرانس بنێرن. جگە لە وانەش رادەی بەشدارانی کۆنفرانس و پلەی وشیاری سیاسی ئەندامانی کۆنفرانسیش بۆ دڵ پێخۆشکردن نە دەبوو.» ( ٣٢ ) هەر چۆنێک بێ باری کۆمەڵایەتی و(پلەی وشیاری سیاسی) ئەو کۆمەڵەی کە ئەو دەم بە ناوی حیزبی دیموکرات لە سەر خەت و رێبازی ئەحمەد توفیق لێک کۆ ببوونەوە هەر ئەوەی لێ پەیدا دەبوو. هەنگاوی لە باری ئەو کۆنفرانسە ئەوە بوە کە پێشی پەرش و بڵاوی پتری گرتوە، جار و بارسەری یەکتریان داوەو ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان یان پاراستوە.

سەرچاوەکان

١ - سەعیدکاوە ئاورێک لەبەسەرهاتی خۆم و...... ١٩٩٦، ل ٢٩.

٢ - مسعود البارزانی،البارزانی والحرکە التحرریە الکردیە ١٩٩١ ، ل ٢٥٦

٣ - هەمان سەرچاوە ، ل٢٨٢

٤ - هەمان سەرچاوە . ل ، ٢٧٧

٥ - سەعید کاوە، سەرچاوەی پێشوو . ل، ٤٦

٦ - مسعود البارزانی . پێشوو. ل، ٢٧٢

٧ - هەمان سەرچاوە ، ل، ٢٧٠

٨ - سەعید کاوە ، پێشوو، ل ، ٥٢

٩ - هەمان سەرچاوە . ل . ٦٣

١٠- رۆژنامەو کوردستان، ژمارە: ٦١و١٢ نوامبر-دیسامبر ١٩٩٣

١١ – کەریمی حسامی لەبیرەوەری یەکانم، بەرگی سێ یەم، ١٩٨٨، ل ، ٢٤
١٢ – سەعید کاوە، پێشوو، ل ، ١٦٤
١٣– نامەی سەحیدکوێستانی بۆ نووسەر، ٤٥/٦/١٢(١٩٦٦/٩/٣
١٤ – سەعیدکاوە، پێشوو ، ل ، ١٦٧
١٥ – عبداللە حسن زادە، نیو سەدە تێکۆشان، ١٩٩٥ ل ، ٤٢
١٦ – کەریمی حسامی ، سەرچاوەی پێشوو ، نامەی سراجی ، ل ، ٧٥
١٧ – کەریمی حسامی، کاروانێک لەشەهیدانی کوردستانی ئێران، ١٩٧٩، ل،١٠٣-١٠٤
١٨ – بەیاننامەی کۆنگرەی نۆهەمی پارتی دێموکراتی کوردستان ، ١٩٧٩
١٩ – عبداللە حسن زادە، هەمان سەرچاوە، ل ، ٢٨ ــــ ٢٩
٢٠ – سەرچاوەی پێشوو، ل ، ٣٩ ــــ ٤٢
٢١ – سەعید کاوە، پێشوو ، ل ، ١٠٤-١٠٥
٢٢ – عبداللە حسن زادە، سەرچاوەی پێشوو ، ل ، ٥٣ ــــ ٥٢

# پێـــــداچـــــوونــــــەوەی
# قۆناخی یەکەم

ئەنجام و لێ ورد بوونەوەی ئەم قۆناخەی خەبات و تێکۆشان لە کوردستانی ئێران ئەم راستیەمان بۆ دەر دەخات کە بزووتنەوەی نیشتمانی کورد، لەم بەشەی نیشتمانەکەشیدا بە رێباز و بە شەقامێکی راستە رێدا تێنەپەریوە . حیزبی دیموکراتی کوردستانیش وەک نووسەرانی حیزب باسی دەکەن یەیکەرێکی وشک و لە قالب دراوی درێژە پێدەری سەر دەمی کۆماری کوردستان نەبوە. بزووتنەوە بە رێبازی جیاواز و بە تاکتیک و ستراتیژی جۆر بە جۆر درێژەی بە ژیانی خۆی داوە. بەرهەمی خەباتی ئەم قۆناخە تەنیا بریتی بوە لە پاراستنی ناوی حیزبی دیموکرات و خۆ بەستنەوە بە سەروەریی کۆماری کوردستان و بە ناوی پیرۆزی قازی محەممەد پێشەوای شەهیدی کوردەوە.

باسەیرێکی ئەنجام و بەرهەمی ئەم قۆناخەی خەباتی حیزبی دیموکرات بکەین:

– لە سەرە تاوە دوای رووخانی کۆماری کوردستان. بزووتنەوە بە شێوەی جۆربە جۆر و دەرفەتی جیاواز چەگەرە دەر دەکا بێ ئەوەی کە ناوی حیزبی دیموکراتی پێوە دیار بێت. وەک (کۆمەڵەی ژیانی کورد) کە گۆڤاری(رێگا) ئۆرگانی بوەو بەحیزبیشیان ناو بردوە. یا (کۆمەڵەی لاوانی لادێ کە پاشان بۆتە پێکەی دوارۆژی حیزبی دیموکرات. یان( کۆمەڵەی کۆمونیستی کوردستان) کە تینی بزووتنەوەی نوێ وە بەر خەڵک دەنێ. شێوەی جۆر بە جۆری دەر بڕینی نەفرەت و بێزاریش لە حکوومەتی ئێران و دەرەبەگی سەر بە دەوڵەتی تاران. بە جۆرە خەباتێکی پاسیڤی کۆمەلانی خەڵک دەژمێردرێت.

– دامەزرانی رێکخراوی حیزبی تودە بە ناوی حیزبی دیموکرات کە بە هیچ جۆر باسی مەسەلەی کور و مافی نەتەوایەتی کوردناکری. ناوناوی حیزبی دیموکراتە.

بەلام لە ژێرڕێبەرایەتی حیزبی تودەدا، خەباتی چینایەتی ئامانج و رێبازییەتی. چەند کەس لە تێکۆشەرانی کورد بێ کۆنفرانس و کۆنگرە و پێڕە و پرۆگرام بە ناوی (کومیتەی کوردستان)ی حیزبی تودە تێکۆشان بە رێوە دەبەن.
- روو داوەکانی ئێران و بە سەرهاتی رێکخراوەکانی حیزبی تودە( کومیتەی کوردستان )دێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە لە حیزبی تودە جیا بێتەوە و سەر بەخۆ وەک حیزبی دیموکرات تێکۆشان درێژە پێبدا. بەلام بە تەواوی ساغ نابنەوە. پێوەندی یەکە لە رێگای عبدالرحمن قاسملو کادری حیزبی تودە و بەر پرسی کومیتەی کوردستان ئەم جارە لە گەڵ رێبەرایەتی حیزبی تودەی دانیشتووی دەرەوە دادە مەزرێ.
- سالی ١٩٥٥چەند کادرێکی حیزبی دیموکرات کۆ دەبنەوە و ناوی دەنێن کۆنفرانس. بە پێچەوانەی نووسینی مەلا عەولای حەیاکی ئەم کۆبوونەوەیەی بە ناو کۆنفرانسە، نە دەتوانێ هیچ( گیر و گرفتەکانی ئەو دەمەی حیزب بە باشی چارە سەر بکا )نە وەک کاک جەلیلی گادانی د ەنووسێ ( گەلالەی پێشنیاری نوێی بەرنامەی حیزبی پەسند دەکا و نە وشەی ئێرانش ئەو دەم لە ناوی حیزب زیاد دەکرێ و نە چەند کەسیش لە ئەندامانی کۆنفرانس وەک ئەندامی رێبەرایەتی دیاری دەکرێن) تەنیا وەک دوکتور قاسملووی شەهید دەڵێ:« ئەم کۆبوونەوەیە کە پاشان ناومان نا (کۆنفرانسی یەکەمی حیزب) ٧ــ٨ کەسیش زیاتر نەبووین.»
- دوای ئەو کۆ بوونەوەیە کومیتەی کوردستانیش ئیتر بە کردەوە لە بەر یەک هەڵدەوەشێ.هێندێ لە ئەندامانی کومیتەی کوردستان دەگیرێن. تەنیا چەند کادری حیزب بێ بەر نامەو دروشم و تاکتیک و ستراتێژی لە دێهات دەسوڕێنەوە. عەولای ئیسحاقی بە تەنیا لە نێوان کوردستانی ئەم دیوو ئەو دیو لە هاتو چۆ دا دەبێ
- سالی ١٩٥٩ رێکخراوەکانی حیزب دەکەونە بەر پەلاماری ساواکی شا. بۆ یەکەم جار دوای روخانی کۆماری کوردستان، ناوی حیزبی دیموکرات بە رەسمی دێتە نێو فایلە و بایگانی و ئارشیوی حکوومەتی ئێران و دەوڵەتی تاران حیسابی تایبەتی بۆ حیزبی دیموکرات دەکاتەوە. پێشتر کە لە کوردستان ئەندامانی حیزب

به ناوی تودەیی دەگیران و دادگایی دەکران، ئەمجارە ئێر حکومەتی ئیران ناتوانێ ناوی حیزبی دیموکرات بە ژێر لیچەوە بکات و بە تاوانی ئەندامەتی حیزبی دیموکرات تێکۆشەران ئازار و ئەشکنجە و دادگایی دەکرێن.

- بە دوای ئەم پەلامار و گرتن و ئاوارە بوونەی ئەندامانی حیزبدا. ئیتر عەولای ئیسحاقی دەبێتە (ئەحمەدتوفیق) و دەبێتە حیزب و دەبێتە کومیتەی ناوەندی و دەبێتە نوێنەری کومیتەی ناوەندی و دەبێتە کەڵەگای حیزب. سەرە رۆیی عەولای ئیسحاقی سەر دەکێشێتە دوو بەرەکی و کوشتنی کادری رێبەرایەتی حیزب و ناکۆکی. بەڵام دیسان ناوی حیزب بە بێ تێکۆشانی سیاسی و بەرنامە دە پارێزرێ.

- ئەنجامی سەرە رۆیی ئەحمەد توفیق دەگاتە پێکهاتنی کومیتەی ساخکەرەوە. چەند کەس لە کادرەکانی حیزب بۆ ساخکردنەوەی رێباز و سیاسەتی حیزب کومیتەیەک بەم ناوە پێک دێنن. بەڵام سەبارەت بە پشتیوانی سەرۆک بارزانی لە ئەحمەد توفیق تووشی راو نان و گرتن و هەڵات هەلات دەبن.

- سەرە رای ناکۆکی نێوان کادر و ئەندامانی حیزب ،ساڵی ١٩٦٤ کۆنگرەی حیزب دەبەسترێ کە بە کۆنگرەی دووەم ناسراوە. لەم کۆنگرەیەدادروشمی سەرەکی حیزب دەبێتە( یەکێتی، خەبات ، سەربەخۆیی ، دیموکراتی) خەباتی چەکدارانە و شۆرش بە رێگای رزگاری نەتەوایەتی دادەنرێ. بۆ یەکەم جار دوای کۆماری کوردستان بەرنامەی حیزب پەسند دەکرێ و کومیتەی ناوەندیش هەڵدەبژێردرێ. دروشمی خەباتی چەکدارانە بێ ئەوەی زەمینەیەکی تەشکیلاتی و کۆمەڵایەتی گونجاوی هەبێ و لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە پێشوازی لێبکرێ و توانا و هێزی حیزب و دوژمن لە بەر چاو بگیرێ، بە لاسا کردنەوەی بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی کەرمێن دێتە سەر کاغەز و دەبێتە دروشمیکی بریقەدار بێ ئەوەی بنچینەیەکی پتەوی زانستی و جەماهیری هەبێ.

- دوای کۆنگرەی دووەم لە نێو کومیتەی ناوەندی و ئەندامان ناکۆکی تەشەنە دەکات. (کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان) پێک دێت و بێ

بەرنامە و تاکتیک و ستراتیژی توشی خەباتی چەکداری دەبێ. ئەنجامی خەباتی چەکداری داسەپاو لە لایەک بریتی یە لە: فشاری حکوومەتی ئێران بۆ سەر کوردستان، ئاوا کردنی گرتوو خانەی جەلادیان راونان و گرتن و لە دار داتی ئازادیخوازانی کورد و کوشتن و گرتن وتەحویلدانەوەی ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە لایەن بزووتنەوەی کوردستانی عیراق و شەهید بوونی شۆرشگێران لە لایەکی دیکەوە.

- ئەم قۆناخە دژوار و بەردەلانە بە شپرزەیی و ئاڵۆزی نێو حیزبی دیموکرات و راکردنی ئەحمەد توفیق سکرتێری حیزب بۆ نێو حکوومەتی بەعسی عیراق لە جەنگەی شەڕی کوردستان و لێک کۆبوونەوەی چەند ئەندامێکی حیزب و بەستنی کۆنفرانسێکی بێ بەر نامە و بێ چالاکی و تێکۆشانی سیاسی و ئەدەبی و کۆمەلایەتی کۆتایی پێدێت. سەرجەمی خەبات و تێکۆشانی ئەم قۆناخە، بەرهەمەکەی بریتی یە لە پاراستنی ناو و نیشانی حیزبی دیموکرات وەک سوننەتێک لە کوردستانی ئێراندا و ماندوو بوون وفیداکاری هێندێ لەئەندامانی حیزبە وئاوارەی هێندێکی دیکە و هیچیتر.

# قۆناخی دووەمی بزووتنەوەی نیشتمانی ودموکراتی لەکوردستانی ئێران

## بەشی شەشەم : حیزبی دێموکرات ۱۹۷۹ ـــ ۱۹۷۰

پاش رێک کەوتننامەی نێوان بزووتنەوەی کوردستانی عیراق بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر و حکوومەتی بەعسی عیراق. کە لە مێژووی خەباتی دوور و درێژی نەتەوەی کورددا، بە خاڵێکی سەرەکی و گرنگی سەرکەوتن دێتە ژمار لە یازدەی مارسی ۱۹۷۰ دا، بۆ کوردە لێقەوماو و پەرش و بڵاوەکانی کوردستانی ئێرانیش دەرفەتی ئەوە پێک دێت کە لێک وەکو بن و تێکۆشانێکی نوێ دەست پێبکەنەوە. بە تایبەت کە سەرۆک بارزانی رێگای ئەوە ش دەدا ئەو ئەندامانەی حیزبیش کە لە گەڵ کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دێموکرات بەشدار یی بزووتنەوەی چەکداری یان کرد بوو، و دوای شکانی لە بەر ناکۆکی نێو خۆیان و لە ترسی سەر کردایەتی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق چوو بوونە بەکرە جۆو لە لای مام جەلال گیرسا بوونەوە، بگەڕێنەوە ناوچەی ژێردەستی بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عیراق، یارمەتی بە کۆبوونەوە ولێک نیزیکبوونەوەی ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستان دەکات.

ئەو ئەندامانەی پاشماوەی کۆنگرەی دووەمی حیزبی دێموکرات کە دوای دوور خستنەوەی ئەحمەد توفیق بۆ ناوچەی بادینان و راکردنی بۆ نێو حکوومەتی عیراق، کۆنفرانسێک دەبەستن. لە کۆبوونەوەیەکی خۆیاندا بریار دەدەن کە داوا لە دوکتور قاسملو و حەسەنی قزڵجی و کەریمی حسامی بکەن. بگەڕێنەوە

کوردستان و هاوکاری یان بکەن.

بەر لە دەر چوونی بەیاننامەی یازدەی مارسی ۱۹۷۰ حەمەدەمینی سراجی وەک تاقە کەس کە لە رێبەرانی بزووتنەوەی چەکداری ۱۹٤۸ - ۱۹٤۷دەر باز ببوو، رۆژی ۱۹۷۰/۲/۱۵ دەگاتە بولغارستان و لە وێ لە گەڵ دوکتور قاسملو و کەریمی حسامی و حەسەنی قزلجی چاویان پێک دەکەوێ و پاش لێکدانەوەی بارو دۆخی کوردستان کە لەو ماوەیەشدا بە یاننامەی ۱۱ی مارسیش دەردەچێ، دێنە سەر ئەو بڕیارە کە حەمەدەمینی سراجی بچێتەوە عیراق و دوکتور قاسملوش بە دوای ئەو دا بچێتە بەغدا هەم بۆ پیرۆز بایی لە سەرکەوتنی بزووتنەوە بچنە کن سەرۆک بارزانی و هەم بۆ مانەوەی ئەندامانی حیزب و دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ ژیان و حاوانەوەیان لە گەڵ حیزبی بەعسی عیراقیش پێوەندی بگرێن.

لە سەر ئەو بڕیار و بۆ چوونە حەمەدەمینی سراجی رۆژی ۲۰ی مارسی ۱۹۷۰ بۆ عیراق دەگەرێتەوە. دوکتور قاسملوش دەچێتەوە پراگ و لە سەر بڕیاری پەسند کراو ئاخری مانگی مارسی ۱۹۷۰ دەچێتە بەغد او لە گەڵ حەمەدەمینی سراجی و یوسفی ریزوانی بۆ پیرۆز بایی دەچنە لای سەرۆک بارزانی. لە ناو پردان چاویان بە ئەمیری قازی و هێمنی شاعیر دەکەوێ. پاش دانیشتن و ئاخافتنی دۆستانە دەگەنە ئەم ئاکامە کە کۆتایی بە دوو بەرە کی و پەرش و بڵاوی حیزبی دیموکرات بێنن و کومیتەیەکی سەر کردایەتی کاتی حیزبی دیموکرات بۆ کۆ کردنەوە و ڕێکخستنی ئەندامانی حیزبی دیموکرات دیاری بکەن.

«..... چووینە لای مەلا مستەفا، ئەمیری قازی و هێمن و چەند کەسی تر لە وێ بوون. دوکتور مەحمود عوسمان زۆر ئیسراری هەبوو کە یەک بگرنەوە. ئێمەش لە بەر قسەی ئەوان لە گەڵیان دانیشتین. پاش گلەیی و دەمەتەقە بە تایبەت لە گەڵ سراجی بڕیار ماندا هەتا کۆنفرانسێکی حیزبی ۸ کەس بە ناوی (کومیتەی سەرکردایەتی کاتی حیزبی دیموکراتی کوردستان) دیاری بکەین. ئەم ۸ کەسە ئەمانەن:(قاسملو، ئەمیری قازی، هێمن، سراجی، حەسەن ڕستگار، عەولای حەیاکی، یوسفی ریزوانی، کەریمی حسامی) هەروەها بڕیارمانداوە ئەگەر کاک

حەسەنی قزلجی بگەڕێتەوە، ئەندامی کومیتەی ناوەندی یە.» (١)

ڕەنگە ئەمەش خۆی جێگای پرسیار بێ کە بۆ چی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی پاشماوەی کۆنگرەی دووەم و ئەوانەی لە کۆنفرانسە کەشیاندا ببوونە ئەندامی کومیتەی ناوەندی واز لە ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی و ڕێبازی خۆیان دێنن و مل ڕادەکێشن کە ببنە (کومیتە سەرکردایەتی کاتی حیزبی دیموکراتی کوردستان) تا کۆنفرانسێکی دیکە.؟

با بزانین عەولای حەسەنزادە کەخۆی دەروێشی ڕێبازی ئەحمەد توفیق بوە لەم بارەوە دەڵێ چی : «....لە گەڵ کاک دوکتور و کاک حەمەدەمین و کاک یوسف چاومان پێک کەوت. لانی کەم حەوتوێک باس و وتو وێژمان بوو. ئەوە کە ئێمە لە بەر ئەزەری کادرەکانی حیزبی ئەمان دەویست کاک حەمەدەمین وەربگرینەوە و دوکتوریش پێی چەقاند بوو کە بە بێ ئەو هاوڕێیە هاوکاریمان ناکا. قسەی خۆمان بێ ژمارەیەکی زۆر لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب کە پاش شکانی ڕاپەڕینی ٤٧ -٤٦ ڕایان کرد بوو بۆ نێو حکوومەت لە ناوچەی سلیمانی و لە تەنیشت مەکتەبی سیاسی کۆنی پارتی بە چەکەوە بنکەیان هەبوو کە ئەوانەش پێوەندی یان بە سراجی یەوە هەبوو بە هێزی چەکداری ئەو برایانە دەژمێر دران ژمارەی ئەوانەش زۆر کەمتر نە بوو لە ژمارەی ئەو کەسانەی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا دەژیان و بە پەرش و بلاوی لە گەڵ کومیتەی ناوەندی بوون. کە وایە لەو بارەشەوە پشتیان قایم بوو. دووهەم ئەوە بوو کە دوکتور قاسملو قبولی نەبوو لە گەڵ کومیتە ناوەندی یەک کە هەڵبژێراوی کۆنگرەی دووهەمە. کۆنگرەیەک کە تۆمەتی جاسوسی داوەتە پاڵ ئەو، هاوکاری بکا. دەیویست ئۆرگانێکی تازەی ڕێبەرایەتی دروست بکرێ. جا هەر ناوێک لە سەری دانرا با بۆ ئەو فەرقی نەبوو»»(٢)

دوای ئەم ڕێککەوتن و گۆتو بێژە، کومیتەی سەرکردایەتی کاتی لە سەرە تاوە سێ ئەرکی سەرەکی بۆ خۆی دیاری دەکات.

یەکەم - دانانی گەلالەی پیرەو و پرۆگرامی حیزبی دیموکراتی کوردستان

دووەم - کۆ کردنەوەی ئەندامانی حیزب لە یەک دووشوێن و لە ناو بردنی کێشە و ناکۆکی و پێکهێنانی دیسیپلین و ڕێک و پێکی ڕێکخراوەیی و تێکۆشان بۆ دابینکردنی ژیان و بەرێچوونیان

سێ یەم - ئامادە کردنی هەل و مەرجی لە بار بۆ پێکهێنانی کۆنفرانسی حیزبی بۆ پەسندکردنی پێرە و پرۆگرام و هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی بە شێوەیێکی یاسایی و حیزبی یانە.

خاڵی یەکەم کە دانان و ئامادە کردنی گەلاڵەی پێرەو پرۆگرام بوە، بە دوکتۆر قاسملوو دەسپێردرێ و لە ڕاستیشدا ئەنجامدانی ئەم ئەرکە هەر لە دەست وی هاتوە چونکە ئەوانی دیکە هیچیان ئەهلی نووسین و بیرو دانانی پێرەوو پرۆگرام نە بوون. دوکتور قاسملوو دەگەڕێتەوە بۆ چێکوسلۆڤاکیا و خەریکی ئامادە کردنی پێرەو و پرۆگرام دەبێ.

پاش نووسینی گەلاڵەی پرۆگرام، ڕۆژی ٢٠ی سێپتامبری ١٩٧٠بۆ ڕاوێژ و هەڵسەنگاندنی نووسراوەکەی لە گەڵ حەسەنی قزڵجی و کەریمی حسامی دەچێتە بولغارستان. لە سۆفیا ماوەی دوو ڕۆژان نێوە ڕۆکی گەلاڵەی نووسراوە شی دەکرێتەوە. پاش لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی بارو دۆخی ئێران و جیهان دەگەنە ئەم قەناعەتە کە ( ڕووخانی ڕێژیمی شاو پێکهێنانی کۆماری فیدراتیڤی ئێران ) بکرێتە ستراتێژی حیزبی دیموکراتی کوردستان. بە تایبەت کە مەسەلەی (ئیتحادی فیدراڵی) لە بەیاننامەی هاوبەشی کومیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان و نوێنەرانی حیزبی تودەی ئێرانیشدا هاتبوە گۆڕێ.

دوکتۆر قاسملو پاش ئەو چاو پێکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ پراگ کە لە وێوە بچێتەوە عیراق و لە گەڵ کومیتەی سەرکردایەتی کاتی دروستکراو خەریکی تێکۆشان بێ. لە سەرەتای مانگی ئۆکتۆبری ٩٧٠ دوکتۆر قاسملو بە تەلیفۆن بە نووسەری ڕاگەیاند و گوتی:« ...ئیرەجی ئەسکەندەری کە تازە بۆتە سکرتێری حیزبی تودە لە پراگ بوو چاوم پێکەوت. لە سەر گەلاڵەی پێرەو و پرۆگرام ڕاوێژم پێکرد. ئەو وا بە باش دەزانێ کە ستراتێژی حیزب لە جیاتی (ڕوخانی ڕێژیمی

شاو کۆماری فیدراتیف) بکەینە( دیموکراسی بۆ ئێران و خود موختاری بۆکوردستان)بۆ چوونەکەشی هێندێ نوختەی راست و مەنتقی تێدایە. ئەگەر یەکترمان دێ قسەی لێدەکەین. لە وەش زیاتر ئیرەج پێشنیاری کرد کە لە گەڵ بیرۆی سیاسی حیزبی تودە دانیشتنێکمان هەبێ. منیش پێم خەراب نیە.

پێش گەرانەوەم بۆ بەغدا، تۆش بێی بۆ ئەڵمان و دە هەوای زاری ئەوانیش بکەین .تکایە کاک حەسەنی قزلجیشر ئاگادار بکە. رۆژی ١٢ی مانگی ئوکتۆبری ١٩٧٠بیرۆی سیاسی حیزبی تودەی ئێران داوا دەکات کە دوکتور قاسملو، حەسەنی قزڵجی و کەریمی حسامی بۆ چاو پێکەوتنێکی راوێژی بچنە ئەڵمان. رۆژی ١٥/١٠/١٩٧٠ هەر سێکیان لە لایپزیک لە گەڵ ئیرەجی ئەسکەندەری سکرتێری حیزبی تودە و عبدالصمد کامبەخش ئەندامی بیرۆی سیاسی کۆ دەبنەوە. دوکتور قاسملو سەفەری بەغدا و کۆبوونەوە و یەکگرتنەوەی باڵەکانی حیزبی دیموکرات و پێکهێنانی کومیتەی سەرکردایەتی کاتی و رێباز و بەرنامەی حیزبی دیموکرات باسدەکات.

باش باس و لێکدانەوەی بار ودۆخی عیراق و بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عیراق، ئیرەجی ئەسکەندەری دەڵێ:« ئێمە لە گەڵ ئەندامانی بوروی سیاسی کۆ دەبینەوە و بەیانی بیر و رای خۆمان باس دەکەین.

رۆژی ١٦/١٠/١٩٧٠ کۆبوونەوە دەست پێدەکرێتەوە. ئیرەجی ئەسکەندەری دەڵێ:«... هەیئەتی دەبیرانی حیزبی تودە لە کۆبوونەوەی خۆیدا سەبارەت بە پێوەندی لە گەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەم بریارانەی خوارەوەی داوە :

١ - هەڤاڵانی حیزبی دیموکراتی کوردستان تێبکۆشن کە حیزبی دیموکراتی کوردستان لە رەوهەندی ئانتی کۆمونیستی و دژ بە سۆفیێت بە دوور بێ.

٢ - سیاسەتی دژ بە حیزبی تودە نەگرێتە پێش

٣ - لە گەڵ مەلا مستەفای بارزانی پێوەندی باش رابگرێ

٤ - حیزبی دیموکرات خۆی بە بەشێک لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی سەرانسەری ئێران بزانێ

٥ - پاش دامەزراندنی ڕێکخراوەیەکی ئەو تۆ، حیزبی تودەی ئێران ئەم حیزبە بە رەسمی دەناسێ و بە هەموو تواناوە پشتیوانی لێدەکات.»

دوکتور قاسملو دەڵێ :« حیزبی دیموکرات بێجگە لەو ڕێبازە، ڕێبازێکی دیکەی نیە «(٢) دوای ئەم کۆبوونەوەیە دوکتور قاسملو دەچێتەوە بەغدا و لە گەڵ کومیتەی سەرکردایەتی کاتی دەست بە تێکۆشان دەکا.

لە بواری ئەرکی دووهەمەوە، کومیتەی سەرکردایەتی کاتی دەتوانێ ئەو ئەندامانەی حیزبی کە لە گەڵ کومیتەی شۆڕشگێڕی بوون و دوای شکان لە بەکر مجۆ لای مام جەلال گیرسا بوونەوە، لە سەر ئیجازەی سەرۆک بارزانی بیانهێنێتەوە ناوچەی ژێر دەستی پێشمەرگەو لە کۆیە و سەنگەسەر و قەلادزە نیشتەجێ یان بکا و لە باری ژیان و بەڕێچوونیشەوە فیکریان بۆ بکاتەوە. حکوومەتی عیراقیش دەیەوێ لە ڕێگای یارمەتی یەکی کەمی مادی دەستیان بخاتە ناو. سەری مانگ پیاوێکی خۆی دەنێرێ و هەر یەکە یارمەتی یەکیان پێدەکات. کومیتەی سەر کردایەتی نا ڕەزایی خۆی لەم کارەی حکوومەتی بەعس رادەگەیێنێ و داوا دەکات کە یارمەتی دەبێ بدرێ بە ڕێبەرایەتی حیزب و ئەوان خۆیان دەزانن چۆن یارمەتی بە برادەرانیان دەکەن. ئەم هەڵوێستەی کومیتەی سەرکردایەتی حکوومەتی بەعس لا لوت دەکا. ئەندامانی حیزب و کومیتەی سەرکردایەتی لە باری ژیانەوە توشی دەست تەنگی و دژواری دەبن. بەلام سەر بەخۆیی و کەسایەتی سیاسی کومیتەی سەرکردایەتی کاتی حیزبی دیموکراتی بە حکوومەتی بەعس نیشان دەدرێ.

لە بواری ئەرکی سێ یەمەوە کومیتەی سەرکردایەتی سەرە ڕای ناکۆکی تەشە نەداری نێوان باڵەکانی حیزبی دیموکرات و گیرو گرفتی جۆر بە جۆر دەتوانێ هەل و مەرجی بەستنی کۆنفرانسێکی حیزبی پێک بێنێ و حیزبی دیموکرات لە بێ سەر و بەرەیی نەجات بدا. دەر کردنی ڕۆژنامە بۆ ئەنجامی ئەو مەبەستە گرنگترین کار بوو کە دەبوایە بەرێوە بچێ. کومیتەی سەرکردایەتی کاتی لە ژێر ناوی (ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان)دا یەکەم ژمارەی

رۆژنامەی «کوردستان» لە ڕێبەندان (ژانویەی ١٩٧١) دا بلاو دەکاتەوە. لە ژمارە یەکەمی «کوردستان» دا لە ژێر سەر خەتی(دیسان کوردستان) نووسراوە:

«... خوێنەرانی خۆشەویست ' ئەوە یەکەم ژمارەی «کوردستان» ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بەر چاوتانە..... «کوردستان» لە ساڵەکانی ١٣٢٤ــــ٢٥ وەک بلاو کەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد دەر دەچوو.... ساڵی ١٣٣٣ «کوردستان» وەک ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە نهێنی بلاودەکرایەوە..لەڕێبەندانی ساڵی١٣٤٣وە «کوردستان» لەدەرەوە بلاو کرایەوە.هەرچەندەئەمجارە ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان نەبوو، بەلام ڕێبازی هەر ڕێبازی حیزبی دیموکرات بوو.» (٤) *

دەرکردنی رۆژنامەی «کوردستان» هەنگاوێکی مەزنی سیاسی و تەشکیلاتی بوو، بۆ هێنانەوەی حیزبی دیموکرات بۆ سەر ڕێبازێکی ئوسولی سیاسی و حیزبایەتی. چونکە لە راستیدا پێشتر بە کۆنگرەی دووەمیشەوە شتێک بە ناوی ئوسوڵ و ڕێ و شوێنی حیزبی لە گۆڕێدا نە بوە. ئەوەندە نەبێ ناوی حیزبی، بێ بەرهەم و نەتیجەی سیاسی و تەشکیلاتی پارێزراوە.

« .... یەکگرتنەوە لە گەڵ قاسملو خێری بۆ حیزبی دیموکرات زۆر بە دواوە بوو. بە راستی تەنیا پاش هاو کاری لە گەڵ قاسملو بوو کە ئێمە شتێکمان لە مانای

---

* تێبینی:

یەکەمــــ دانانی (ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات) بۆ رۆژنامەکە ئەو دەم کارێکی راست نەبوە. چونکە ئەوانەی رۆژنامەیان دەرکردوە.( کومیتەی سەرکردایەتی کاتی حیزبی دیموکرات ) بوون، نەک کومیتەی ناوەندی. چونکە لە لایەن هیچ ئۆرگانێکی رەوایەتی حیزبی هەڵنەبژێر درابوون

دووەم-لەساڵەکانی١٩٤٩ـــ١٩٥٩رۆژنامەی«کوردستان» لەباکو(ئازەربایجانی سۆڤیەتی)لەلایەن چەند نیشتمانپەروەری گوردەوە. بەناوی(ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان) بلاو کراوەتەوە. لێرەدا باسی نەکراوە.

سێ یەم -ئەو «کوردستان»ـەی لەئوروپا دەرچوە. پێوەندیی بەحیزبی دیموکراتەوە نەبوە. لەراستیدا رۆژنامەی«کوردستان» تا کۆنفرانسی سێ یەمی حیزب، تەنیا لەساڵەکانی ١٩٤٥-١٩٤٦ بەرەسمی وەک ئۆرگانی حیزبی دیموکرات (بلاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان بوە) پێداچوونەوە

دروستی حیزبایەتی و کاری حیزبی و ئوسولی حیزبی بەر چاوکەوت و کەم و زۆر فێری بووین بەو یەکگرتنەوەیە کەوتینە فیکری دروستکردنی تەشکیلاتی ڕێک و پێکتر، خۆ ناساندن بە حیزب و ڕێکخراوەکانی کورد و ئێرانی و ناوچەیی و جیهانی و......» (٥)

ڕۆژنامەی کوردستان چ لە بواری ڕەوانبێژی زمان و چ لە بواری بۆ چوون و لێکدانەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوری یەوە لە نێو ڕووناکبیرانی کوردستانی عێراقدا جێگای خۆی دەکاتەوە و پێشوازی لێدە کرێ. تا ڕادەیەکی کەمیش دەگاتەوە کوردستانی ئێران.

دەست بە کار بوونی کومیتەی سەر کردایەتی کاتی لە سەرەتاوە سەبارەت بە بۆ چوونی جیاواز و ناکۆکی تەشەنە کردووی نێوان لایەنگرانی کومیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکرات و ئەندامانی ڕێبازی ئەحمەد توفیق و پلەی و شیاری سیاسی دژواری زۆری دێتە پێش. دوای یەکگرتنەوە ئیتر مەسەلەی کاری سیاسی و تەشکیلاتی و تەبلیغاتی دێتە پێش و شێوەی ڕابردووی حیزبایەتی پێویستی بە گۆڕانکاری ڕیشەیی هەیە.

ئەم قۆناخە کادری سیاسی و لێهاتووی گەرەکە. ئەوەش لە نامەی ٩٧٠ /١٢/١٣ ی دوکتور قاسملو دەر دەکەوێ کە بۆ کەریمی حسامی نووسیوە: «....براگیان زۆر پێ ویستە کە گیر نەبی هەر چی زووتر خۆت بگەیێنیە بەغدا. چونکە بە ڕاستی کارمان زۆرە، وەزعێکی وەها تایبەتی هاتۆتە پێش کە پێ ویستە تۆ لێرە بی و مەسئولیەتی کاری تەشکیلاتی بخەیە سەر شانی خۆت. چاوەڕوانی نامە و هاتنتین.» (٦)

لە سەر نێوە ڕۆکی گەلالەی پێرەو پرۆگرامی حیزبی کە دوکتور قاسملوو لە گەڵ خۆی برد بۆوە، بە تایبەت لە سەر دروشمی ستراتیژی کە ( خودموختاری) بۆ کوردستان لە بەر چاوگیرا بوو، بیر و ڕای جیاواز دێنە پێش. کۆمیتەی سەر کردایەتی بۆ باس لە سەر گەلالەی پێرەو و پرۆگرام کۆ دەبێتەوە و ئەم بریار نامەیەی خوارەوە پەسند دەکا

«... کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە رۆژی ١٩٧١/٣/٣٠وە تا ١٩٧١/٤/٤ دریژەی بە کۆبوونەوەکانی خۆیدا و ئەم بریارانەی دا:» لە بەرئەوەی لە سەر پێرەو و پرۆگرام چەند پێشنیارێک هاتبوو، دوو برادەری کومیتەی ناوەندیش نەزەریان لەو بارەوە هەبوو، قەراردرا کە:

١ – کومیسیۆنێک لەو برایانە پێک بێ: قاسملو، سراجی، حسامی، حەیاکی بۆ لێکۆڵینەوەی پێشنیارەکان و نەزەری ئەو دوو برادەرە لە سەر گەڵاڵە و گۆرینی گەڵاڵەکە بە شێوەیەک کە پێشنیاری پەسند کراوی تێدا گونجابێ. دیارە گەڵاڵەکە بۆ قەراری دوایی دەهێننەوە بۆ کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی.

٢ – گەڵاڵەی پێرەو و پرۆگرام هەتا کۆنگرە یا کۆنفرانس وەک پێرەو و پرۆگرام حساب دەکرێ.

٣ – کومیتەی ناوەندی وەک ئۆرگانێک و ئەندامانی کومیتەی ناوەندي ئەو پێرە و و پرۆگرامە دەبەنە ناو خەڵک و تەبلیغیان بۆ دەکەن لە ناو ئەندامانی حیزبدا و دیفاعیان لێدەکەن.

٤ – ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هەقیان هەیە لە کۆنگرە یا لە کۆنفرانسدا هەر نەزەرێکیان لە سەر پێرەو و پرۆگرام هەبێ، بیڵێن.

٥ – ئەندامێکی حیزب کە دژی پێرەو و پرۆگرام کە لە لایەن کومیتەی ناوەندی یەوە پەسند کراوە بوەستێ و تەبلیغ لە دژی بکا و خۆی لێ دوور بخاتەوە و هاوکاری نەکا لە حیزب دەر دەچێ.

٦ – ئەندامانی تر کە نەزەریان لە سەر مەجموعەی گەڵاڵەی پێرەو و پرۆگرام یا چەند بەندێکی هەیە، بەڵام دژی ڕاناوەستن و هاوکاری دەکەن، دەبێ حیزب تێبکۆشێ بە شێنەیی اقناعیان بکا و ڕێگایان پێشان بدا تا وەختێک کە کۆنگرە یا کۆنفرانس بریاری دوایی لە سەر پێرەو و پرۆگرام دەدا.

٧ – لە بەر ئەوەی لە سەر بەندی چواری گەڵاڵەی پرۆگرام ناکۆکي رەئی هەبوو لە ناو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی دا، قەرار درا کۆنگرە یا کۆنفرانس بریاری دوایی لە سەربدا و هەتا ئەو دەمیش: لە ئەسنادی حیزبیدا دروشمی خود

موختاری له چوار چێوەی ئێرانێکی دیموکراتی دا به کار دەهێندری. چونکه گۆرینی دروشمی خود موختاری به جمهوری هاسانتره و هەنگاوێکه بەره و پێش، بەڵام ئەگەر دروشمی جمهوری هەڵبگری پاشه کشه لەم دروشمه له باری سیاسی یەوە تووشی تەنگ و چەڵەمەمان دەکا.

الف – کومیتەی ناوەندی له عەینی وەختیشدا لەو باوەره دایه که له باری ناوەرۆکەوە له ناو دروشمی کۆماری دیموکراتی کوردستان و حکوومەتی خود موختاری کوردستان دا جیاوازی نیە.

ب – پێکهاتنی خود موختاریی کوردستان نا تەبایی هەیه دەگەڵ بوونی ڕێژیمی پاشایەتی حەمەرەزا شا له ئێراندا

ج – شێوەی ئەسڵی خەبات بۆ جێ بە جێ کردنی ئەم شیعاره له هەل و مەرجی ئەو ڕۆژدا شێوەی خەباتی چەکداره » (۷)

له کۆ بوونەوەی ۱۹۷۱/٥/۱۳ یشدا، سەبارەت به بزووتنەوەی کوردستانی ئێران، ئەم بڕیارانەی خوارەوە پەسند دەکا:

۱ – کومیتەی ناوەندی نەزەری ئەوەیه که شۆرشی چەکدار ڕێگای ئەسڵی رزگاریی ئێران له ژێر باری ڕێژیمی شا و ئیمپریالیزمه.

۲ – کومیتەی ناوەندی لەو بڕوایه دایه که خەباتی گەلانی ئێران گەیشتۆته قۆناخێکی تازه و زۆر کاره ساتی ئەو چەند مانگەی دوایی ئەو ڕاستی یه ئیسبات دەکا

۳ – هێندێ شەرتی ئەساسی وەک یەکگرتنی هێزه دیموکراتی یەکانی ئێران، شەرایتی دەرەوەی له بار به تەواوی بۆ بەرپاکردنی شۆرشی چەکدار پێک نەهاتوه. به تایبەتی ڕوون بوونی هەڵوێستی سەرۆکایەتی شۆرشی کوردستانی عیراق زۆر گرنگه.

٤ – دەستپێکردنی جوڵانەوەی چەکدار بەم چەشنه، واته بەبێ ئامادەیی و به بێ پێکهێنانی تەشکیلاتی حیزبی ڕێک و پێک و به هۆی ئەو کەسانه که ناوبانگیان له کوردستانی ئێران باش نی یه، به ڕاست نازانێ.

٥ – کومیتەی ناوەندی لەو بڕوایه دایه که حیزب دەبێ له هەموو جوڵانەوەیەکدا که کۆمەڵانی خەڵک پشتیوانی لێبکەن بەشدار بێ.

٦ - کومیتەی ناوەندی دەبێ ڕێکخراوی حیزبی ئامادە بکا بۆ ئەوە بە هەموو هێزی یەوە لە بەرپا کردنی شۆڕشی سەرانسەری ئێراندا هاو بەشی بکا.

٧ - کومیتەی ناوەندی دەبێ لە ئێستاوە بە گوڕجی خەریکی پەروەردە کردنی کادری سیاسی و عەسکەری بێ.

٨ - کومیتەی ناوەندی دەبێ لە پێوەندیی خۆی دەگەڵ هێزەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران بۆ بەشدار بوونی حیزب لە جوڵانەوەی چەکدار دا کەڵک وەرگرێ.» (٨) *

---

- سەیرێکی ئازادانەی ئەم بڕیارانە نیشانی دەدا کە لەم کۆبوونەوەیەدا بەردی بناغەی پێشێلکردنی دیموکراسی حیزبی دادەڕێژرێ . دیارە ئەو دەم هیچ یەک لە ئەندامانی کومیتەی سەر کردایەتی کاتی و تەنانەت نووسەری ئەم دێرانەش نە هەستی پێدەکەن و نە دژی دەوەستن.
یەکەم - لە سەرە تاوە دەنووسرێ» کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی». لە کاتێکا کۆبوونەوەی» کومیتەی سەرکردایەتی کاتی» بوە، ئەو کومیتەیە لە لایەن هیچ ئورگانێکی ڕەوایەتی حیزب، وەک کۆنگرە و کۆنفرانس هەڵنەبژێردراوە. بەڵام ناوی»کومیتەی ناوەندی» لە سەر خۆ دادەنێ. بە داخەوە لە حیزبی دیموکرات دا، تا کۆنگرەی دووهەم هەر چی دەسەڵاتی گرتوتە دەست، بە کۆمەڵ بێ یا تاک ناوی کومیتەی ناوەندی لە سەر خۆ داناوە و چۆنی ویستوویەتی و بۆی لواوە ئاوا حیزبایەتی کردوە. کۆنگرەی دووەمیش نەیتوانیوە لە حیزبی دیموکراتدا کۆتایی بە سەرە ڕۆیی و شێوەی تەک پەرستی بهێنێ.
دووەم - گەڵاڵەی پێڕەو و پڕۆگرام مادام لە لایەن ئۆرگانێکی خاوەن سەلاحیەتەوە پەسند نەکرێ، هەر گەڵاڵەیە و ڕەسمیەتی بۆ نیە. بەڵام لێرەدا گەڵاڵە بە پێڕەو و پڕۆگرامی حیزب دانراوە .
سێ یەم - هەر لە پێشەوە ئەندامی حیزب بە دەر کراو دا دەنێ کە دژی پێڕەو و پڕۆگرامی پەسند کراوی کومیتەی سەر کردایەتی هەڵنەبژێردراوی کۆنگرە و کۆنفرانس بوەستێ و خۆی لێ دوور بخاتەوە و هاوکاری نەکا. (ئەم سیاسەتە لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا درێژەی هەبوە و ئەندامی حیزبی بە تاوانی دەربڕینی بیر و ڕا یە پێچەوانەی بۆ چوونی ڕێبەرایەتی لە حیزب دەرکراوە.)
چوارەم - هەر چەندە لە سەر هەڵگرتنی دروشمی خودموختاری ناکۆکی بیرو ڕا هەیە، بەڵام بەر لە پەسند کردنی لە لایەن ئورگانێکی ڕەوایەتی، بە بەڵگەی حیزبی دا دەنرێ و بە کار دەهێنرێ.
پێنجەم - بە بێ لە بەر چاو گرتنی هەل ومەرجی خۆجێیی ودەرەکی، لێکدانەوەی هێز وتوانای خۆیی ودوژمن خەباتی چەکداری بەشێوەی سەرەکی خەبات دادەنێ.
پێداچوونەوە

# کۆنفرانسی سێ یەمی حیزبی دێموکراتی کوردستان

رۆژی ۱۹۷۱/٦/۲۱بە بەشداری ۳۲ ئەندامی حیزبی کە بە بێ هەڵبژاردن لە لایەن کومیتەی ئامادە کردنی کۆنفرانسەوە بانگ کرا بوون، لە شارە پیرۆزەکەی حاجی قادر( کۆیە) کۆنفرانسی سێ یەمی حیزبی دێموکرات دەبەستری. لە پێش بەستنی کۆنفرانس دوکتور قاسملوو دەچێتە خزمەت مەلا مستەفا و خەیالی بەستنی کۆنفرانسی پێرادەگەیێنێ. بەڵێنیشی پێدەدەن کەمانگێ ۵۰۰ دینار یارمەتی بە حیزبی دێموکرات بکەن، کە لە بەڵێن تێناپەڕێ.

لە سەرە تاوە لە سەر ناوی کۆنفرانس کە داخوا کۆنفرانسی سێ یەمە یان دووەم، ناکۆکی دێتە پێش. دوکتور قاسملوو پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ کە ئەوەی ئێستا کۆنفرانسی دووەمی حیزبە. ئەندامانی سەر بە رێبازی ئەحمەد توفیق بە کۆنفرانسی سێ یەمی دەزانن. چونکە ئەوانیش کۆبوونەوەیەکیان هەبوە و ناویان ناوە کۆنفرانس وەک پێشتر باسی کراوە. لە ئەنجامدا بە زۆربەی دەنگ دەبێتە کۆنفرانسی سێ یەمی حیزبی دێموکرات. ئەگەر لە راستیشدا رێ وشوێنی دروستی حیزبایەتی مودێرن و پێشکەوتوو لە بەر چاو گیرابایە، کۆنفرانسی کۆیە دەبوایە بە کۆنفرانسی یەکەمی حیزب ناو دێر کرابا. چونکە بەراستی کۆبوونەوەکانی سالاتی ۱۹۵۵ و۱۹٦۹ کە ناوی کۆنفرانسیان بە سەرد ابراوە، تەنیا وەک دوکتور قاسملو دەڵێ کۆبوونەوەی هێندێ ئەندامانی حیزب بوو. بۆ باس و لێدوانی رووداوەکان. لەو کۆنفرانسەدا یەکە بە شێوەیەکی ئوسولی و رێکوپێک راپۆرتی کومیتەی سەرکردایەتی پێشکێش دەکرێ. پێرەو وپرۆگرامی حیزب دەکەوێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و پەسند دەکرێ. کومیتەی ناوەندی بە

شێوەیەکی دیموکراتی هەڵدەبژێردرێ.
کۆنفرانسی سێ یەم تا رادەیەکی زۆر کۆتایی بە سەرە رۆیی نێو حیزب و هەر کەس هەر کەسی دێنێ. دەرکردنی رۆژنامە و فێر کردنی ئەندامانی حیزبی دەکاتە ئەرکی کومیتەی ناوەندی کە ئەو دەم بە یەکێ لە ئەرکە گرنگەکانی رۆژی کومیتەی ناوەندی دەژمێردرا.

دوای کۆنفرانسی سی یەم کومیتەی ناوەندی هێندێ ئەرکی پێویست بۆخۆ دیاریی دەکا و بۆ راپەراندنیان دەست بە کار دەبێ. بەر لە هەموو شت پێوەندی لە گەڵ هاو نیشتمانانی کوردستانی ئێران و زیندوو کردنەوە و پێکهێنانی رێکخراوی حیزبی، کومیسیۆنی تەشکیلاتی حیزب لە نێو ئەندامانی حیزبی دانیشتووی کوردستانی عیراق تا رادەیەک ئوسولێکی حیزبی دادە مەزرێنێ و رێکیان دەخات. لە ناوەوەی وڵات بە داخەوە سەبارەت بە کەڵێک هۆکاری بابەتی و خۆیی نەک هەر سەر کەوتنێکی بەر چاو وە دەست ناهێنێ. بەڵکوو بە شەهید بوونی هاڤاڵ قادری ویردی، ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە بانە.١٩٧٣/٢/٢٣ و دوو هاوریێ تێکۆشەری دیکە محەممەدسەدیق و عەزیزی مستەفا زادە زەبرێکی قورس وە حیزبی دێموکرات و تێکۆشانی ناو وڵات دەکەوێ. ساواک بە هۆی زۆڵە کوردێکی خۆ فرۆش بە ناوی سەلیمی خات شەرافەت دەست دەخاتە نێو تەشکیلاتی بانە و ناو براو بە فێڵ و درۆ هاورێ قادر بۆ نێو شاری بانە رادەکێشێ و ساواک و ژاندارمەی بە گژ دا دەکا و لە ئەنجامدا هاورێ قادر شەهید دەکرێ و محەممەد سەدیق و عەزیزی مستەفا زادە دەگیرێن و لە دادگایەکی نیزامی لە شاری سنە بە ئیعدام مەحکوم دەگرێن. دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکرات بۆ رزگاری ئەم دوو تێکۆشەرە بە نووسینی نامەیەک پەنا بۆ سەرۆک بارزانی دەبا. بەڵکوو لە رێگای نفوزی ئەو گیانی ئەم دوو ئازادیخوازانە لە ئیعدام رەزگار بکرێ. بە داخەوە ئاکامێک نایەتە دەست و هەرتکیان لە سنە ئیعدام دەکرێن. داخی گەورە تر ئەوەیە وەک قاو بوو، دوای روخانی رێژیمی شا ئەم سەلیمە خاین و خۆ فرۆشە دەبێتە پێشمەرگەی ماموستا مەلا جەلال و لە سازمانی خەبات دابۆ (ئازادی

کورد ) و پەتەو کردنی ئیسلام لە کوردستان چەک هەڵدەگرێ.

لە گەڵ ئەو کۆستەش دیسان هێندێ پێوەندی لە گەڵ ئەندامانی حیزب لە ژوورەوە هەردەگیرێ و هێندێ نووسراوەی حیزبی دەگەنەوە نێو خۆی وڵات. لەتاران لەگەڵ چەند کوردێکی نیشتمانپەروەر پێوەندی دەگیرێ. دیارە کۆسپی گەورە بۆ تێکۆشانی حیزبی دێموکرات لەو کاتەدا هەڵوێستی پارتی دێموکرات و بزووتنەوەی چەکداری کوردستانی عێراق دەبێ کە رێگا نادەن ئەندامانی حیزبی بە نهێنیش بچنەوە وڵات و تێکۆشانی سیاسی بکەن. زۆر جاران ئەندامانی حیزبی دێموکرات کە بە بێ چەک دەیانەوێ بچنەوە وڵات، لە لایەن پێشمەرگەی بزووتنەوەی کوردستان دەگیرێن و ئازاریش دەدرێن. کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکرات چەند جار سەبارەت بەم هەڵوێستەی پارتی نامەی نارەزایی بۆ سەرۆک بارزانی و مەکتەبی سیاسی دەنێرێ، بەڵام بێفایدە دەبێ.

بۆ گێرانەوەی هێندێ تێکۆشەری کوردی کوردستانی ئێران بۆ نێو حیزب کە لە عێراق دەژیان، کومیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی ١٩٧١/٦/٢٥دا بریار دەدا پێوەندی یان پێوە بکرێ. بۆ پێوەندی لە گەڵ ماموستا زەبیحی سەبارەت بە دۆستایەتی و راوێژ و هاو کاری، دوکتور قاسملو دیاری دەکرێ، دوکتور ئەم پێوەندی یە دەگرێ و ئاکامی لە باریشی دەبێ.. تا ئەو دەمەی کومیتەی ناوەندی لە عێراق دەبێ، ماموستا زەبیحی لە هەموو بارێکەوە دۆستایەتی نێزیک لە گەڵ حیزبی دێموکرات دەپارێزێ.

سەبارەت بە پێوەندی لە گەڵ عەولای ئیسحاقی( ئەحمەد توفیق) مەلا عەولای حەیاکی و حەمەدەمینی سراجی دیاری دەکرێن کە پێوەندی دەگەڵ بگرن و داوای لێ بکەن واز لە هەڵبەز هەڵبەز بێنێ و بگەرێتەوە نێو حیزب.

«....لە دوای کۆنفرانس کۆمیتەی ناوەندی دوو کەس لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی بۆقسەکردن لە گەڵ اسحاقی دیاری کردن: محمدامین سراجی و عبداللەحسن زادە ئەم دوو کەسە لانی کەم سێ جار لە گەڵ ناو براو دانیشتن و زۆر دڵسۆزانە هەوڵیان دا قانیعی بکەن بگەرێتەوە ریزەکانی حیزب و واز لە

ئەکرەوێ و دوژمنایەتی لە گەڵ حیزب بێنێ. بە داخەوە ئەو پیاوە کە وادیاربو توشی نەخۆشی سادیسم بوە، تەنیا شەرتی بۆ گەرانەوە بۆ نێو ریزەکانی حیزب ئەوە بوو کە ئەو هێندێ کەس دەناسێ و دەزانێ جاسوسن. بەلام ئەو بۆی دەداو ناکەون. کەوایە دەبێ حیزب بانگیان کاتە بەغداو بیانداتە دەست ئیسحاقی کە بە مقسەی خۆی جێگای بۆ حەبس کردن و ئەشکنجە و ئازار و اقرار پێکردنیان هەیە. ئەو دەم ئەوان ئیعدام دەکا و دێتەوە نێو حیزب. هەر چەندیش هەوڵ درا کە بلێ ئەو کەسانە کێن، حازر نەبوو ناویان بەرێ. دەیویست نامەیەکی مۆرداری کومیتەی ناوەندی، یان دەفتەری سیاسی بدرێتێ کە لە وێدا حیزب بەرعوده بوو بێ ئەو کەسانەی تەسلیم بکا، جا ئەو جار حازر دەبێ ناوەکانیان بلێ، لەو لاشەوە کارەکانی خۆی وەک بەیاننامە دەرکردن و بەد گۆیی حیزبی درێژە پێدا و لە دوژمنایەتی حیزب دەست بەردار نەبوو. سەر ئەنجام لە مانگی بەفرانباری ١٣٥٠دا کومیتەی ناوەندی لە رۆژنامەی کوردستاندا بە بلاوکردنەوەی ئاگاداری یەکی کورت لە رۆژنامەی کوردستاندا دەرکردنی ئەحمەدتوفیقی لە حیزبی دیموکراتی کوردستان راگەیاند.» (٩)

هەنگاوێکی دیکەی کومیتەی ناوەندی پەروەردەی کادر و ئەندامانی حیزب دەبێ بە کومیتەی ناوەندیشەوە. بۆ ئەم کارە یەک دوو دەورەی کلاسی کادری یەک دوو مانگە دادەنێ و نیزیکەی ٢٠ کەسێک تێدا بەشدار دەبن و لە بواری سیاسی و ئابووری و رێکخستن و کۆمەلایەتی و ئەرکی ئەندامەتی حیزب دەرسیان پێدە گوترێ. کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات هەر چەندە لە بەغدا نیشتەجێ دەبێ و تا رادەیێکیش لە یارمەتی حیزبی بەعس کەلک وە ردەگرێ. بەلام تا سالی ١٩٧٥ کە بزووتنەوەی چەکداری کوردستان توشی شکان دەبێ، نەک هەر سەبارەت بە پاراستنی پێوەندی دۆستانە و لە بەر چاوگرتنی بەرژەوەندی بزووتنەوەی کوردستانی خوارووی سیاسەتی سەر بەخۆیی پاراستوە. بەلکوو سەبارەت بەم سیاسەتە نیشتمانی یە زۆر جار تووشی تەنگ و چەلەمەش بوە. بە داخەوە سیاسەتی پارتی لە ئاست حیزبی دیموکراتی کوردستان بە پێچەوانەی ئەوەبوە.

تەنانەت هێندێ کەسی ناڕازی لە حیزبی دێموکرات و گێرە شێوێن لە گوندی (ئێندزە) کۆ دەکەنەوە و بۆ بە گژ داچوونی حیزبی دێموکرات یارمەتیشیان دەدەن.

کومیتەی ناوەندی جگە لە دەرکردنی رۆژنامەی «کوردستان» گۆڤاری «تێکۆشەر» لە بواری چاپ و بلاو کردنەوەی ئەدەبیاتی سیاسی و مێژوویی و کولتوریشەوە هەنگاوی گرنگ داوێژێ. هێندێ کتێبی باشی سیاسی و مێژوویی و ئەدەبی دەنووسرێن و دەکرێن بە کوردی و بلاو دەکرێنەوە.

## رادیۆی شۆرشگێرانی ئێران

حکوومەتی عیراق لەو سالانەدا بۆ دژایەتی حکوومەتی ئێران، کەس و دەستە و تاقمی سەیر بە ناوی هێزی بەرهەلستکاری دژی ئێران لە بەغدا کۆ دەکاتەوە. یەک لەوانە (ژەنرال مەحموودی پەناهیان )دەبێ. پەناهیان ئەفسەری فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانی سالی ١٩٤٥ ــــ١٩٤٦ بوو. لە ئازەربایجانی سۆڤیێتی دەژیا. دێتە بەغداو حکوومەتی بەعسی دەزگا و دەبدەبەیەکی سەیری بۆ ساز دەکا بەو خەیالە لە ئێراندا کارێکی پێبکات. بەلام کابرا لە قسەو خواردن بەدەر هیچی لە دەست نایە. حکوومەتی عیراق رادیۆیەکی نهێنی لە بەغدا بۆ دادەمەزرێنێ کە دژی ئێران بەرنامە بلاو کاتەوە. پەناهیان کە دەزانێ بە تەنیا هیچی بۆناکرێ. داوا لە حیزبی دێموکرات دەکا، بۆ بلاو کردنەوەی بەرنامەی کوردی هاوکاری بکات.

دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکرات لە کۆبوونەوەی ١٩٧١/٧/١٥ بریار دەدا بەو شەرتەی بتوانێ سیاسەتی حیزبی دێموکرات بە سەربەستی بلاو بکاتەوە. بەشداری کردنی ئیرادی نیە. بەرنامەیەکیش بۆ وتارەکانی رادیۆ ئامادە دەکات. بەلام هاوکاری لە رادیۆدا دەوام ناکا. چونکە پەناهیان دەیەوێ لە سەر مەسەلەیەک دژی سەرۆک بارزانی و پارتی وتار بلاو کاتەوە. نوێنەری حیزب دژی دەوەستێ و هاو کاری تێکدەچێ.

# كۆمەڵەی رزگاری كوردستان

هاوینی ساڵی ١٩٧١ لە رێگای دۆستێكی حیزبی دیموكراتەوە، پرۆگرامی (كۆمەڵەی رزگاری كوردستان) و یادداشتی دەزگای دامەزرێنەرانی كۆمەڵەی رزگاری كە ١٩٧١/٧/٥ پێشكێش كرابوو بە قیادەی قەومی و قوتری حیزبی بەعس دەگەوێتە دەست دەفتەری سیاسی. لە رووی ئەم یادداشت و بەرنامەیە دامەزرێنەرانی ئەم كۆمەڵەیە ناسراو نین و ناوی كەس نەنووسراوە. بەڵام پاش چاو پێكەوتنی بیرەوەری یەكانی كاك سەعید كوێستانی و حكایەتی عەولای حەسەنزادە بە ناوی (نیوسەدەتێكۆشان) كەیشتووینە ئەو ئەنجامە دامەزرێنەرانی ئەم كۆمەڵە و نووسەرانی یادداشتەكە بۆ حیزبی بەعس، دەبێ كاك سەلاح الدینی موهتەدی و كاك محەممەدی ئیلخانی زادە ( مستەفا و كاوە ) بوو بن كە پاش تێكچوونیان لە گەڵ ئەحمەد توفیق و پەیدا بوونی دوو بەرەكی لە نێو پارتی دیموكراتی كوردستانی عیراق ، بەهاندان و رێنوێنی مام جەلال تاڵەبانی بۆ پێكهێنانی ئەم كۆمەڵەیە هەنگاویان نابێ و لە گەڵ حیزبی بەعسیش پێوەندی یان گرتبێ. با بزانین كاك سەعید كوێستانی لەم بارەدا دەڵێ چی :

« ..... لە سەرداوای برادەران لە كۆی سنجاق لە شاری حاجی قادری كۆیی، شارێكی هێدی و هێمن كۆ بووینەوە. جگە لە كاك سلێمانی موعینی و عەولای ئیسحاقی ئەوانیترم نە دەناسین. بەشدارانی كۆ بوونەوە بریتی بووین لە پێنج كەس. واتە كاك عەبدوللا ئیسحاقی «ئەحمەدتوفیق»، كاك سولەیمانی موعینی «فایق ئەمین» كاك سەلاحەدینی موهتەدی (مستەفا) و كاك محەممەدی ئیلخانی زادە (كاوە) و بۆ خۆم( سەعید كاوە) كۆبووبەوەكەمان دوای دوو جار دانیشتن،

واتە بەیانی وپاش نیوەرۆ کۆتایی پێهات. لەو کۆبوونەوەیەدا هێندێک بڕیاری کارو بار لە نێوان ئەو پێنج کەسە دابەش کرا. هەر چەند ئەو کۆبوونەوە لە مەڕ ئۆرگانیەوە باسی لێ نەکراو روون نەبوو بەلام بە کردەوە چ لە مەڕ دیاری کردنی نەخشی داهاتوو، چ لە مەڕ دابەشکردنی کار لە ناوچەکان، چ لە مەڕ دیاری کردنی کاری پێشمەرگایەتی، کۆبوونەوەیەکی بەرێوە بەرایەتی کاتی حیزب بوو..... سالی ۱۹٦۳ لە سەر داخوازی ئەحمەد توفیق کۆبوونەوەیەکمان لە گوندی ئالانێ پێکهێنا.... هەوالێک لە سەلاحەدینی موهتەدی و محەممەدی ئیلخانی زادە نەبوو. دیار بوو لە نێوان ئەحمەد توفیق و ئەواندا سارد و سڕی پێکهاتبوو... لە فایقم پرسی بۆ چی کاوە و مستەفا نە هاتوون؟ گوتی: لە گەل ئەحمەد نێوانیان ساردە تکایە جارێ باسی مەکە بزانین چی لێ دێتەوە.. دوای ماوەیەک بۆمان روون بۆوە، نەک هەر لە گەل یەک نە ماون، بەلکوو دژایەتی یەکتریش دەکەن. دوایی بۆم دەرکەوت ئەحمەد توفیق بۆیە باسی غەیبەتی سەلاحەدین ناکا، دەیویست بزانێ نیزیکی و دووری ئەوان لە گەل بارزانی بە کوێ دەگا. کاتێک زانی کە ناتوانێ ئەزەری بارزانی بۆ لای خۆیان راکێشن، ئەحمەد توفیق بۆی لە سیمی ئاخری دان. ئەوەی نە دەبوو لە راست کاوە و مستەفا بیکا، کردی .» ( ۱۰ )

لە وەرا دەر دەکەوێ کە «کۆمەلەی رزگاری» ناو براو دوای ئەم ناکۆکی یە بە رێنوێنی مام جەلال ساز کراوە. «.... کاتێک گەیشتینە قەلادزێ، بۆسیەینی حوسێنی مەدەنی پێشنیاری پێکردم و گوتی: مام جەلال لە قەلادزێ یە با بچینە لای چاومان پێبکەوێ و هێندێک مەسایلی خۆمانی لە گەل باس بکەین.... ئەوە بوو لە گەل مام جەلال کاتمان دانا و شەو چووینە لای. باسەکمان دامەزراند و هێندێ شتمان لە گەل باس کرد. مام جەلال پێشنیاری پێکردین لە گەلی بچینە لای مستەفا و کاوە. واتە (کاک سەلاحەدین موهتدی و کاک محەممەد ئیلخانیزادە). ئێمە پێش ئەوەی بزانین بۆ دەچین، پێمان گوت نا توانین لە گەل ئەوان پێک بێین و کار بکەین، چونکە لەو سەر و بەندە دا بوو کە مستەفا و کاوە بڕوشۆرێکیان وەک بەرنامە بە نێوی « کۆمەلەی رزگاری » دەرکردبوو بلاو ببۆوە. ئێمە بە دەستخەت

ئەو برنامە مان دەست کەوتبوو.»(١١)

عەولای حەسەن زادەش دەڵێ: «لەساڵەکانی ١٣٤١ــ١٣٤٢ جمو جۆڵێکی دیکە بە دژی خەتی اسحاقی وەرێکەوت کە بە ناوی کاوە و مستەفا( محمدایلخانی زادە صلاح الدین مهتدی) ناو بانگی دەر کرد بوو. ئەوانیش بەش بەحاڵی خۆیان هێندێ کاری سیاسی و تەشکیلاتی یان لە ناوچەی سەردەشت و بۆکان کرد کە هەر نەبێ لە باری روونکردنەوەی فکری یەوە بە سوود بوو.»(١٢)

بە ئاوڕ دانەوە لەم نووسیناتە بە گریمانی قەوی دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی رزگاری) و نووسەرانی یادداشت بۆ حیزبی بەعس دەبێ هەر ئەوان بووبن. پێوەندی درنگتری کۆمەڵەش لەگەڵ حکوومەتی بەعس هەر دەبێ لەسەر بناخەی ئەم پێشینەیە دامەزرابێ. هەر چۆنێک بێ ئێمە دەقی پرۆگرامی (کۆمەڵەی رزگاری) و یادداشتی دامەزرێنەرانی دەخەینە بەر چاو بەڵکوو بۆ مێژوو نووسانی مێژووی کوردستان وەک کەرستەی خاو کەڵکی لێ وەر بگیرێ:

## «.... یاد داشتی دەزگای دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی رزگاری کوردستان بۆ بە رێز قیادەکانی قومی و قطری حیزبی بەعسی عەرەبی اشتراکی تێکۆشەر

١٤/٤/ ٢٨٥٣ ـــ ٥/٧/١٩٧١

پاش پێشکێش کردنی جوانترین و گەرمترین سڵاوی شۆرشگێڕانەمان سەر کەوتنتان لە پێناوی ئامانجی گەورەی نەتەوەی عەرەبی برا دا بۆ وەرگرتنەوەی خاکی عەرەبی داگیر کراو لە چنگی صهیونیست و ئیستعمار و رزکارکردنی هەموو ئەرزی عەرەب ئاوات و ئارزومانە.

هاو رێیانی بە رێز، ماوەیەک لە مەو پێش بە شانازی یەوە دەعوەتی شفاهی برایانەی ئێوەمان پێگەیشت بۆ پێشکێش کردنی پرۆگرام و پێڕەوی( کۆمەڵەی رزگاری کوردستان) لە گەڵ یادداشتێکی کۆمەڵەدا بۆ ئەوەی لە نیازی کۆمەڵەمان

بکەن، ئەوا لە سەر داوخواستی خۆتان ژمارەیەک لە پرۆگرام و پێرەوی کۆمەڵەمان پێشکێش کردن لە گەڵ ئەم داخوازیانەی خوارەوە:

١- هیوادارین دوای خوێندنەوەو دراسەکردنی تەواوی پرۆگرام و پێرەوی کۆمەڵە زیاتر هەنگاو هەڵبگرن بۆ پتەوکردنی دۆستایەتی لە نێوان هەردوو لادا.

٢- مەوجودیەتی کۆمەڵە بپارێزن وەک حیزبێکی نیشتمانی نەتەوەیی، چونکە مانەوەی کۆمەڵە بە نهێنی گەورە ترین مەرجی بناغەیی و هاوکاری ئێمەیە لە گەڵ ئێوەی بە ڕێز دا. لە بەر ئەوە کە خەباتی ئێمە خەباتێکی دور و درێژو دژوارە، هەر وەک خۆتان ئەزانن هەر دەستەیەک هەست بە بزووتنەوەی کرا لە لایەن دەزگاجاسوسی یەکانی شاوە ئیتر نامێنێ و بنەبڕ دەکرێت و ماوەی ئیشکردنی نادرێت لە ناو کوردستانی ئێراندا. هەر وەک ئەو دەستە وجەماعەتە کە ئێستە بە ناو حیزبن و بە ناوەرۆک هیچ. بەڵام ئێمە بە پێچەوانە هەموو کات ویستومانە بە ناوەرۆک شت بین.

٣- کۆمەڵەی رزگاری کوردستان لە گەڵ ئەوە دا کە هێشتا جگە لە نەتەوەکەی خۆی یارمەتی دەرێکی نەبوە و سەر لێ شێواو و دەربەدەریش زۆرە بە تایبەت لە دەرەوەی کوردستانی ئێراندا. خۆی بە هیچ لایەکدا هەڵناوەسیوە.

٤- هەموو کات کۆمەڵەمان ئامادەی هاوکاری و پەیوەندی بوە لە گەڵ هەر دەستە و حیزبێکدا کە هاو کاری بکات بۆ بە دەستهێنانی گەلی کورد لە مافە نەتەوایەتیەکانیدا وەکو لە پرۆگرام دا دیاری کراوە.

٥- بە پێی بیر و باوەری ئێمە و لێکدانەوەی پڕ لە تەجروبەمان لە ظروفی ئیمڕۆدا لە کوردستانی ئێران ئیمکان و ڕێگای هیچ جورە قیامێکی چەکدارانە نیە. جوڵانەوەی چەکدارانە لە کوردستانی ئێراندا لە گەڵ شکست ڕوو بە ڕوو ئەبێت بەڵام بۆ حیزبێکی بە تاقەت و ئارام و لە سەر خۆ رێگای ڕێکخستن و تنظیمی حیزب هەیە و ئەبێ هەر لەو ڕووە کار بکرێت.

٦- کۆمەڵەمان پیرۆز بایی ئەکات لە بەیانی ١١ئاداری مێژوویی کە حیزبی بەعسی عەرەبی اشتراکی بریاری لە سەردا بە پێی مادەی ٦ی پرۆگرامی کۆمەڵە

که ئەڵێن ( کۆمەڵە پشتیوانی ئەکا لە هەر ئیمتیازێکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی کە هەر بەشێک لە بەشەکانی گەلی کورد لە ناو سنووری ئێستادا بە دەستی دەهێنێن).

٧- کۆمەڵەمان لە گەڵ هەر جیبهەتێکی سیاسیدا هاوکاری ئەکات بۆ ڕووخاندنی حکوومەتی شای خائین و دەستکردی ئیستعمار و هاوکاری صهیونیست بۆ ئەوە بگاتە مافە نەتەوەییە زەوتکراوەکان.

٨ - لە کۆتاییدا داوای ئێمە بۆ ئێوە ئەوەیە:

ئەلف - وەڵاممان بدەنەوە تا چ ڕادەیەک ئامادەی هاوکارین.

ب - هەر لەو ڕێگایەوە پێوەندیمان پێوە بکرن کە تا ئێستا کرتووتانە.

ج - هیوا دارین وتو وێژمان بەر دەوام بێت ئەگەر پێویست بوو

لە گەڵ باشترین ڕێزو ئیحترامی زۆردا. دەزگای دامەزرێنەری(کۆمەڵەی ڕزگاری کوردستان) مۆری کۆمەڵە

## پرۆگرامی کۆمەڵەی ڕزگاری کوردستان

بە ناوی خوا:

مادەی یەکەم : ناوی حیزب « کۆمەڵەی ڕزگاری کوردستان »

مادەی دووهەم : ئەم کۆمەڵە پێکهاتوە لەو کەسانەی کە لە ڕەگەزی کوردن وە یا دانیشتووی کوردستانن و باوەڕیان بە پرۆگرامی ئەو کۆمەڵە هەیە.

مادەی سێ یەم : کۆمەڵەی ڕزگاری کوردستان باوەڕی هەیە کە کورد یەک نەتەوەیە و لە نیشتمانێکی لێک نە پچڕاودا ئەژی کە کوردستانە وە ئیعتراف ناکا بەم سنوورانەی کە بێگانە دایناوە.

مادەی چوارەم : کۆمەڵە خەبات دەکا بۆ وەدەستهێنانی مافی ئازادی و سەر بەخۆیی گەلی کورد لە کوردستاندا

مادەی پێنجەم : خەباتی ئێمە خەباتێکی(نەتەوەیی گشتی و قەومی و

جەماهیری یە ) شۆرشگێڕانەیە لە سەر بناغەی کوردایەتی و بە ڕێگای دیموکراتیدا دەڕوا.

مادەی شەشەم : کۆمەڵە بە هەموو توانایەکەوە تێدەکۆشێ بۆ کۆ کردنەوە و ڕێکخستنی هەموو چینەکانی گەلی کورد لە ناو ڕێکخراوەیەکی سیاسی و (ناسیونالیستی) بۆ پێشڕەوی ئەو خەباتەی کە مادە پێنج ڕایدەگەیێنێ.

مادەی حەوتەم : کۆمەڵە پشتیوانی دەکا لە هەر ئیمتیازێکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی لە هەر بەشێک لە بەشەکانی گەلی کورد لە ناو سنووری ئێستادا بە دەستی دێنێ وە دەعوەتی ئەو حکوومەتانە دەکا کە دەسەڵاتیان هەیە بەسەر کوردستان بۆ ئەوەی بە ڕێگایەکی هێمنی و ئاشتیخوازانە ددان بێنێ بەو مافانەدا.

مادەی هەشتەم : ئەم کۆمەڵە لە ظروف و شەرایتی ئەمڕۆی میللەتی کورددا بە گوێرەی ناوچەکان و دەستووری پرۆگرام بۆ ئەو مەبەستانە تێدە کۆشێت:

١- زیندوو کردنەوەی زمانی کوردی کە زمانی نەتەوەی گەلی کوردە لە کوردستاندا.

٢- دامەزراندن و فێرگەی قوتابخانەی کوردی

٣- پەرە پێدانی ئەدەب و زانیاری نەتەوایەتی لە ڕێگای دەرکردن و بڵا و کردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و هەموو شوێنەوارێکی نووسەرانی کۆن و نوێی گەلی کورد.

٤- ڕێز گرتن و ڕەواج پێدانی تەقالیدی نەتەوایەتی و پاراستنی سوننەتی میللی لە جل و بەرگی کوردی یەوە هەتا جێژن و بیرەوەری یە نەتەوییەکان.

٥- بەشدار کردنی جوتیار لە ناو و زەوی پێویست و پاراستنیان لە هەر چەشنە زوڵم و زۆرێک لە گەڵ تۆڵەی عادیلانە بۆ خاوەن زەویەکانی پێشوو.

٦- بەشدار کردنی کرێکاران لە مافی قانونی و عادیلانەی کار لە گەڵ مافی پێکەوە نانی سەندیکا (نقابە)و مافی شەریکبوون لە مەجلیسی بەڕێوە بەریی کاردا.

٧- بەر بەستکردنی زوڵم و زۆر لە ناو هەموو چینەکانی گەلی کورددا و

بەشدارکردنی هەر فەردێک لە مافە ئینسانیەکانی

٨- لابردنی ئەو دوو بەرەکی و براکوژی یە کە داکیر کەرانی کوردستان خستوویانەتە بەینی عەشیرەتەکان و هەموو چینەکانی گەلی کوردەوە بۆ بەربەرەکانی کردنی بیر و رای نەتەوایەتی و دامەزراندنی بناغەی بە هێزی برایەتی لە ناو هەموو ئەفرادی میللەتی کورد دا.

٩- تێکۆشان بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بە هۆی کارگە و کێشانی رێگا و پەرە پێدانی پیشەسازی و زیاد کردنی داهاتی نەتەوایەتی(عوائدی میلی)

مادەی نۆهەم - کۆمەڵە بۆ ژیانی ئابوری گەلی کورد و دامەزراندنی بناغەیەکی ئیقتیصادی بە هێز و پێشکەوتوانە بۆ کوردستان کەلک وەردەگری لە تەجاروبی عیلمی و عەمەلی میللەتانی تازە پێگەیشتوو لەم بارەوە بە هەڵسەنگاندنیان لە گەڵ ظروف و واقعیەتی کوردستاندا.

مادەی دەهەم - کۆمەڵەی رزگاری کوردستان ددان ئەنێ بە مەوجودیەتی هەموو کەمایەتیە نەتەوایەتیەکان کە لە کوردستاندا ئەژین بە مەرجێک باوەڕیان بە زگاری کوردستان هەبێ و بۆ ئەم مەبەستە خەبات بکەن.

مادەی یازدەهەم - کۆمەڵە ددان ئەنێ بە مافی وەک یەکی ژن و پیاودا.

مادەی دوازدەهەم - کۆمەڵەی رزکاری کوردستان ئامادەی برایەتی و هاوکاری یە لە گەڵ ئەو رێکخراوە کوردیانەدا کە هەڵگری بیر و باوەڕی کوردایەتین

مادەی سێزدەهەم - کۆمەڵە سیاسەتی دەرەوەی بێلایەنی و دۆستی ئەو هێزانەیە کە یارمەتی مەسەلەی کورد بدەن. هەر وەها باوەڕێکی پتەویشی هەیە بە مەنشوری نەتەوە یەککرتوەکان و ئیعلامیەی جیهانی حقوقی بەشەر و میثاقی کۆنگرەی باندۆنگ و ئامادەی پشتیوانیی خەباتی گەلانی جیهانە بۆرزگاری و ئازادی یان بە پێی توانا و چاوەڕوانی دۆستایەتی و یارمەتی یە بۆ رزگاری و ئازادی گەلی کورد لە لایەن هەموو گەلانی جیهانەوە.

مادەی چاردەهەم - کۆمەڵەی رزگاری کوردستان باوەڕی هەیە کە کورد لقێکی سەر بەخۆیە لە رەگەزی ئاری و ئامادەی کرتنی پێوەندی دۆستایەتی و برایەتی یە

له کەل لقەکانی تر.

مادەی پازدەهەم - کومەڵە ئایینی پاکی ئیسلام بە مەزهەبی رەسمی کوردستان ئەناسێ و رێز و ئیحترامی هەموو ئایینەکانی تر ئەکرێت کە دانیشتوانی کوردستان باوەریان پێی هەیە.» - دەزگای دامەزرێنەری کۆمەڵەی رەزگاری کوردستان.

هیچ جمو جۆڵێکی کردەوەیی دەزگای دامەزرێنەری(کۆمەڵەی رزگاری کوردستان) لە ساڵەکانی ١٩٧١ و١٩٧٢ بەر چاو نا کەوێ. بەڵام ناکرێ ئەم بۆ چوونەش رەت کەینەوە ( کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان) کەبوو بە«حیزبی کۆموونیستی ئێران » و تا ئیستاش هەر بەم ناوە تێکۆشانی بەر دەوامە. هەرئەو کۆمەڵەیەی رزگاری کوردستان نەبێ ئەم گۆڕانکاریانەی لە خۆدا پێک نە هێنابێ.

## کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان

رۆژی ١٩٧٣/٩/٢٢کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا بە بەشداری ٤٩ کەس دەست بە کار دەکا. کۆنگرەی سێ یەم نە چاو کۆنفرانسی سێ یەم لە پلەیەکی بەرزتردا دە بەسترێ. لە ئێرانەوە ئەندامی حیزبی بەشداری دەکەن و لە لایەن تەشکیلاتی حیزبیشەوە لە ئوروپا دوو کەس بەشدار دەبن.

کۆنگرەی سێ یەم توشی هەمان ناکۆکی دیاری کردنی ناوی کۆنگرە دەبێ کە داخوا کۆنگرەی سێ یەمە یا دووەم. دوکتور قاسملو دیسان لە سەر ئەوە پێی دادەگرێ کە ئەوە کۆنگرەی دووەمە. بەڵام زۆربەی دەنگ بە کۆنگرەی سێ یەم دەناسرێ و قاسملو ناچار مل رادەکێشێ. راپۆرتی کومیتەی ناوەندی و بریار و پەیامەکان پەسند دەکرێن و کومیتەی ناوەندی تازە هەڵدەبژێردرێ.

دوای کۆنگرەی سێ یەم کە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی هێشتا بڵاوەیان نە کرد بوو. پێویست بوو لە مەسەلەیەکی گرنگ بکۆڵنەوە کە هەست دەکرا دێتە پێش

و دەبوایە لە سەری ساخ بنەوە هەست بەوە دەکرا کە وەزعی عیراق بەرەو ئالوزی دەچێ و حکوومەتی بەعس لە وانە نی یە نێوەرۆکی ڕێک کەوتنامەی ١١ی ئادار جێبەجێ بکات و دوور نی یە شەڕ هەلگیرسێتەوە. ئەو دەم حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەبێ چبکات؟ پاش لێکدانەوە و لێکۆلینەوەی تەواو. کومیتەی ناوەندی ئەم بریارەی خوارەوە بە زۆربەی دەنگ پەسندکرد:

«... ئەگەر لە کوردستانی عیراق شەڕ هەلگیرسێتەوە کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستان عیراق بە جێ بێلێ و بچێتەوە ئێران و خەباتی خۆی لە کوردستانی ئێران درێژە پێبدات. کومیتەی ناوەندی هەر لە ئێستاوە پێویستە هەنگاو بۆ ئامادە بوون باوێژێ.»

حیزبی دێموکراتی کوردستان هەر چەند ناوەندەکەی لەبەغد ابوە. بەلام لە ئاست روو داوەکانی کە پێوەندیان بە کوردستانەوە هەبوە، بە کوێرەی بۆ چوونی خۆی و بەرژەوەندی کورد بێدەنگ دانەنیشتوە. لەو دەمەدا کە لە نێوان پارتی و کۆموونیستەکان سارد و سری پەیدا دەبێ و سەر دەکێشێتە ناخۆشی، کومیتەی ناوەندی بریاردە دا، دوکتور قاسملو بچێتە کن سەرۆک بارزانی نیگەرانی حیزبی دێموکرات سەبارەت بە کێشەی نێوان حیزبی کۆموونیست و بزووتنەوەی کوردی پێ رابگەیێنێ. هەر وەها لە بارەی پێوەندی نێوان ئێران و عیراق و ئێران و پارتی دێموکراتی کوردستان لە گەل سەرۆک بارزانی بدوێ.

رۆژی ٧٤/٢/٢٢ لە سەر پێشنیاری دوکتور قاسملوو کومیتەی ناوەندی کۆ دەبێتەوە کە جارێکی دیکەش لەو مەسەلەیە بکۆلێتەوە کە ئەگەر پارتی و حکوومەتی عیراق بە یەکجاری تێک بچن، حیزبی دێموکرات دەبێ هەلوێستی چ بێت و چبکات، هەر چەند پێشتر وەک باسکرا ئەو مەسەلەیە بریاری لە سەر درا بوو، بەلام لەبەر ئەوەی دوکتور قاسملو خەیالی خۆ دزینەوە و چوونەوەی ئورووپای دەبێ، پێشنیار دەکا جارێکی دیکەش ئەو مەسەلەیە باسی بکرێ. لە ئەنجامدا بە زۆربەی دەنگ کومیتەی ناوەندی بریاری پێشوو هەلدەوەشێنێتەوە وئەم بریاردی خوارەوە لە جێگای بریاری پێشوو پەسند دەکات:

کومیتەی ناوەندی بڕیاری دا :

١- بڕیاری کومیتەی ناوەندی کە بریتی بوو لەوە ئەگەر لە کوردستانی عیراق شەڕ دەستی پێکردەوە بەڕێوەبەری و رێکخراوی حیزب لە عیراق بە چەکداری بچێتەوە کوردستانی ئێران و خەباتی چەکدار دەست پێبکا. هەڵوەشێتەوە و پێڕەوی لە تیئوری ڕاپەڕینی چەکداری ئیجباری نەکا کە نەتیجەی وە مەترسی خستنی هەموو حیزبە.

٢- درێژە پێدان بە تێکۆشانی حیزبی لە هەموو هەل و مەرجێکدا بە تاقە ڕێگای ئوسولی دادەنێ و بە پێویستی دەزانێ بۆ ئەم مەبەستە تێکۆشانی خۆی درێژە پێبدات.»

ئەم بڕیارە کەریمی حسامی و هێمنی شاعیر و ڕەسولی پێشنماز دەنگی بۆ نادەن و ئەوان لە سەر بە جێگەیاندنی بڕیاری پێشوو واتە گەڕانەوە بۆ کوردستانی ئێرانە هەڵوێست دەگرن. ( بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتر بڕوانە بەرگی پێنجی بیرەوەریەکانی نووسەر.)

ڕۆژی١٩٧٤/٣/٩ خودێ لێخۆشبی ئیدریس بارزانی بۆ وتوێژ لە گەڵ حکوومەتی عیراق دێتە بەغدا. دوکتور قاسملوو لە گەڵ سامی عبدالرحمان دەچێتە لای ئیدریس و دوای گەڕانەوەی کاک ئیدریس بۆ سەرێ، دوکتور قاسملوو بە جارێک لە ئاشتی و پێکهاتن ناهومێد دەبێ. لە سەر پێشنیاری دوکتورقاسملو ڕۆژی ٧٤/٣/١٠ دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکرات لە کۆبوونەوەی خۆیدا دێتە سەر ئەم بیرو ڕایە کە ئەگەر لە کوردستان شەڕ دەست پێبکاتەوە و کومیتەی ناوەندی نەتوانێ ئەم وەزعە بپارێزێ و مانەوەی لە بەغدا دەرەتانی نەبێ، بڵاوەی بکات. شوێن و جێگای مانەوە و تێکۆشانی ئەندامانی کومیتەی ناوەندیش دیاری دەکات کە لە وەختی خۆیدا لێی بمێننەوە. هەر لەو کاتەشدا بڕیار دەدا کە دوو کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بنێرێتە کوردستان. ناوچەی ژێردەسەڵاتی پێشمەرگە و نامەیەکیش لەم بارەوە بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەنووسێ.

پێوەندی نێوان بزووتنەوەی کوردستان و حکوومەتی بەعس تادەهات بەرەو ئاڵۆزی دەچوو. کومیتەی ناوەندی هاتە سەر ئەوباوەرە کە بێدەنگی بشکێنێ و ئەم بەیاننامەی خوارەوەی بڵاو کردەوە:

## بەیاننامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە سەر رووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستانی عیراق

«...چوارساڵ پاش دەر چوونی بەیاننامە مێژووییەکەی یازدەی مارسی ۱۹۷۰بە داخەوە وتوویژ لە سەر چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی ئەو بەیاننامە سەر نەکەوت و جارێکی تر شەری برا کوژی لە کوردستانی عیراق هەڵگیرسایەوە. بێگومان بەر دەوامبوونی شەڕ لە دوا رۆژدا خەڵکی عیراق بە کشتی و گەلی کورد لە کوردستانی عیراق بە تایبەتی توشی زیان و کوێرەوەریەکی زیاتر دەکاو دەبێتە هۆی وێرانی کوردستان و شپرزەیی وەزعی ئابوری و سیاسی لە عیراقدا.

تاقیکردنەوەی مێژوویی لە عیراق بە تایبەتی دوای شۆرشی ١٤ی ژوئیەی ۱۹۵۸نیشانی داوە کە گیرو گرفتی کورد لە رێگای شەرەوە چارە سەر ناکرێ و دەبێ لە رێگای ئاشتی و وتوێژەوە حەل بکرێ.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ساڵی ۱۹۷۰ پێخۆشبوونی خۆی بەرانبەر بە رێککەوتنەکەی ۱۱ی مارس دەر بری و لە مانگی مارسی ۱۹۷٤یشدا بە هەموو هێزی پەوە لایەنگری رێککەوتنی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست و پارتی دێموکراتی کوردستان بوو و ئەوەندەی لە توانای دا بوو، بۆ ئەو رێککەوتنە هەولی دا. سیاسەتی حیزبی ئێمە دۆستایەتی لە گەڵ هەموو هێزە نیشتمانیەکانی عیراق بووە و ئێستاش بەرابەر بەو ئەسلە هەر وەفادارە. دیارە وەزعی ئێستای کوردستانی عیراق ناتوانێ سەرنجی حیزبی ئێمە بۆ لای خۆی رانەکێشێ. حیزبی ئێمە دژی شەڕ لە کوردستانی عیراقە و زۆر نیگەرانی ئەوەیە کە دوژمنانی گەلی

کورد، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی، بە تایبەتی ڕیژیمی دژی گەلی حەمەرەزا شا لەم وەزعە دژی ئامانجە مێژوویییەکانی خەڵکی عیراق و دژی هەموو هێزە پێشکەوتوەکانی ئەم ناوچەیە کەلک وەر بگرن. حیزبی ئێمە لەو بڕوایە دایە کە مەسەلەی کورد لە عیراق لە ڕێگای شەڕەوە چارە سەر ناکرێ و ڕێگای حەللی سیاسی هەیە.

ڕێککەوتنی ستراتیژیکی دژی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی نێوە ڕاستدا. پشتیوانی گەلی عەرەب لە ئامانجە ڕەواکانی گەلی کورد هەر وەها پشتیوانی گەلی کورد لە جولانەوەی دژی ئیمپریالیستی گەلی عەرەب ڕێگای ڕاستی چارە سەرکردنی ئەو گیرو گرفتانەیە کە ئێستا بوون بە هۆی پەشێوی وەزعی نێو خۆی عیراق. ئەگەر هەموو گیرو گرفتەکان لە ڕوانگەی ڕێک کەوتنی درێژ خایەن لە نێوان ئەو دوو جولانەوەیەدا سەیر بکرێ، ئەو دەم ڕێگا بۆ چارە سەرکردنی گیرو گرفتەکان بە هاسانی پەیدا دەکرێ.

حیزبی ئێمە لەو بڕوایە دایە کە دەست پێکردنەوەی وتو وێژ ڕێگایەکە کە لە گەل ئامانجە نیشتمانیەکانی خەڵکی عیراق بەگشتی و گەلی کورد بە تایبەتی باشتر ڕێک دەکەوێ و دەبێتە سەددی سەر ڕێگای نەخشەکانی دژی ئینسانی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی و بە تایبەتی ڕیژیمی دژی گەلی شا لە ڕۆژ هەلاتی نێوە ڕاستدا. ئێمە هیوا دارین تەواوی هێزە نیشتمانیەکانی عیراق کە دلسۆزی قازانجی گشتی گەلانی ئەو ولاتەن، بۆ چارە سەر کردنی سیاسیانەی وەزعی ئالۆزی ئێستای عیراق برایانە تێبکۆشن و نابێ ئەو ڕاستی یە لە بیر بەرنەوە

کە بەرامبەر بە خەڵکی عیراق بە کورد و عەرەب و کەمایەتیەکانیەوە، بەلکە زیاتر لە وەش. بەرامبەر بە گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان و جولانەوەی ڕزگاریخوازی لە ڕۆژ هەلاتی نێوە ڕاست بە گشتی مەسئولیەتێکی مێژوویی یان هەیە. ئێمە هیوادارین هەتا زووترە هەموو ئەو هێزە نیشتمانیانە بۆ چارە سەر کردنی ئەو گیرو گرفتنە دەست بە کار بن و ڕێگا لە هێزە ئیمپریالیستیەکان و کۆنە پەرستی ناوچە بە گشتی و ڕیژیمی کۆنە پەرستی ئێران

به تایبەتی ببرنەوە کە دەیانەوێ لە ئالۆزی باری ئێستای عیراق بە قازانجی ئامانجە دژی گەلی یەکانیان زیاتر کەلک وەر بکرن. بە بڕوای ئێمە ئەوە ئەرکی هەموو هێزە نیشتمانیەگانی عیراق هەموو هێزەکانی دژی ئیمپریالیستی رۆژ هەلاتی نێوە راست و هەموو هێزە پێشکەوتوەکانی جیهانە.

کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.»(١٥)

به دوای ئەم هەنگاوە دا بە کوێرەی بڕیاری پێشوو لە رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات تەنیا پێنج کەس( دوکتور قاسملو، کەریمی حسامی، دوکتور سولتانی وەتەمیشی، ماموستا هێمن و حەمەدەمینی سراجی) لە بەغدا دەمێننەوە.

رۆژی ٩٧٤/٥/٨ دەفتەری سیاسی دوای لێکۆلینەوە و شیکردنەوەی بارو دۆخی کوردستان و وەزعی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەم بڕیارەی خوارەوە پەسند دەکات :

«... سەرە رای نا کۆکی بیرو رای شەخسی لە سەر مەسەلەی کوردستانی عیراق، دەبێ بێلایەنی خومان بپارێزین و دژی حکوومەتی عیراق و پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق هیچ نە نووسین و تەبلیغاتی خومان دژی دەولەتی ئێران سارد نە کەینەوە.»

لەم بەینەدا ئیتر ئاگری شەر لە کوردستانی عیراق بلێسە دەگرێ ، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئیتر نا توانێ بێدەنگ بێ و بیرو رای خۆی لە سەر هەلگیرسانەوەی شەڕ دەر نەبڕێ. دەرەتانی ئەوەش نابێ کە کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی پێکبێنێ. دەفتەری سیاسی حیزبی دیموکرات ئەم بڕیارەی خوارەوە پەسند دەکات بەو شەرتەی کە تەنیا رێنوێنی بێ بۆ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و بە یانەوە بلاو نەکرێتەوە. ئەمەش دەقی بڕیارەکەیە :

«... ئەلف – بوروی سیاسی شەری براکوژی کە لە گەرمێندا دەستی پێکردوە بە رێگای چارە سەری دروستی مەسەلەی کورد لەم ولاتە دا نازانێ و لەو بڕوایە دایە کە مەسەلەی کورد دەبێ لە رێگای ئاشتی و بە شێوەی دیموکراتی چارە سەر

بکرێ و ڕێگای حەللی سیاسی بۆ بدۆزرێتەوە. بۆ ئەم کارە خەبات بۆ گەڕانەوەی سەر وتو ویژ لە گەڵ نوێنەرانی ڕاستەقینەی جولانەوەی گەلی کورد لە گەرمێن بە ئەرکی هەموو هێزەنیشتمانیپەروەرەکانی گەرمێن و هەموو هێزە پێشکەوتوەکانی جیهان دەزانێ.

ب - حیزبی ئێمە بە پێی بەرنامەی خۆی دژی ڕێژیمی کۆنە پەرستی شا بۆ هێنانە سەر کاری ڕێژیمێکی دێموکراتی لە ئێران و خود موختاری بۆ کوردستان خەبات دەکا و ڕێژیمی شا بە دوژمنی ئەسلی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دادەنێ.

بڕیار درا دەقی ئەو بڕیارە بۆ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە کوردستان و لە ئوروپا بنێردرێ. »

لە سەر ئەم بڕیارە کاک ئەمیری قازی ئەندامی کومیتەی ناوەندی کە لە سوید دەژیا لە نامەی ۱۹/۵/۹۷٤ داکە بۆ نووسەری ئەم دێڕانەی ناردبوو دەنووسێ :«..... دەمویست لێم ڕوون بێ و بزانم و حالیم بکەی کە ئەم ڕەنییە بەرامبەر بەو مەسەلەیە کە بۆرژوی سیاسی حیزب کۆبوونەوەی بۆ دەکا و لە سەری ساخ دەبێتەوە بۆیەیە کە هەر بۆ خۆی و کومیتەی ناوەندی بیزانێ یا جەماتی تر و ئەفرادی خۆی و کەوادریش دەبێ بیزانن و دیفاعی لێ بکەن؟ بە گوێرەی بڕیاری تازەی سیاسی حیزب ئەوەڵەن دیفاعی گەلی کورد لە نیشتمانی خۆی دیفاعێکی عادیلانەیەو داوای حوکمی زاتی یەکی تەواو کە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عیراق بگرێتەوە، داخوازێکی ڕەوایە...» لە گەڵ بێلایەنی حیزب لەو مەسەلەیەدا دەگونجێ و زید و نەقیز نیە؟ لێم ببورە، نامەوێ هیچ عەرز بکەم، بەڵام من تێ نەگەیشتم و بەراستی ئیستاش نازانم چونە. لەو سیاسەتە سەرم دەرناچێ. جا ئەگەر کەمێک بۆم ڕوون کەیەوە زۆرم پێ خۆش دەبێ و سوپاست دەکەم...»

لە وەلامی نامەی کاک ئەمیری قازی دا، کەریمی حسامی ئەم نامەیەی بۆ دەنووسێ کەوا لەژێرەوە بڵاو دەکرێتەوەو ئەمەش هەڵوێست وبیروڕای ئەو بووە لەکاتی کێشەی نێوان پارتی وبەعس لە ساڵی ۱۹۷٤ دا.

« ....پاش سلاو و چاک و خۆشی ... له سەر وەزعی خۆمان و بریاری بۆرزی سیاسی : کومیتەی ناوەندی بەر لە وەی شەڕ ساز بێتەوە، لە کۆبوونەوەکانی خۆیدا پاش باسێکی زۆر بڕیاری بێلایەنی دا. دەگەڵ قیادەی شۆرش و بەعس ئەو بێ لایەنی یە باسکرا. هەر دوک لا موافەقەتیان کرد کە ئێمە بێلایەن بین. کاتێکی کاک ئیدریس هاتبوە بەغدا دوو بارە لە کەڵ ئەو قسەکراوە. دەکەڵ بێلایەنی موافیق بوو. بەڵام موافیقی ئەوە نەبوو کە ئێمە هەموومان بچینەوە کوردستان. بە نەزەری من هەر چاوە دێری ئەو تعهداتەیە کە لە بەرانبەر ئێراندا هەیانە. لە بیرم چوو، بۆ گەڕانەوەی ئێرانیش دەپێشدا لە گەڵ شەخسی مەلا مستەفا قسە کرا بوو. بە توندی موخالیف بوو. ئەوەش هەر لە بەر تعهدات بوو. یەکێک لە دەلیلی برادەرانی کە بایان دابوو هەر ئەوە بوو.... لە سەر وەزعی شەڕ و کاراکتەرو چۆنیەتی شەڕەکە و تەسریحاتەکانی بارزانی و کۆمەکی بە ئاشکرای ئێران و قبولکردنی خود موختاری بە کەم و کورتیەوە یا پێ چەقاندن و شەڕسازکردنەوە، لە ناو ئێمەدا ئیختیلاف هەبوو. برادەری واهەبوو کە لای وا بوو ئێران و ئەمریکا مەسەلەی کوردیان کردۆتە بیانوو بۆ روخاندنی حکوومەتی عیراق و بە ئاشکرا کوردەکانیان هانداوە بۆ ساز کردنەوەی شەڕ. کە من یەکێک لە لایەنگرانی توندی ئەم بیر و باوەڕەم. لام وایە دەکرا بارزانی خود موختاری بە هەموو کەم و کوریەوە قبوڵ بکا. بناخەی قایمی خود موختاری و دەسەڵات لە کوردستان دابمەزرێنێ. بە تدریجی هەر چەندەی وەزعی عیراق بەرە و سەقامگرتوویی و دیموکراسی چوو بایە و بروایان پتر بە یەکتر کرد بایە. مەسەلەی کەرکوکیش بەرە و چارە سەرکردن دە چوو. لام وایە دە سالی دیکەش شە ڕبکەن بە شەڕ ناتوانن کەرکوک بگرن و حوکماتی تێدا بکەن. ممکینە شەڕ ببێتە هۆی روخانی بەعس. بە لای منەوە روخانی بەعس نەک هەر نابێتە هۆی ئەوە کە خود موختاری تەواو بۆ کورد دابین بکا، بەلکوو دەبێتە هۆی لە بەینچوونی یەکجاری مەسەلەی کورد. چونکە عبدالغنی راوی و ئەمسالی ئەو دێنە سەر کار. ئەو دەم ئێران و ئەمریکا ئەوان بە کورد ناگۆڕنەوە. بە لای منەوە ئێران عاشقی چاوی رەشی کوردەکانی ئەو دیوی

سنوور نیه. ئێران بەو گۆمەڵە و بەو دیفاعه و بەو تەبلیغاتە دەبێتە هۆی فەوتانی جولانەوەی کورد و لە پشتیوانی هێزە پێشکەوتووەکانی دنیای بێبەش دەکا. بەلای منەوە ئێران نەیدەویست کورد خود موختاری هەبێ. سەقام گرتوو بێ، کوردستان ببووژێتەوە و ببێتە بنکەیەکی قایمی جولانەوەی رزگاریخوازی کورد. جا بۆیە کوردەکانی بۆ شەڕ هاندا. ئێستاش دەزگای تەبلیغاتی ئێران خەبەری شەڕ بڵاو دەکاتەوە: کۆمەک دەکا، بەلام هەر چونکە لە گەڵ بەعسی بەغدایە شەڕ دەکەن. تورکیا کە کوردەکان بە تورکی شاخی دادەنێ. ئێستە بەردی کورد خۆشەویستی لە سنگی دەدا. بە لای منەوە بەعس زۆری غەڵەت کرد، سیاسەتێکی شۆڤینیستی بە کار هێنا، لە هەڵوێستی غەرەیی و لوت بەرزیەوە قسەی کرد. هەر چی بفەرمووی خەراپ و چەوت بوو. بەلام لام وایە دەبوایە ئەوە لە بەر چاو بگرێ کە لە گەڵ حیزبێکی بورژوازی عەرەب تەرەفە کە بۆ هەوەڵین جار مەجبور بوە ئیعتراف بە حقوقی کورد بکاو زۆر هەنگاوی لە باریش هەڵبرێ. ئەو ئیعتراف و خود موختاری یە ناقیصە رێگای بۆ چارەی رادیکاڵ تری مەسەلەی کورد خۆش دەکرد. بەلام بە داخەوە دوو کەللە رەق کەوتوونە بەرانبەری یەک و نەتیجەشی لە بەین چوونی کوردستان و خەڵکی بێتاوان و شایی و کەیف خۆشی ئێران و ئیمپریالیزمە.»

..... بەلام لە بارەی ئەوەی دە فەرمووی چ جواب بدەمەوە، لام وایە دەبێ شقی هەوەڵیان بێ: کە ئەوە مەسەلەیەکی ناو خۆی عێراقە و ئێمە حیزبێکی ئێرانین. لام وایە لەو بارەوە دوکتور بۆی نووسیبوی. چونکە سەرەرای ئەوەی مەسەلەیەکی دژوارە، بەلام چاوە دێری کردنی بریاری کومیتەی ناوەندی و بۆرۆی سیاسی بۆ ئێمە پێویست ترە. منیش وەک تۆ ئێستا توشی ئەو پرسیارانە بووم. بەلام گوتومە ئێمە حیزبی ئێرانین و کارمان لە کوردستانی ئێرانە. هەر وەک پارتی باسی جنایەتی شا و کوشتاری ئێرانی نە کردوە. مومکینە کومیتەی ناوەندی بریارێکی تازەبدا، ئەو دەم دیسان رعایەتی دەکەین.» (١٣)

لەم ئالۆزی یەی نێو خۆی عیراق و بار و دۆخی نا لە باری حیزبی دیموکرات

مەعلوم نیە كێ لە ڕێبەرانی پارتی دیموكراتی كوردستان بە دوكتور قاسملو دەڵێ:« لەم بار و دۆخەدا تۆ لە بەغدا نەبی باشە» لە سەر ئەو ڕاسپاردەیە دوكتور قاسملو بێ ئەوەی مەسەلەی سەفەر لە كومیتەی ناوەندی و یا دەفتەری سیاسی بێنێتە گۆڕێ ودەنگی ئەوان وەربگرێ. بەحەمەدەمینی سراجی دەڵێ: « بۆ چاوپێكەوتنی هێزە سیاسی یەكانی ئێران پێویستە سەفەرێكی ئوروپا بكەم.» دیارە بۆ ئەوەی حەمەدەمین دژی نەوەستێ. دەڵێ: تۆش لە گەڵم بێی باشە. لە سەرەتای مانگی جۆزەردانی ٩٧٤ بەرە و بێروت سواری فرۆكە دەبن. ڕۆژی ٧٤/٦/٣ دوكتور قاسملو لە بێروتەوە تەلەفون بۆ كەریمی حسامی دەكاو (كە بە ئیجازە چوبوە بولغارستان.) دەڵێ تا چاوی بە قاسملو و حەمەدەمینی سراجی نەكەوێ نەچێتەوە بۆ عیراق. هەر وەها بە ڕێبەرانی حیزبی تودەش ڕابگەیەنێ كە بلیتی فرۆكەی بۆ پراگ بۆ بنێرن بچێتە چێكوسلۆڤاكیا و چاوی پێ یان بكەوێ.

ڕۆژی ٧٤/٧/١٢ نامەیەكی دوكتورقاسملوم بۆهات نووسیبووی:«.... پاش سەفەری تۆ هێندێ شتی تازە ڕوویدا و ئێمەی هێنا سەر ئەوە كە جارێ بەغدا بە جێ بێلین، یەك دوو جار بە كاك حەمەدەمین یان كوتبوو: كەنگێ مەوقیفی خۆتان ڕوون دەكەنەوە. داواشیان كرد بوو كە مانگ بە مانگ گوزارشی كاری خۆتانمان بدەنێ.»( حەمەدەمینی سراجی ئەم سەفەرە جۆرێكی تر باس دەكا)

بە ناچاری من لە سۆفیا مامەوە و چاوە ڕوانی هاتنی دوكتور قاسملو و حەمەدەمینی سراجی بووم. ڕۆژی ٧٤/٧/١٨ دوكتور قاسملو لە بێرلینەوە تەلەفونی كرد و گوتی:«.. چاوم بە كەیانوری كەوتوە. بڕیارمانداوە ڕۆژی ٧/٣٠ تۆو كاك حەسەنی قزلجی بێنە ئەڵمان و لە گەڵ ڕێبەرایەتی حیزبی تودە كۆبوونەوەیەكمان دەبێ. پێویستە ئەم ڕاستیەش بگوترێ كە كاك حەسەنی قزلجی هەر چەند لە دەربەدەریدا لە ڕادیۆی پەیكی ئێران كاری دەكرد. هەر خۆی بە ئەندامی حیزبی دیموكرات دەزانی و لە هەموو كۆبوونەوەیەكدا كە پێوەندی بە حیزبی دیموكراتەوە بوو بێ بەشداری كردوە. كاك حەسەن تەنیا پاش شۆڕشی ئێران كە حیزبی دیموكرات ئامێزی بۆ نە كردەوە. حیزبی تودە هێنایەوە ئێران و

کردیە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و لە تاران هێشتیەوە تا گیراو شەهید کرا.

رۆژی ۱۹۷٤/۷/۳۰ حەسەنی قزلجی و کەریمی حسامی دەچنە ئەلمان و دوکتور قاسملو و حەمەدەمینی سراجی دەبیننەوە و دەچنە لایپزیک و میوانی حیزبی تودەدەبن. رۆژی دوایی لە گەڵ نوێنەرانی حیزبی تودە( ئیرەجی ئەسکەندەری و کەیانوری و عەلی کەلاویژ) کۆ دەبنەوە. بەلام هەر لە سەرەتاوە لە سەر ناو لێنانی کۆ بوونەوە ناکۆکی پەیدا دەبێ و ناگەنە هیچ ئاکامێک و لێک جیا دەبنەوە.

دوای سەر نەگرتنی کۆ بوونەوە دوکتور قاسملوو دەچێتە فەرانسەو حەمەدەمینی سراجی دەچێتە ئینگلستان. حەسەنی قزلجی و کەریمی حسامیش دەگەرێنەوە بۆ بۆلغاریا.

رۆژی ۱۹۷٤/۸/۲۸دوکتور قاسملو و حەمەدەمینی سراجی دەچنە سۆفیا و سێ ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکرات لێک کۆ دەبنەوە و لە رووداوەکان دە کۆڵنەوە. پاش باسێکی زۆر دوکتور قاسملو دەڵێ: «... ماوەیەکە لە ماڵ و منداڵم دوورم و خێزانم بە تەنییە و لە بەرانبەر ئەودا خۆم بە خەتا بار دەزانم، دەمەوێ ماوەیەک لە دەرەوە بمێنمەوە بەڵکوو بتوانم لە زانستگای پراک دەرس بڵێمەوە و هیچ یارمەتیەکیش لە حیزب وەرناگرم.»

حەمەدەمینی سراجی و کەریمی حسامی دژی ئەم هەڵوێستە دەوستن، پێی دەڵێن نە لە بەغداو نە لە کومیتەی ناوەندی و نە لەئوروپا لە گەڵ دوو ئەندامەکەی تری کومیتەی ناوەندی ئەو مەسەلەیەت باس نەکردوە. شێرزەیی بارودۆخی ئەندامانی حیزب لە عیراق و مانەوەی تۆ لە دەرەوە دەبێتە هۆی دڕدۆنگی حکوومەتی بەعس و ئاکامی باش نابێ. لانی کەم ئەمجارە وەرەوە بەغدا و لە گەڵ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی ئەم پێشنیارە باسبکە.

دوکتور قاسملوو بە هێنانەوەی هەزار شێر و رێوی لە سەر مانەوەی خۆی لە ئوروپا پێدا دەگرێ و دەڵێ :... نامە بۆ کومیتەی ناوەندی دە نووسم و پێشنیار دەکەم کەریمی حسامی بە جێگری سکرتێر دیاری بکرێ و هیواشم ئەوەیە کە ئەم پێشنیارەم لە کومیتەی ناوەندیدا پەسند بکرێ.» دوکتور قاسملوو بۆکەرانەوە بۆ

نیو ئەندامانی حیزب لە عیراق مل نا داو لە ئوروپا دەمیننیتەوە. حەمەدەمینی سراجی و کەریمی حسامی بۆ عیراق دەگەرینەوە.

بێلایەنی حیزبی دیموکرات سەبارەت بە کێشەی کوردستانی عیراق، حکوومەتی بەعس تورە دەکا و دەیەوێ لە ڕێگای فشار و پالپەستە بیخاتە سەر ڕێبازی دوژمنایەتی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق ( ئەوەی ئێستا لە لە کوردستانی عیراق بۆ رازیکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران دژ بە کوردەکانی کوردستانی ئێران دەکرێ) بە تایبەت وتوێژی دوکتور قاسملو دەکاتە بیانوو کە لە سوید لە رۆژنامەی ( ئافتن بلادەت)دا بلاو کرابوو. بە کوێرەی ئەو نووسراوەیە گۆیا دوکتور قاسملو نەک هەر لە سیاسەتی پارتی بەرگری کردوە، بەلکوو تا رادەیەک سیاسەتی حکوومەتی ئێرانیشی سەبارەت بە پارمەتی بە بزووتنەوەی کوردستانی عیراق بە کارێکی باش داناوە. کومیتەی ناوەندی لە بەغدا ناچار روونکردنەوەیەک بەم جۆرە لە ژمارە ٣٤ی رۆژنامەی کوردستان، ئوت و سپتامبری ١٩٧٤دا بلاو دەکاتەوە:

## «... روونکردنەوەیەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

رۆژنامەی « ئافتون بلادەت » چاپی سوید لە تاریخی ١٩٧٤/٧/٢٤دا هێندێ قسەی لە بارەی عیراق لە زمانی سکرتێری گشتی حیزبی ئێمەوە بلاو کردۆتەوە کە پێویستی بە راستکردنەوە هەیە. پێویستە ئەوەش بلێین کە رۆژنامەی ناوبراو بە شێوەی پرسیار و وەلام ئەو شتانەی وەرنەگرتوە. رۆژنامەی کوردستان بە پێویستی دەزانێ رابگەیێنێ :

١ - ئەوەی لە بارەی عیراق لە زمانی سکرتێری حیزبی ئێمەوە لە رۆژنامەی ناو براودا نووسراوە نە قسەی سکرتێری حیزب و نە سیاسەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانە.

٢ - سکرتێری حیزبی ئێمە لە توێی روونکردنەوەی وەزعی نا لە باری کورد لە

کوردستانی ئێراندا گوتوویە :«ئەگەر خود موختاری بۆ کوردی عیراق بە گوێرەی
رێک کەوتنی ١١ی مارس جێ بەجێ بوو با، نەک هەر بۆ کوردی عیراق بەڵکوو بۆ
کوردی ئێران و تورکیا و سووریاش ئەهمیەتێکی زۆری دەبوو.» هەر وەها گوتوویە
« حیزبی ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە گیروگرفتی کورد لە عیراق لە رێگای
نیزامی یەوە بە زۆر چارە سەر ناکرێ»

٣ – پاش بڵاو بوونەوەی وتارەکە لە تاریخی ١٩٧٤/٧/٣٠ دا راستکردنەوەیەک
لە لایەن سکرتێری حیزبی ئێمە دراوە بە رۆژنامەی ناوبراو. بەڵام لە بەر ئەوەی
کە گۆیا ئەو بەشەی رۆژنامەکە دیرەکی ئازادە و رەخنە هەڵناگرێ تا ئێستا
راستکردنەوەکەی بڵاو نە کردۆتەوە»

ئەگەڕانەوەی دوکتور قاسملو بۆ عیراق و مانەوەی سێ ئەندامی کومیتەی ناوەندی
لە ئورووپا و بوونی چوار ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە کوردستان و مانەوەی
هێندێکیان لە بەغدا و فشاری حکوومەتی بەعس لە سەر بێدەنگی و بێلایەنی بار و
دۆخێکی نا لە بار دەخولقێنێ. بە تایبەت ئێتر حکوومەتی عیراق رێگای ئەوەش
نادا کە ئەندامانی حیزبی دیموکرات بچنە کوردستان و یا بێنە بەغدا. هەر
چۆنێک بێ کەریمی حسامی، هێمنی شاعیر و حەمەدەمینی سراجی خۆ دەگەیێننە
سولەیمانی و ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کۆ دەبنەوە و کۆبوونەوەی خۆیان بۆ
باس و لێکۆڵینەوەی رووداوەکان دەست پێدەکەن. لە پێشدا نامەی دوکتور
قاسملو بۆ کومیتەی ناوەندی دەخوێنرێتەوە کومیتەی ناوەندی نارەزایی خۆی لە نە
گەڕانەوەی دوکتور قاسملو دەر دەبڕێ و بڕیار دەدات کە بە پێچەوانەی بیر ورای
ئەندامانی کومیتەی ناوەندی دانیشتووی ئورووپا (کە لە سەر ئەو باوەڕە بوون
کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە عیراق بچێتە دەرێ بێ دیاریکردنی شوێن و
جێگایەکی دیکە) لە عیراق بمێنێتەوە و سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ و قورسایی
تێکۆشانی خۆی بخاتە سەر کوردستانی ئێران. کومیتەی ناوەندی لە سەر
پێشنیاری دوکتور قاسملو کەریمی حسامی بە تێکڕایی دەنگ بە جێگری سکرتێر
هەڵدەبژێرێ. ( لە کاتێکا ئەو دەم لە پێڕەو و پرۆگرامی حیزبی دیموکرات نە باسی

جێگری سکرتێر هەبوە و نە جێگای بۆ دیاری کراوە. هیچ یەک لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندیش نە بە بیریان داهاتوە و نە باسیشیان کردوە.} لە وەش سەیرتر ئەوەیە دوکتور قاسملو کە پێشنیار دەکا کەریمی حسامی ببێتە جێگری سکرتێر و بە تێکرایی دەنگ پێشنیارەکەی پەسند دەکری، لە کۆبوونەوەی گشتی کادرەکانی حیزبیدا کە بە ناوی (کورتە مێژووی رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان) حکایەتیان بۆ دەکا ، دەفەرموێ:« کەریمی حسامی نوێنەری خەتی تودەئیسم بوو. و ا بەستە بوو بە حیزبی تودە و راستە و خۆ لە گەڵ تودەییەکان تەماسی هەبوو...»(١٤) بەلام لە سەر ئەوەشڕا پێشنیار دەکا ببێتە جێگری سکرتێر و تەواوی ئەو کاتەی کە لە دەرەوە دەبێ هەموو نامە کانی تەنیا بۆکەریمی حسامی دەنووسێ و پێوەندی هەر لە گەڵ ئەو دەبێ. نەک لەگەڵ کومیتەی ناوەندی.!!!

ئەمەش دەقی نامەی دوکتور قاسملو:١٩٧٤/٥/١ بۆکومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

«... برایانی بە رێز! پاش سلاوێکی گەرمی برایانە. بە داخەوە هەل و مەرجی سیاسی وەزعێکی ئەو توی پێکهێناوە کە ناچارم ماوەیەک لە ئێوە دوور بم. لە بەر ئەوە بە پێویستی دەزانم بیر ورای خۆم لە سەر هێندێ کێرو گرفتی حیزبی پێتان رابگەیەنم.

١ – هۆی ئەساسی سەر کەوتنی ئێمە لەم چەند ساڵەی دواییدا بە تایبەتی پاش کۆنفرانسی سێهەم کاری دەستە جەمعی و تەتبیقی ئوسولی حیزبی بە تایبەتی سانترالیزمی دیموکراتی لە ناوەوەی حیزب دا بوو. بۆیە هیوا دارم کە لە دوا رۆژیشدا پاراستنی ئوسولی حیزبی بە تایبەتی یەکێتی ریزەکانی حیزب بە ئەرکی ئەساسی خۆتان دابنێن و بە هیچ جۆر رێگا نەدەین ئەو یەکێتی یە کە پاش سالانی سال لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا پێک هاتوە تێک بچێ. لە سەر ئەم ئەساسە چەند پێشنیارم هەیە بۆ دابەشکردنی کار و بۆ ئەو ئەندامانەی کە لە مەرکەز دەمێننەوە. دیارە ئەو پێشنیارانە هەتا ئەو وەختەیە کە ئەو مەرکەزیەتە لە جێگای خۆی مابێتەوە.

الف - کاک کەریم وەک جێ گری سکرتێری گشتی دیاری بکرێ. هیوا دارم بە یارمەتی هەموو برادەران لە پێکهێنانی هاو کاری و هاو دەنگی لە ناو برادەراندا سەر کەوتوو بێ.

ب - کاک محمدامین بە مەسئولی کار و باری ئێران دیاری بکرێ و مەسئولیەتی پێوەندیەکانی دەرەوەشی هەبێ.

ج - کاک دوکتور سوڵتان هەر مەسئولی مالی بمێنێتەوە.

د - دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی کوردستان بریتی بێ لە چوار ئەندامی کومیتەی ناوەندی و کاک جەلال. مەسئولی ئەدەبی کوردستان هەر ماموستا هێمن بێ.

بروام ئەوەیە ئەگەر برادەران ئەو پێشنیارانە قبوڵ بکەن و دلسۆزانە بە دەستە جەمعی لە تێکۆشانی حیزبیدا بەشدار بێ سەر کەوتنی زیاتر لە دوا رۆژدا وە دەست دەکەوێ.

٢ - راپۆرتی کاری ئێمە لە ماوەی ئەم سەفەرە دا لە دەرەوە بە تەفسیل لە لایەن برادەرانەوە پێش کەش دەکرێ. من پێم وایە کە ئەو سەفەرە قازانجی زۆر بووە. هێندێ نەتیجەی موسبەتی سەفەرەکەمان لە دوا رۆژدا دەر دەکەوێ.....
براتان ع.رحمان .

پاش بلاو بوونەوەی بەیاننامەی حیزبی دیموکرات وبێدەنگی لە سەر شەری هەڵگیرساو. حکوومەتی بەعس بە جۆرێک لالوت دەبێ. پێشتر کە رۆژنامەیان بۆ چاپ دەکەن ئیتر چاپ و بلاو کردنەوەی رۆژنامەکە دەوەستێنن. پسولەی هاتوو چۆیان نادەنێ بۆ کوردستان هاتوو چۆ بکەن. بێجگە لە وانە کوتو پڕ پێنج ئەندامی حیزبی دیموکرات کە لە کۆیە دەژیان دەگیرین و بێ شوێن دەکرێن. هەرچەندی بەر پرسی پێوەندی یەکان وە دوایان دەکەوێ و دەپرسێ. جوابی نادەنەوەو دەڵێن ئاگامان لێ نیە.( دیارە سوێندی شەرەفیشیان لێ زیاد کردوە ). ئاخرەکەی لە رێگای زیندانیەکی ئازاد کراوی بەندیخانەی کەرکوک. خەبەر دەزانن کە وا لە بەندیخانەی کەرکوک گیراون. پاش چەند مانگ بە هەزار هەوڵ و تەقەلا ئازاد

دەگرین. دەفتەری سیاسی حیزبی کۆمونیستی عیراقیش بۆ ئازادکردنی ئەو ئەندامانەی حیزبی دیموکرات هەوڵێکی زۆری داوە.

سەیر ئەوەیە کە رێبەرانی بزووتنەوەی کوردستانی عیراقیش بەیاننامەکەیان بە دڵ نابێ، چونکە گۆیا بەعسی تێدا بەلامار نەدراوە. بە پێچەوانەی هەڵوێستی پارتی و بەعس ، رۆشنبیر و کەسایەتیە پێشکەوتوو خوازەکانی کوردستانی عیراق بەیاننامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە هەنگاوێکی ئازایانەو نیشتمانپەروەرانە لە قەڵەم دەدەن. دوای بڵاو بوونەوەی بەیاننامەی کومیتەی ناوەندی لالوتی حکوومەتی بەعس ناحەز تر و دزێو تر دەبێ. ئەندامێکی حیزبی دیموکرات لە حلە دەگرن و ماوەیەک بێ شوێنی دەکەن، پاش هەوڵ و تەقالایەکی زۆر، دەر دەکەوێ که بە دە ساڵ مەحکوومیان کردوە.

لە لایەکی تر دوکتور قاسملوو لە ئورووپاوە دەنووسێ:«... پێر لەبڵاو بوونتان بکەنەوە، حەمەدەمینی سراجی و کەریمی حسامی بچنە ئورووپا، ئەندامانی دیکەی کومیتەی ناوەندی لە عیراق خۆ وەشێرن و یا بچنە کوردستانی عیراق.»

کومیتەی ناوەندی پاش لێکۆڵینەوەی بار و دۆخی پێشهاتیی بە تێکرایی دەنگ پێشنیاری دوکتور قاسملو رەت دەکاتەوە. نیزیکەی ٢٧٠ ئەندامی حیزب بە ژن و منداڵەوە لە عیراق دەژیان. کەم یا زۆر ژیان و بەرێچوونیان بە حیزبەوە دەبێ. لە هەل و مەرجی ئاوا دا چوونە دەر و یا خۆ شاردنەوەی رێبەرایەتی حیزب لە گەڵ هیچ رێ و شوێنێکی ئینسانی نە دەهاتەوە. پاشان کوردستانی عیراق بۆ کوردەکانی خۆیان ببوە جەهەندەم و کوردی کوردستانی ئێران چۆن دەیتوانی لە وێ بحاوێتەوە. کومیتەی ناوەندی بریار دەدا کە:« هەتا بکرێ بێلایەنی خۆیان بپارێزن و لە عیراق بمێننەوە و لە وڵاتی خۆیان پتر دوور نەکەونەوە.»

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥حکوومەتی عیراق بۆ دژایەتی ئێران و پشتیوانی لە خۆی کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەیی پێک دێنێ. لە حیزبی دیموکراتیش دەگێرێتەوە کە بەشداری کۆنفرانس بکات. دەفتەری سیاسی وتارێک ئامادە دەکا و دوو برادەریش دیاری دەکرێن کە وتارەکە بخوێننەوە. حکوومەتی بەعس داوا دەکا کە

پێش کۆنفرانس وتارەکە ببینێ.( دیارە دەبێ ئەوەیان لە گەڵ هەموو بەشداربووەکانی کۆنفرانس باسکردبێ.). دوای دیتنی وتارەکە نوێنەری حیزبی بەعس دێتە بارەگای حیزبی دیموکرات و دەڵێ: « ئێوە دژی مەلا مستەفا هیچتان نە نووسیوە، هەڵوێستی ئێوە دۆستانە نیە. ئێوە لە وتاری خۆتاندا دەبێ مەلا مستەفا بە عەمیلی ئیمپریالیزم ناو بەرن و مەحکوومیشی بکەن ». نوێنەری حیزبی دیموکرات لە وەڵامی کابرا دا دەڵێ :« ئێمە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانین. نامانەوەی دەست بخەینە نێو کار وباری عیراقەوە. سیاسەتی سەر بەخۆی خۆمان هەیە و خۆشمان بڕیار دەدەین کە چ بنووسین و چ بخوێنینەوە. ئەگەر نا نانەوێ بەشداری ناکەین.»

کابرا بە تووڕەیی دەڕوا و پاش دوو ڕۆژ تەلەفون دەکا و دەڵێ : « وتاری خۆتان بخوێننەوە.»

ڕۆژی ١٩٧٥/١/١٥دیپلۆماتێکی بالیۆزخانەی سۆفیێتی دێتە بارەگای حیزبی دیموکرات و لە گەڵ جێگری سکرتێر دادەنیشێ و دەڵێ:« ئێوە دەزانن ئێران و عیراق وا خەریکن ڕێک دەکەون و لە بنەوە لە وتو وێژ دان. ئێوە ڕێگای ئەمین و دڵنیاتان هەیە کە ڕاسپاردەیەکی ئێمە بگەیێننە مەلا مستەفا تا بەر لە وەی دەرفەت لە کیس بچێ نوێنەرێکی خۆی لە تاران. یا لە بیروت و یا لە ئورووپا دیاری بکا لە گەڵ نوێنەری ئێمە دابنیشێ تا بزانین بارزانی چی دەوێ و ئێمە چیمان لە دەست دێت تا بۆ پاراستنی بزووتنەوەی کورد دەست بە کار بین.» لە وەڵام دا پێی دەگوترێ : « هەنگاوێکی پیرۆزە. بەڵام کاری ئوا بە ڕاسپاردە ناکرێ. بارزانی چۆن بڕوا بە ڕاسپاردە دەکات. ئەگەر نامە بنووسن. ئێمە ڕێگای دڵنیا و ئەمینمان هەیە و دەیگەیێنین.»

کابرا لە ڕادە بەدەر لە سەر نهێنی کاری و ڕازداری پێی داگری ودەڕوا. ڕۆژی دوایی دێتەوە پسولەیەکی پێچراوە دێنێ و ئەوەندەی دیکەش باسی ڕازداری و نهێنی کاری دەکات.. پسولەکەم لێ وەرگرت و بە تەتەرێکی ئەمیندا ناردم بۆ مەلا عەولای حەیاکی کە لە کوردستان نوێنەری حیزب و بەرپرسی پێوەندی لە گەڵ

پارتی بوو، لێم نووسی کە زۆر بە گورجی بیکەیێنیتە سەری و بیدا بە دەستی سەرۆک بارزانی. تەنیا کاک حەمەدەمینی سراجیشم لە مەسەلەکە ئاگادار کرد و نامەیەکیشم لەم بارەوە بۆ دوکتور قاسملوو نووسی.

مەلا عەولا خۆ دەگەیێنێتە سەری و زۆر هەوڵ دەدا کە چاوی بە سەرۆک بارزانی بکەوێ. ڕێگای نادرێ و پاش دوو ڕۆژان پسولەکە دەدات بە کاک ئیدریسی ڕەحمەتی. دوای ڕۆژێک بە مەلاعەولا دەڵێ: « ئەگەر کارمان پێیان بوو خەبەریان لێدە گێڕینەوە .»

مەلا عەولا لە نامەیکدا بۆی نووسیبووم: « پێم خۆش نیە خۆت بەو مەسەلەیەوە ماندوو بکەی. قسەکانی ئەوانم هەموو بۆ نە نووسیوی. هەر پێمن. زۆر شتی تریش لە بارەی ماڵی (پیرۆت)(بارزان) وە دەزانم کە ناکرێ بیان نووسم.»

ڕۆژی ٩٧٥/١/١٥ لە لایەن موخابەراتی حکوومەتی عیراقەوە بە بەرپرسی پێوەندی یەکانی حیزبی دیموکرات رادەگەیێنن کە:« نابێ ڕۆژنامەی کوردستان چاپ و بڵاو بکەنەوە. یان دەبێ دژی مەلا مستەفا بنووسن و بە عەمیلی ئەمریکانی ناوبەرن.»

دەفتەری سیاسی بڕیار دەدا کە چاپی ڕۆژنامەی کوردستان ڕابگیرێ، بەڵام دژی مەلا مستەفا و بزووتنەوەی کورد نابێ هیچ بنووسرێ.

دوکتور قاسملو لە ئوروپاوە بە ڕێگای پارتیدا نامەیەک بۆ مەلاعەولای حەیاکی دەنێرێ و جارێکی دیکەش لە سەر بڵاو بووی کومیتەی ناوەندی و چوونە دەر لە عیراق پێ دادەگرێ و دەنووسێ :« .... باوکی کەمال خەبەری بۆ ناردووم کە ڕۆژنامە دەر ناچێ. شەرت و شروتی وایان بۆ داناوە کە تازە لەو جێگایە ئیمکانی دەر چوونی نیە. ئەو باوەڕە دام کە بەرە بەرە جێگای خۆیان بە تاڵ بکەن.»

هەوەڵی مانگی فیوریەی ١٩٧٥ کۆنفرانسی پشتگیری لە عیراق لە زانستگای موستەنسەریەی بەغدا دەست بە کار دەکا. وتاری نوێنەرانی حیزبی دیموکرات سەرنجی بەشدار بوانی کۆنفرانس ڕادەکێشێ. چونکە تاقە وتارێک دەبێ کە لەو کۆنفرانسە دا دژی مەلا مستەف و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد هیچی تێدانیە.

رۆژی ٧٥/٢/٥ دوکتور قاسملو لە نامەیەکدا داوا دەکات کەریمی حسامی هەر چۆنێک بێ بچێتە پراک و چاوی بەو بکەوێ. دوکتور دەنووسێ :«... گوتت ئیجازەی هاتنەدەرت زەحمەتە. چا کەوا بێ نەخۆشییەکە توندە. ئەو وەختە بە تەواوی سەفەرت بۆ دەرەوە زۆر پێویستە. دیارە ئەگەر هاتیە دەرێ دراوت لەبیر نەچێ هەر چەندی بۆت هەڵدەگیرێ لە گەڵ خۆت بێنە.....»

بە دوای ئەودا لە٩٧٥/٢/١٧ دوکتورقاسملو نامەیەکی دیکە بۆ کەریمی حسامی دەنووسێ :«.... پێم وایە هە رلە ئێستاوە دەبێ فیکرێکی دیکە بۆ خۆمان بکەین. مەوزوعی ئەساسی ئەوەیە کە هەرچی زووتر تۆ بۆ دە رەوە سەفەر بکەی. ئەگەر تۆک خۆر (ناوی خواستەی عبدالله حسن زادە بو.) لە گەڵ خۆت بێنێ زۆر باشە.... تەرتیبی وابدە ک مبرادەرانی تریش بەرە بەرە جێگای دیکە بۆ خۆیان پەیدا بکەن... بەلام نابێ پێوەندیش لە گەڵ بەعس بپسێنن..»

کومیتەی ناوەندی ئەم پێشنیارە زۆر بە نارەحەتی وەردەگرێ. نەدەکرا سکرتێر و جێگری سکرتێر بچنە ئوروپا و ئەندامانی دیکەش « خۆیان جێگای تربدۆزنەوە

رۆژی ٩٥٧/٣/٨ لە موخابەراتەوە داوا دەکەن کە حەمەدەمینی سراجی بەرپرسی پێوەندی یەکانی دەرەوە بچێتە لایان. لە وێ پێی ڕادەگەیێنن کە: «..لە ئێستاوە هەموو تێکۆشانێکی چەپەمەنی رابگرن. هاتوو چۆی ئێران نەکەن ، بە بێ ئاگاداری هاتو چۆی کوردستانیش نەکەن. دەقی ئەمرەکەشیان بە عەرەبی کاک حەمەدەمین یادداشتی دەکا بەمجۆرەیە :

١- ایقاف عملیة التسلل والذهاب من والی ایران وفی الوقت الحاضر

٢ - یمنع التحرک علی قواطع الحدودیة فی الوقت الحاضر والسلطة تکون غیر مسئولة فی ماحدث

٣ - منع التسلل والذهاب الی الشمال فی الوقت الحاضر والی اشعار آخر ویعلمنا.

(وەرگەڕاوەی ئەمری عەرەبی حکوومەتی بەعس بە کوردی:

١ - وەستاندنی هاتو چۆ بۆ ئێران لە کاتی ئێستا دا

٢ - بزوتنەوە لە ناوچەکانی سنوور قەدەخە دەکرێ و حکوومەت بەر پرس نیە لە کارەساتی قەومەو

٣ - هاتو چۆ بۆ شیمال لە کاتی ئێستا دا قەدەغەیە و تا راگەیاندنی ئاخری.)

×پێشتر بزووتنەوەی کوردستانی عیراق هاتو چۆی ئێرانی بە نهێنیش لە حیزبی دیموکرات قەدەخە کرد بوو. ئەمجارە حکوومەتی بەعس رێگ نادا بۆ نیشتمانی خۆی هاتوو چۆ بکا. ئەم دیرۆکە بۆ حیزبی دیموکرات کوردستانی ئێران درێژەی هەیە. پاش ٢١سال واتە سالی ١٩٩٥ یەکیتی نیشتمانی کوردستان نەگ هەر هاتو چۆی ئەندامانی حیزبی دیموکرات بۆ ولاتی خۆی قەدەخە دەکا. بەلکوو دەزگای ئاسایشی یەکیتی نیشتمانی کە پێشمەرگەی کوردی کردۆتە پارێزەری سنووری کۆماری ئیسلامی ئێران و پەیمانی هاوکاری لە کەل دەزگای ئیتیلاعاتی کورد کوژی ئێران کرێداوە . لە ماوەی چەند مانگدا. ٦ پۆلی پێشمەرگەی کیان لەسەردەستی حیزبی دیموکرات لە رێگای چوونەوە بو ولاتی خۆیان چەک دەکا و زیندانیان دەکا. ورێگای هاتووچۆیان بۆ ولاتی خۆیان لێ دەبەستێ. لەوە قەباحەتتر، رێبەرایەتی(قارەمانی) حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە رۆژنامەکەیان بە باسی سەفەری سەیروسەیاحەتی رێبەران وسەر کەوتن رەش دەکەنەوە، جارێک ئەم تاوانانە لە قو ئدا و خەلک ئگادار ناکات. جگە لەوە رادیۆی دەنکی کوردستان کە جنایەتی حکوومەتی ئاخوندی لە قاو دەدا. لە لایەن یەکیتی نیشتمانی یەوە دەبەسترێ ئەودشی پێ کەمە لە کەل هێزێکی کوردی بیکات. ئەمجارە سالی ١٩٩٦ سوپای پسدارانی ئێرانیش بە تۆپ وتانک و راجیفەو دۆشکەوە دێنێتە سەر و تەرتو تونەی دەکات و دوو هەزار کوردی ئاوارەی دەستی حکوومەتی ئیسلامی ئێران و پەنەهەندەی دەشتی کۆیە دەربەدەر و ئاوارە تر دەکا. ئەوەش هەمووی لە ریی پەراستنی( ئەزموونی دیموکراسی ودەسەلاتی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عیراق ") ئەنجام دەدرێ و هێندێک مێژوونووس و شاعیرو کوردی نیشتمانیەروەر ئەگەر ئەم سیاسەت وکردەوە چەپەلەرەخنە بگرن. بێ هەلوێستیان ناو دەبەن."'' شاعیرو نووسەرو زانای سیاسیش ئەگەر دەهۆل بۆ

ئەم سیاسەتە نانیشتمانی یە بکوتن. دیارە خاوەن هەڵوێستن.""

دوای ئەم پێڕاگەیاندنە کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە کۆبوونەوەی خۆیدا پاش شیکردنەوەی وەزع دەکاتە پەسندکردنی ئەم بڕیارانەی خوارەوە:

« - ١ سەر بەخۆیی سیاسەتی خۆمان بپارێزین و هەتا بکرێ پێوەندیمان لە گەڵ بەعس نەپسێنین.

٢ - ئەگەر داوای لیستەی ناوی ئەندامانمان لێکردین بیاندەینێ

٣ - داوای پسولەی ڕێک بکەین بۆ هاتوچوی کوردستان. ئەگەر حکوومەت نەیدا، داوای یارمەتی لە حیزبی کومونیستی عیراق بکەین.

٤ - ئەگەر بزووتنەوەی کوردستانی عیراق بە تولەی خەیانەتی شا، باداتەوە سەر ئێران، حیزبی دیموکرات بە هەموو توانەوە بچێتە ناوی و پشتیوانی لێ بکات.

٥ - ئەگەر لە کوردستانی عیراق شەڕ بەر دەوام بێت. تا ئەو کاتەی بەعس دەستی لێ نەداوین. بێلایەنی خۆمان دەپارێزین و بە هیچ جور دژی شۆڕشی کورد نا جوڵێینەوە.

کومیتەی ناوەندی هەر لەو کۆبوونەوەیە دا نامەیەک بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەنووسێ کە تێیدا هاتوە:...

«ئێستا کە شای ئێران خەیانەتی بە شۆڕشی کورد کرد و لە پشتەوەرا خەنجەری لێدا، کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان پێشنیار دەکا کە:« شەڕ بخەنە ئێران و بە شۆڕشی کورد درێژەی هەبێ. حیزبی دیموکراتی کوردستان شان بە شانی خەڵکی کوردستان وەک پێشمەرگەیەک لە ژێر ڕێبەرایەتی پارتیدا بە هەموو توانەوە بەشداری دەکا. تکاتان لێدەکەین چەک دامەنێن، با خوێنی هەزاران لاوی کورد بە فیرۆ نەچێ.

ڕوژی ١٩٧٥/٣/١٩نامە دەدرێ بە مەلا عەولای حەیکی کە بیگەیێنێتە مەکتەبی سیاسی پارتی. ناوبراو لە ڕێگا ئێستر توشکی لێدەدا و بەسکی دەشکێ. تا باسکی هەڵدەبەستێتەوە و دەگاتە حەجی ئومەران بە سەر هەواری خاڵیدا دەکەوێ.

# پەیمانی شومی ئەلجەزایر و ناکامی بو کورد

راست لەو کاتەدا کە سەرەتای سالی ١٩٧٥ شەرە جنیوی نیوان ئیران و عیراق گەیشتبوە ئەو پەری خوی و لە بەغدا بو پشتیوانی لە عیراق کونفرانس دەبەسترێ، لە ژیرەوە بە دەلالی بومەدیەنی ئەلجەزایر لە نیوان ئیران و عیراق وتو ویژ لە کایەدا دەبێ کە لە شەشی مانگی مارسی ١٩٧٥ دەکاتە ناکام و پەیمانی شوم لە لایەن شای ئیران و سەدام حوسین دە وە واژو دەکرێ و راپەرینی چەکدارانەی ١٤ سالەی کوردستانی خوارو دەکرینتە قوربانی و توشی هەرەس و شکان دیت.

٢٢ی مارسی ١٩٧٥ هەوالدەرەکانی هەتدەران خەبەری شکانی راپەرینی کوردستان بلاو دە کەنەوە و لە زمانی سەروک بارزانی رادەگەیێنن کە گوتوویە:«

«...کورد بێ پشتیوان مایەوە. شەر تەواو بوە و شورش کوتایی پیهاتوە.»

١٩٧٥/٣/٢٥ دوکتور قاسملو لە نامەیەکدا بو کەریمی حسامی دەنووسێ :«.... ئیدی هەموو شتێک روونە. هەموو لا ئەو ریککەوتنەیان پێخوشبو و گەلی کورد نەبێ. بە پێێی وەزعی تازە کە پێکهاتوە من ئەزدرم بەو جورەیە:

١ - مانەوەی ئیوە لە وێ ئیتر هیچ قازانجێکی بو ئیمە نیە و دانیشتن و دەست لە سەر دەست دا نانیش کاری ئیمە نیە. لە سەر ئەوە پێشنیاری پێشووی خوم دوو بارە دەکەمەوە : لە گەل حکومەتی بەعس رێک کەون کە ئێستا بە قازانجی ئەوان نیە ئیوە لە وێ بن. تو هەر جوٚرێک بێ دەبێ فیکری دەرەوە بکەی و هەر نەبێ داوای ئەوە بکەی کە دەچی سەری مال و منداڵت دەدەی. لە وەزعی ئیستا دا من بە راستی دەزانم کاک مینە بچێ بو لای نوک خور مەرکەزیەتێک لە وێ پێک بێنێ. دوکتور و ماموستا هێمن جرێ هەر لە جێگای خویان بن. ئیمەش

له دەرەوە خەریکی بڵاو کردنەوەی رۆژنامەکە دەبین. ئەگەر لەبیرت مابێ وەختی خۆی زۆر قسەمان لە سەر ئەوە دەکرد کە هەموو مان بچینەوە و لاتی خۆمان و تۆ زۆر ئیسرارت هەبوو کە هەر چی زوتر ئەو کارە بکەین. پێم سەیرە کە برادەران ئێستا کە وەزع لەم بارەوە لەبارترە و هەل وەرجیش ئیجاب دەکا، باسی ئەو مەسەلەیە ناکەن. پێم خۆش بوو نەزەری ئێوە لە سەر ئەم مەسەلەیە بزانم. تکام ئەوەیە ئەم نامەیە بۆ هەموو برادەران بخوێننەوە و نەزەری هەموانم بۆ بنووسە. دیارە هەر چی زوو تر بینووسی باشترە. پێشم وایە دەبێ خەریک بین و دەست لە سەر دەست دانەنێین.»

نامەی دوکتور قاسملوله کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندیدا دەخوێنرێتەوە و بە تێکرایی دژی بۆ چوون و پێشنیاری ناو براو دەوەستن. پێیان وا دەبێ دوکتور لە ئوروپا بە خەیال دەژی.*

---

*یەک لە تایبەتیەکانی میللەتی دواکەوتوو ئەوەیە کە ئەگەر دەسەلاتداریکیان دیت، ئیتر بۆیان دەبێتە بەندەی بێ عەیب و لایان وایە ئەو کەسە قەت توشی هەڵەو کەم و کوری نابێ. کەسیش مافی ئەوەی نیە رەخنەی لێ بگرێ گۆیا لە قودسیەتی کەم دەبێتەوە. یا ئەگەر کەسێکیش لە رووی دڵسۆزی و رێزەوە باسی ناتەواوی وهەڵەی کرد، بە تاوانبار دەزانرێ. من ئێستا کە بۆ چوونەکانی دوکتور قاسملو. وسیاسەتی حیزب بەگشتی لێکدەدەمەوە ئەو دەم منیش هەر وەک ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کە بە تێکرایی لەم بوارە دا دژی پێشنیار و بۆچوونەکانی ناو براو بوون هەڵویستم گرتوە.

با تۆزێ ورد تر ئەم نامەیەی دوکتور قاسملو شی کەینەوە و بزانین چەندە لە گەڵ واقعیەت و خەسلەتی رێبەرێکی دڵسۆز و شۆرشگێر یەک دەگرێتەوە کە ئەو دەم کومیتەی ناوەندی دژی وەستاوە:

١- ساڵی ١٩٧٣ کومیتەی ناوەندی بریار دەدا کە ئەگەر لە کوردستانی عیراق شەر ساز بێتەوە، کومیتەی ناوەندی بچێتەوە کوردستان و خەباتی چەکداری بکا. پاشان دوکتور قاسملو کە بەر نامەی چوونە ئوروپا و مانەوی لەوێ هەیە. کۆبوونەوەی بۆ ساز دەکا و بە یارمەتی هاشمی کەریمی و سمایلی حاجی بریاردکە هەڵدەوەشێنێتەوە.

٢ - چاو پێکەوتنی هێزە دیموکراتەکانی ئێرانی دەکاتە بیانوو. بێ ئەوەی ئەم سەفەرە لە گەڵ کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی بێنێتە گۆرێ دەچێتە ئوروپا و لە وێ بە بیانووی دووری لە ژن و منداڵی دەمێنێتەوە.

٣ - خۆی لە ئوروپا دادەنیشێ. لێکدا لێکدا پێشنیار دەکا کە: « بلاوەی بکەن، بچنە

له سەر پێدا گرتنی دوکتور قاسملو بۆ چوونە دەری جێگری سکرتێر ، ناچار ئیجازەی چوونە دەری کەریمی حسامی و عەولای حەیاکی وەر دەگیرێ و رۆژی ٩٧٥/٧/٢٣ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی: دوکتور قاسملو، ئەمیری قازی، حەسەنی شەتەوی، عەولای حەیاکی و کەریمی حسامی لە بیرێین کۆ دەبنەوە، پاش باسێکی زۆر پێشنیاری دوکتور قاسملو سەبارەت بە چوونە دەری ناوەندیەتی حیزبی دێموکرات لە عیراق رەت دەکرێتەوە. بڕیار دەدرێ کە پێوەندی لە گەڵ حیزبی بەعس بپارێزرێ، رۆژنامەی کوردستانیش لە سوید چاپ و بڵاو بکرێتەوە، کە فەت

بیروت ، ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بۆ خوێن جێگەیەک بدۆزنەوە. یا بچنە کوردستان مەرکەزیەت پێک بێنن »

٤ – بزووتنەوەی کوردستان شکەوە. بەعس بە سەر کوردستاندا زاڵە، رێگای هاتو چۆی لە ئەندامانی حیزبی دێموکرات گرتوە. دوکتور قاسملو لە ئوروپەوە دەنووسێ :« کەریمی حسامی بچێتە ئوروپا لە وێ لە گەڵ ئەو رۆژنامە دەرکەن. حەمەدەمینی سراجی لە گەڵ ئۆک خۆر لە کوردستان مەرکەزیەت پێک بێنن. لەوەش سەیرتر دەنووسێ: بۆ باسی چوونەوەی کوردستانی ئێران ناکەن لە وێ خەبات بکەن. ئەوەشی لێ زیاد دەکا وەڵێ : ئێمە نابێ دەست لە سەر دەست دانیشین. من ئەو دەم بەردەوام روو رەخنەم لەم هەڵوێستە گەلێک توندتر بوو، بەڵام ئێستا کە بە دڵسۆزی بۆ روونکردنەوەی خەباتی رابردووی حیزبی دێموکرات و بۆ دەرس وەرگرتن لە ئاکار و کردەوەی رێبەران و بۆ وریایی تێکۆشەرانی رێگای رزگاری دەیانهێنمە سەر کاغەز. لام وایە ئەم کارە خزمەت بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و بە وریایی لاوانی تازە پێگەیشتوو. مەلا عەولای حەسەن زادەش پێی وایە ئەوە بە دەو کرێیە و ئەدەمی وەک ئەو بە درۆ بوت بۆ میللەتی کورد دروست بکەم، لە کاتێکدا ئەسرین هەڵوەر ئەدەی بە دروی حەنابی مەلا کەسایەتی و پرستیژی دوکتوری شەهید دێنێتە خوارێ، من بۆ خۆم لەو هەموو هەڵەو ناتەواوی کەم وکوری یەدا بەشدار بووم و حەتاشم لە سی مەلا عەولا زیاترە، چونکە دوای دوکتور قاسملو من بەرپرسی یەکەم بووم و مەلاعەولاش کە ئێستا خوای پێیدەوە و بە ئەمەنی دوکتوری شەهید بۆتە بلبل، ئەو دەم هەمیشە بە ئەلێی گوتوە و بە زیز بوە و دوایەش بایداوەتەوە. با ئەوەشی لێ زیاد بکەم کە رەخنەی بابەتی و دۆستانە نەک هەر لە دوکتور قاسملو بەڵکو لە هەر زاناو شەخسیەتێکی هەڵکەوتوی دیکەش نە کوفرە و نە تاوانە.. چونکە کەسێک هەرچەندی زاناو تێکۆشەرێکی مەزن بێ، دوور نیە توشی هەڵەش دەبێ. ئەودەم هەڵەی ئەو لەنێ هەموو کەس مەزنترە و زیاتریش زیان بە بزوتنەوە دەگەیێنێ.. ئەزموونی ئاوامان بەدەستەوەیە. پێداچوونەوە.

ئەم کارە نەکرا و وتارەکانی ۳ مانگ لە سوید مانەوە و چاپ نەکران. دوکتور قاسملو لە نامەیەکدا بۆ هەوەڵین جار رەخنە لە هەڵە و بۆ چوونی خۆی دەگرێ و لە نامەی۱۹۷٥/۹/۱۲دا دە نووسێ: «...بە داخەوە رۆژنامەکە نەک هەر لە وەختی خۆیدا دەر نە چوو، بەڵکو دەرکەوت کە بە راستی برادەرانی سامرەند (رێکخراوی حیزب لە ئوروپا) و بە تایبەتی ئەوانەی لە سویدن هەر لە بنا خەوە دیسیپلینی حیزبی یان قبوڵ نیە. چونکە من بۆ خۆم لە وانە بووم کە پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوە هیوام ئەوە بو کە رۆژنامەکە لە سوید دەر بچێ. بێ جێ نازانم بڵێم کە بە راستی بە هەڵە چووم و بە داخەوە برادەرانی ئێمە هەر بە تەواوی لە ئوسولی ئیبتیدایی حیزبی دوورن....»

## هەڵوێستی کومیتەی ناوەندی حیزبی تودەی ئێران

راست لەو کاتە دژوار و ناستەنگیە دا، کومیتەی ناوەندی حیزبی تودەی ئێران، بە پێچەوانەی ئەخلاقی شۆرشگێری و مارکسیستی و ئینسانی و هاووڵاتی و... لە ژمارە ۱۳٦ی رۆژنامەی(مەردم)دا بەیاننامەیەک ئاراستەی کوردەکانی کوردستانی ئێران دەکا و پاش ئەوەی خۆی بە (حیزبی دایک) دادەنێ، هێرشێکی توندی نا جوامێرانە دەکاتە سەر رێبەرایەتی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق و(دەستە راستی یەکانی نێو جوڵانەوەی کوردستانی ئێران) بە لادەر و کۆسپی سەر رێگای یەکێتی رێکخراوەیی لە گەڵ حیزبی تودەی ئێران) یان تاوانبار دەکات و دەنووسێ:«...ئێمە لە هەموو تێکۆشەرانی شۆرشگێری کورد داوا دەکەین وەک تێکۆشەرانی شۆرشگێری ئازەربایجان و گەلانی دیکەی ئێران پاڵ وە حیزبی تودە بدەن وسوننەتی شۆرشگێرانەی یەکێتی رێکخراوەیی و سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە گەڵ حیزبی دایک، حیزبی تودەی ئێران، حیزبی سەرانسەری

حینی کرێکاری ئێران دوو باره زیندوو کەنەوە... رێکخراوە جۆربە جۆرەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە سەر بناخەی بەرنامەی سیاسی و ئامۆژگاری حیزبی تودەی ئێران دابمەزرێننەوە و دەگەڵ ناوەندی حیزبی تودەی ئێران پێوەندی بەر قەرار بکەن...»

هێندێ جار کێشەت بە ئەستۆدا دێ. شەڕت پێ دەفرۆشن. هێندێ کەسی نامەرد وبودەڵە لە دەرفەت دەگەڕێن حقد و کینەی پەنگاو خواردوویان بە پەلاماری بێ جێ و بوختانی هەڵبەستە و درۆ دەربڕن. ئەوانە دەبێ بەگوێرەی فەرمایشی سەعدی شیرازی مامڵەیان لەگەڵ بکرێ کە دەفەرموێ:

« کلوخ اندازمرا پاداش سنگ است »

کەریمی حسامی وەلامێکی خەست بۆ بەیاننامەی حیزبی تودەی ئێران ئامادە دەکا و پاش دەست لێدانی دوکتور قاسملو کە گۆیا توند نووسراوە، لە ژمارەی ٢٧ی ئاوگوستی ١٩٧٥ی رۆژنامەی کوردستاندا بڵاو دەکرێتەوە.

رۆژنامەی کوردستان توشی قەرتی گەورە دەبێ. وەک باسکرا بەهیوای ئەندامانی حیزب ٣ مانگ لە سوید دەکەوێتەوەو چاپ ناکرێ. پاشان دێتە بیرلین و٢ ژمارە لە وێ چاپ دەکرێن. لە وێشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ لوبنان و چەند ژمارەش لە بێروت چاپ دەکرێن. دوایە دەچێتە فەرانسە و دوکتور قاسملوو چەند ژمارە لە پاریس چاپ دەکا. بە گورتی سەرە رای تەنگ و چەڵەمەی زۆر، کومیتەی ناوەندی ناهێڵێ ئورگانەکەی بوەستێ و لە سەر تێکۆشانی فەرهەنگی بەر دەوام دەبێ.

هەڵوێستی حکوومەتی بەعسی عیراق و مانەوەی سکرتێری حیزب لە ئوروپا دەرەتانی تێکۆشانی بەر چاو بۆ پێکهێنانی رێکخراو و کار لە کوردستانی ئێراندا گەلێک تەنگە بەر دەکا. کاری کومیتەی ناوەندی لە عیراق لە سەر ئەوە ساخ دەبێتەوە کە یەکێتی برادەران بپارێزێ و لە باری ژیان وبەرێچوونی ئەندامان بە گوێرەی دەرەتان یارمەتی یان بدا و جار و بار کۆبوونەوەیەک پێک بێنێ و وەلامی نامە و پێشنیارەکانی جۆر بە جۆری دوکتور قاسملو (وەک پاراستنی پێوەندی لە گەڵ بەعس، دەرکەوتن لە عیراق، سازکردنی پاسپۆرت بۆ دوکتور، ناردنی پارە و..)

بداتەوە. لە باری کولتوریشەوە هێندێ لە ئاندامانی کومیتەی ناوەندی و کادرەکان تێکۆشانێکی بەر چاویان دەبێ وەک نووسین و وەرگێران و هاوکاری لە گەڵ کۆڕی زانیاری و گۆڤاری رۆژنامە کوردی یەکانی عیراق. هەر ئەوەش خۆی دەبێتە هۆی رێزێکی زۆر لە لایەن روناکبیران ونیشتمانپەروەرانی کوردستانی عیراقەوە.

١٩٧٦/١/٦ نامەیەکی دیکەی دوکتور قاسملوم پێگەیشت دەنووسێ :

:«.... هەتا ئاخری مانگی فیوریە ( بابی مینا) دەیەوێ ئێرە (واتە پراک) بەجێ بێڵێ. ئەگەر هەر لێرە بێ کارێکی وای پێناکرێ. هێندێ پارەی بۆ بنێرن. لە سەر وەزعی ئێوە ئەزمرم وایە دەبێ دەست بەجێ دەست بکەن یە وەدەر کەوتن لە عیراق. چونکە لە سەر ئێوە دەنگ و باسی تایبەتیم پێگەیشتوە. هیچ کەسی گرنگ نابێ لە وێ بمێنێتەوە.»

نامەی دوکتورقاسملو کە داوا دەکا:(کەسی گرنگ نابێ لەوێ بمێنێ ودەبێ دەست بەجێ خەریک بن وە دەر کەون) ئەندامانی کومیتەی ناوەندی نیگەران دەکا.

رۆژی ١٩٧٦/١/٢٠ کومیتەی ناوەندی بۆ لێکۆڵینەوەی پێشنار و نامەی دوکتور قاسملو کۆ دەبێتەوە دوای باسێکی زۆر و لێکدانەوەی بارو دۆخ ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ دە نووسێ :«..... لەبارەی پێشنیارەکانت کە نووسیبوت:

(دەەستبەجێ وەدەر کەوتن دەست پێبکەن. (Hned Zacit Otchod

ئەت نووسیبوو بچینە کوێ و چۆن بچین؟. بەراستی ئێمە سەری لێ دەرناکەین، توش بۆمان روون ناکەیەوە .؟ لە بارەی رۆیشتنت لە پراک بە تێکڕایی لە سەر ئەو باوەرەین کە رۆیشتنت ئێستا مەسلەحەت نیە. پێمان وایە باشترە تاروون بوونەوەی وەزعمان لێرە و تا چاو پێکەوتنی گشتی لە پراک بمێنیەوە.....»

سور بوونی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە سەر پاراستنی سەر بەخۆیی سیاسی و نەچوونە ژێر باری حکوومەتی بەعس بۆ پەلاماردان وتاوانبار کردنی بزووتنەوەی کوردستانی عیراق و شەخسی سەرۆک بارزانی، حکوومەتی بەعسی دێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە هەڵویستی نەرمتر بکات و لەباری هاتو چۆی کوردستان و ڤیزاو پاسپۆرت و رێگا دان بۆ دەردوە یارمەتی بکا.

کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان مەوجود لە عیراق لە پەژارە و کەسەری هەرەسهێنانی بزووتنەوەی کوردستان و ئاوارەیی خەڵک و دوور خستنەوەی تێکۆشەران. خۆی بە شەریک و هاو دەرد زانیوە. هێندێ لە تێکۆشەرانی بزووتنەوە کە دوور خرا بوونەوە لە هاتو وچۆی خۆیاندا لە گەڵ ئەندامانی بەر پرسی حیزبی دیموکرات لە پێوەندیدا دەبن و سەبارەت بە بارو دۆخ و پلانی دو اڕۆژ و گەلێک مەسەلەی دیکە ڕاوێژ و وتوێژ دەکەن. دوکتور خالد سەعید، رەسوڵ مامەند، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵەیی، مەلا ناصح، سەیدا صالح یوسفی ئەوکەسانە بوون کە پێوەندی یان بە برادەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە دەبێ. حیزبی دیموکرات لە باری نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوە و زۆر و شتی ئاوا یارمەتیان پێدەکات.

رۆژی ۱۹۷٦/۲/۱۲ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی مەوجود لەعیراق، بۆ لێکۆڵینەوەی پێشنیارەکانی دوکتور قاسملو و بەجێ هێشتنی عیراق لە شاری کۆیە کۆدەبنەوە. پاش دوو ڕۆژ باس و لێکدانەوە دەگە نە ئەم بڕیارەی خوارەوە :

«... کومیتەی ناوەندی پێشنیاری دوکتور قاسملو لە بارەی بەجێ هێشتنی عیراق و گۆڕینی سیاسەتی حیزب ڕەت دەکاتەوە. پێویستە بە درێژی نامە بۆ دوکتور بنووسرێ و کەریمی حسامی سەفەر بکا و بچێ قسەی لە گەڵ بکات...»

لەسەر بڕیاری کومیتەی ناوەندی کەریمی حسامی سەفەر دەکا و ڕۆژی ۱۹۷٦/۳/٥ لە پراک دەچێتە کن دوکتور قاسملو. پێکەوە دەگەنە ئەم بڕیارە کە بچنە سوید و لە گەڵ دوو ئەندامی دیکەی کومیتەی ناوەندی لە مەسەلەکان بکۆڵنەوە. کاتێ دەچنە ئیدارەی پۆلیسی چێک کە دوکتور ڤیزای دەرکەوتن وەربگرێ، دوای سەعاتێک چاوەڕوانی لە جیاتی ڤیزای دەرچوون، زۆری وەدەرنان لە چێکوسلۆڤاکیا لە پاسپۆرتەکەی دەدەن و ناچار دەبێ ئەم وڵاتە بەجێ بێڵێ.

رۆژی ۹۷٦/۳/۸ دوکتور قاسملو و کەریمی حسامی دەچنە سوید، بەلام هیچ کۆبوونەوەیەکیش سەبارەت بە شیکردنەوەی بار و دۆخی حیزبی دیموکراتی کوردستان پێک نایە. پاش چەند ڕۆژ دوکتور قاسملو دەچێتە فەرانسە و کەریمی

حسامیش دەگەڕێتەوە بەغدا.

لە سەر پێشنیاری سکرتێری گشتی حیزب کومیتەی ناوەندی بڕیاردەدا کە کۆبوونەوەیەکی بەرینی کۆمیتەی ناوەندی (پلینوم) بۆ باس و لێکۆڵینەوەی تێکۆشانی حیزب لە ئوروپا پێک بێنن. حکومەتی عیراق لە بواری پاسپۆرت و پێداویستی سەفەر یارمەتی دەکات وڕۆژی ١٩٧٦/٥/١٢ لەبولغارستان، لە باژێری ڤارنا ڕۆخی دەریای ڕەش کۆبوونەوەی بەرینی(پلینوم) کومیتەی ناوەندی بە ڕاپۆرتی کەریمی حسامی سەبارەت بە تێکۆشان و کار و باری کومیتەی ناوەندی لە عیراق دەست بە کار دەکات.

دوکتور قاسملو لە فەرانسە بە کەلک وەر گرتن لە خوێندنەوەی نامیلکە و نووسراوەکانی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلکی ئێران، گەڵاڵەیەک بۆ خەبات و تێکۆشانی حیزبی دیموکرات لە کوردستانی ئێران ئامادە دەکا. بە گوێرەی گەڵاڵە و پێشنیاری دوکتور قاسملو، دەبوایە ڕێبەرایەتی حیزب بەدەستەی جیاواز بەرەبەرە بگەڕێنەوە کوردستانی ئێران و چەک و تەقەمەنی پەیدا بکەن. بەگوێرەی ئەم گەڵاڵە و پێشنیارە کە ناوی نا بوو( گەڵاڵەی سیا - می ) واتە( سیاسی نیزامی) دەبوایە حیزبی دیموکرات لە کرماشان و سنە و تەورێز و تاران و ورمێ و مەهاباد کومیتە و شانەی سێ کەسی و یا کەمتریشی هەبێ و ئەوانەش پێکەوە لە پێوەندی دابن. بە گوێرەی گەڵاڵەی دوکتور دەبوایە دوکتور خۆی و حەسەنی شەتەوی خوارزای و حەمەدەمینی سراجی لە ئوروپا بمێننەوە.

لە کاتی لێکۆڵینەوەی گەڵاڵەی دوکتور قاسملودا، حەمەدەمینی سراجی بە قسەیەکی خۆش و پێکەنین گەڵاڵەکە خاو دەکاتەوە. سراجی دەڵێ : « دوکتور قاسملو لەم نەخشەو گەڵاڵەیە دا یەک شتی لە بیر چوە و نەیگونجاندوە، ئەویش هێلیکۆپتەرە. چونکە بە بێ هێلیکۆپتەر ئەم پێوەیدی یە لە نێوانی ئەم شارانەدا بەر قەرار نابێ. بە تایبەت لە سەردەمی ساواک و حکوومەتی شای ئێراندا.

کومیتەی ناوەندی بۆ ڕاپەراندنی گەڵاڵەی (سیامی )کومیتەیەک هەڵدەبژێرێ، بەڵام هەر لە سەر کاغەز دەمێنێتەوە. پلینومی ڤارنا بۆ چارە سەر کردنی گیرو

گرفتەکانی حیزب لە عیراق بەر هەمێکی ئەوتۆ ناداتە دەست. سکرتێر و دوو ئەندامی کومیتەی ناوەندی دەچنە ئورووپا و ئەوانی دیکەش بۆ عیراق و بۆ ژێر رەحمەتی بەعس دەگەڕێنەوە.

لە مانگی ئاوگوستی ١٩٧٦ بۆ پێوەندی زیاتر لە گەڵ کۆنە ئەندامان و دۆست و ناسیارانی حیزب سەید رەسوڵی دیهقان و فەقێ عەوڵای قەڵەرەشە دەنێردرێنەوە کوردستان و لە مەهاباد و دەور و بەر لە گەڵ چەند کەس لە نیشتمانپەروەران پێوەندی دەگرن. لە گەڕانەوە دا سەید رەسوڵ پێشنیار دەکا کە خەڵک بۆ یارمەتی و هاو کاری ئامادەیی هەیە و باشترە برادەرێکی دیکەش سەفەر بکاو پێوەندی یەکە بە هێز تر بکرێ.

رۆژی ١٩٧٦/١١/١٣ دەفتەری سیاسی داوا لە حیزبی بەعس دەکات کە ڤیزا بدەن بە دوکتور قاسملو و بە ئەمیری قازی کە بێنەوە بەغدا. نوێنەری حیزبی بەعس لە وەڵامدا دەڵێ :« ئەوان ڤیزایان گەرەک نیە و هەر کات دەیانەوێ دەتوانن بێنەوە عیراق ».

١٩٧٦/١١/١٧ دوکتور قاسملو و ئەمیری قازی دێنەوە بەغدا. رۆژی ١٢/١١/٢١کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی بۆ لێکۆڵینەوەی بارو دۆخی کوردستان و تێکۆشانی کومیتەی ناوەندی و چارە نووسی گەلالەی( سیامی )دەست بە کار دەکا و کومیتەیەک بۆ راپەراندنی گەلاڵەی ناو براو لە م کەسانەی خوارەوە پێک دێت:( دوکتور قاسملو ، ئەمیری قازی ، حەمەدەمینی سراجی ، رەسوڵی پێشنماز و مەلاعەوڵای حەیاکی ) لە سەر بریاری کومیتەی ناوەندی هەموو ئیمکاناتی حیزبی بۆ کار و تێکۆشان لە کوردستان دەخرێنە بەر دەستی کومیتەی ناوبراو.

پاش دوو رۆژ مەلا عەوڵای حەیاکی لە ئەندامەتی کومیتەی (سیامی) دەکشێتەوەو سمایلی حاجی لە جێگای ئەو دیاری دەکرێ. دوکتور قاسملو و ئەمیری قازیش هەر چەندە بە ئەندامی کومیتەی ناوبراو هەڵدەبژێرێن و دەبوایە دەست بە کار بن، لە عیراق گیرنابن وەدەچنەوە ئورووپا و گەلالەی سیامی دوکتور قاسملوش هیچی لێ پەیدا نابێ.

دوای گەڕانەوەی دوکتور قاسملو بۆ ئوروپا نوێنەری حیزبی بەعس دێتە لای بەرپرسی پێوەندی یەکانی حیزبی دێموکرات، حەمەدەمینی سراجی وپێی دەڵێ :«
«..قاسملو لە گەڵ ئێمە ڕاست نیە. باسی زۆر شتی کردوە کە وا نەبوون و ڕاستی لە ئێمە شاردۆتەوە. لە ئورووپا لە گەڵ دوژمنانی ئێمە پێوەندی هەیە.»
چەند ڕۆژ دوای ئەم قسانە سەعدون شاکر مودیری موخابەراتی گشتی داوا دەکا کە بەرپرسی حیزبی دێموکرات لە عیراق بچێتە لای.
١٩٧٦/١٢/٥ کەریمی حسامی و حەمەدەمینی سراجی دەچنە کن سەعدون شاکر. دوای چاک و چۆنی سارد دەڵێ: « ئێوە لە عیراق دەژین. ئێمە یارمەتیتان دەدەین. بەلام بە پێچەوانە ئێوە لە هیچ شتێ یارمەتی ئێمە نادەن. ئێوە باش دەزانن ئێستا عەسابەی جەلال تاڵەبانی لە کوردستان دەسوڕێنەوە. دەزانن مەلا مستەفا عەمیلی ئیمپریالیزمە. بەلام ئێوە قەت باسیان ناکەن و لە سەریان نانووسن. داواتان لێ دەکەین کە لە سەر عەمەلەتی مەلا مستەفا و عەسابەی جەلال تاڵەبانی بەیانێک دەربکەن و کردەوەی ئێستا و ڕابردوویان مەحکوم بکەن. جگە لەوە ئێمە دەزانین کەسکرتێری ئێوە لە ئورووپا لە گەڵ دوژمنانی ئێمە پێوەندی هەیە.»
لە وەڵامدا پێی دەگوترێ :«... حیزبی دێموکرات لە بواری خەباتی دژی ئیمپریالیستی ودژی ڕێژیمی شا و حکوومەتی ئێران هاو خەباتی ئێوەیە و لەم بارەوە هەر چی لە دەستی بێ کۆتایی ناکات. بەلام لە باری عیراقەوە، ئێمە حیزبی کوردستانی ئێرانین. بڕیارمان داوە دەست نەخەینە نێو کارو باری کوردستانی عیراقەوە. چونکە ئەگەر باسی عیراق بکەین و بە گوێرەی ویستی ئێوە لە سەر مەلامستەفا و جەلال تاڵەبانی بنووسین، ئەو دەم دەبێ بە گشتی باسی کوردستانی عیراق بکەین. باسی چۆلکردنی کوردستان و ئاوارە بوونی هەزاران خاوو خێزانی کورد بکەین کە بە زۆرە ملی لە کوردستان دوور خراونەوە و لە ئۆردوگا زۆرە ملیەکاندا نیشتەجێ کراون. دەبێ باسی ئیعدامەکانی موسڵ و کەرکوک و بەغدا بکەین. ئێمە پێمان وایە بێدەنگیمان بە قازانجی ئێوەیە. ئێمە هیچ پێوەندیمان لە

گەڵ جەلال و مەلا مستەفا نیە و سیاسەتی ئەوانیش تەئید ناکەین ..»

سەعدون شاکر دەڵێ :« شتی وا نیە. نە کوردستان چۆل کراوە و نە کەس کوژراوە. ئەگەر وایە ئێوە لە دەرەوەی عیراق جێگایەک بۆ خۆتان بدۆزنەوە. مانەوەتان لە عیراق دەرمتانی نیە.»

– ئەگەر حکومەتی عیراق جوابمان بکا. ئێمە یا شوێنێک دەدۆزینەوە و یا دەچینەوە وڵاتی خۆمان و خەبات درێژە پێدەدەین. بەڵام ئێستا دەمانەوێ سەفەرێک بۆ کۆماری یەمەنی دێموکراتی بکەین. تکایە بۆ ئەم سەفەرە یارمەتیمان بدەن و پاش گەڕانەوە بیرێک لە وەزعی خۆمان دەکەینەوە و بڕیارێک دەدەین.»

پاش چەند رۆژ ئێوارەیەک لە لایەن موخابەراتی حکوومەتی عیراقەوە بە دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکرات رادەگەیەنرێ کە هەموو ئەندامانی حیزبی دێموکرات ئەوانەی لە بەغدا دەژین، بەیانی لە خانووی حیزب ئامادەبن نوێنەرێکی قیادەی قوتری دێ لە گەڵیان دەدوێ. ئەمە هەڤاڵ و هەڵوێستێکی تازە بوو. پێشتر کاریان بەوە نە دابوو کێ لە کوێ دەژی و نوێنەری قیادەی قوتریش قەت نە هاتبوو لە گەڵ ئەندامانی حیزبی دێموکرات بدوێ.

دەفتەری سیاسی دەکەوێتە هێندێ خۆ کۆ کردنەوە. ترسی ئەوە دەبێ کە کۆیان بکەنەوە و بیاندەنەوە بە ئێران. بەعسە و چاوەڕوانی هەموو شتی لێدەکرێ. مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی عیراق ئاگادار دەکرێ و هێندێ ئەمانەت لە لای ئەوان دادەنرێت. ئامۆژگاری دەدرێ بە ژنەکن کە لە کاتی رووداوێکدا چی بکەن. رۆژی دوایی بەیانی کابرای موخابەرات پەیدا دەبێ و رادەگەیەنێ:« هیچ کامتان نابێ لەم خانوە بچنە دەرێ. خۆمان خواردەمەنی و شتی پێویستیتان بۆ دێنین.» کابرایەکیش دەکەنە پاسدارلە وێی دا دەنێن. چەند رۆژ بەمجۆرە هەموو ئەندامانی حیزبی دێموکرات لەم خانوەدا لە ژێر چاوە دێری موخابەرات دا، رادەبوێرن. دەر کەوت ئەو ماوەیە ئەنوەر سادات بە سەفەر هاتوتە بەغدا، لە گەڵ فشاری حکوومەتی عیراق و پێشهاتی روو داوەکان. کومیتەی ناوەندی حیزبی

دێموکرات بۆ پاراستنی سەر بە خۆیی سیاسەتی خۆی ناچار دەبێ کە بۆ دۆزینەوەی شوێن و ڕێگای دیکە دەست بە کار بێ و لەم ڕێگایەوە قورسایی فشاری حکوومەتی عیراق لە سەر شانی خۆی سوک بکا. بۆ ئەم مەبەستە کۆماری یەمەنی دێموکراتی لە بەرچاو دەگیرێ و لە ڕێگای یارمەتی حیزبی کومونیستی عیراق و کۆششی تایبەتی هێژا کاک عەزیزمحەممەد سکرتێری گشتی حیزبی کومونیستی عیراق ڕێگای سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ یەمەنی دێموکراتی دەکرێتەوە.

لە مانگی دیسامبری ١٩٧٦باڵیۆز خانەی کۆماری یەمەنی دێموکراتی لە بەغدا بە دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکرات ڕادەگەیێنێ کە دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکرات دەتوانی لە نیوەی دووەمی مانگی هەوەڵی ١٩٧٧دا بچێتە یەمەنی دێموکراتی. لە سەر بڕیاری دەفتەری سیاسی دوکتور قاسملو سکرتێری گشتی و کەریمی حسامی جێگری سکرتێری گشتی لە ١٩٧٧/١/٨ دەچنە عەدەن پێتەختی کۆماری یەمەنی دێموکراتی.

دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکرات لە ماوەی سەفەری چەند ڕۆژەی خۆیاندا چاویان بە عبدالفتاح ئیسماعیل سکرتێری گشتی ڕێکخراوی سیاسی بەرەی نەتەوایەتی یەمەنی دێموکراتی و سەر کۆمار سالم ربیع عەلی و بەر پرسانی دیکەی حیزب و حکوومەتی یەمەنی دێموکراتی دەکەوێ و لە بارەی مەسەلەکانی نێو خۆی دوو وڵات و ناوچەی ڕۆژ هەڵاتی نێوە ڕاست و تووێژ دەکات و لە کۆتاییدا بەیاننامەیەکی هاو بەش سەبارەت بە سەفەر و چاو پێکەوتن و هاو پەیڤین بەم جۆرە بڵاو دەکرێتەوە:

## بەیاننامەی ناو خۆیی هاو بەشی نێوان رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-
## بەرەی نەتەوایەتی و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دا.

« .. لە رۆژانی ٨-١٥ی ژانویەی ١٩٧٧دا دەستەیەکی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە بریتی بوو لە :عبدالرحمن قاسملو سکرتێری گشتی حیزب وکەریمی حسامی یاریدەدەری سکرتێری گشتی حیزب لە سەر بانگهێشتنی کومیتەی ناوەندی رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو- بەرەی نەتەوایەتی، سەری لە کۆماری دێموکراتیکی گەلی یەمەن دا.

دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە ماوەی مانەوە لە یەمەنی دێموکراتیکدا چاوی بە رابەرایەتی رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی- کەوت ووتو وێژی لە گەڵ کرد. لەو چاو پێکەوتنەدا، هەر دوو لا سەبارەت بە گیرو گرفتەکانی هەرە گرنگی خەباتی رزگاریخوازی و دێموکراتیکی مەڵبەندی رۆژ هەڵاتی نێوە راست و جەزیرەی عەرەبی و خەلیج بە شکڵی تایبەتی و سەبارەت بە وەزعی نێو نەتەوەیی بە شێوەی گشتی ئاڵوگۆڕی بیرو رایان کرد و هەر لایەنە لایەنەکەی تری لە وەزع و تێکۆشانی ئێستا و داهاتووی حیزبی خۆی ئاگادار کرد و هەر دوو لا لە بارەی مەسەلە سەرەکیەکانی ناوچەیی و هەریمایەتی و جیهانیەوە بیرو رای وەک یەکیان هەبوو. هەر دوو لا لەم باوەرە دا بوون کە پێویستە پێوەندی دوو قۆڵی لە نێوان حیزبی دێموکراتی کوردستان و رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی- لە مەیدانەکانی جۆر بەجۆر دابە هێز بکرێ بۆ ئەوەی خزمەتی قازانج و ئامانجەکانی هاو بەشی هەر دوو رێکخراو و هەر دوو گەل و هەموو هێزەکانی پێشکەوتوو و دێموکرات و ئاشتیخواز لە دنیادا بکا.

دەستەی نوێنەرایەتی میوان هەر وەها چاوی بە رابەرانی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیە گەلی یەکان کەوت و وتو وێژی لە گەڵ کردن و سەری لە هێندێک کارخانە و بنیاتی بەرهەم هێنان دا.

دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان، خۆشحاڵی و ڕێزی خۆی لەو ئاڵ و گۆڕە ئابوری و کۆمەڵایەتیانە دەر بڕی کە لە یەمەنی دێموکراتیکدا لە سەر ڕێگای دێموکراسی و پێشکەوتندا وەدی دێن. هەر وەها حورمەتی خۆی لەو سیاسەتە ڕاست و شۆڕشگێڕانەیە کە کۆماری یەمەنی دێموکراتیکی گەلی ڕەچاوی دەکاو لەو هەڵوێستی مەبدەیی پشتیوانی لە هێزەکانی ئازادیخواز و پێشکەوتو ، دەر دەبڕێ کە بە گوێرەی بڕیارەکانی کۆنگرەی یەکگرتنەوەی ڕێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی- پەیرەوی لێدەکرێ.

دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان باسی ئەو وەزع وەهەل و مەرجە نا لە بارەی کرد کە هێزەکانی نیشتمانی و دێموکراتیکی سەر بە نەتەوە جۆر بە جۆرەکانی نیشتە جێی ئێران تێیدا دەژین و تێکۆشانی خۆیانی تێدا درێژە پێدەدەن، هەر وەها باسی ئەو زوڵم و زۆر و چەوساندنەوەی کرد کە بە هۆی دەزگاکانی ڕێژیمی دیکتاتۆری کۆنە پەرستی شاهەنشاهی دەرهەق بە نەتەوەکان و گەلەکانی ئێران و لە ناو ئەوانیشدا بەرامبەر بە گەلی کوردی ئێران دەکرێ. ئەو ڕێژیمە دیکتاتۆری یە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێوەندی خۆی لە گەڵ هێزەکانی ئیمپریالیستی بە تایبەتی لە گەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکا، بە هێزتر دەکا و داهاتی وڵات لە ڕێگای کۆ کردنەوەی چەک و بە هێز کردنی دەزگاکانی سەر کوتکردن بە فیڕۆ دەدا. ئەم کارەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی زەبر و زەنگ بۆ سەر ئازادیەکانی دێموکراتیک و زیاد بوونی ڕاو نان و سەر کوتکردنی درندانەی ئازادیخوازان و نیشتمانپەروەران لە ناو خۆی وڵات و گێرانی نەخشی ژاندارمی ئیمپریالیزم لە مەڵبەندی خەلیج و ڕۆژ هەڵاتی نێوەڕاست دا.

ڕێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی- هەر وەک دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە و بڕوایە دایە کە باری نادێموکراتیک

بە سەر ئێراندا زاڵە و رێزی خۆی لە بەرنامەی تێکۆشانی پەسند کراوی سێهەمین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران راگەیاند و دەری بڕی کە لە داهاتوو دا بە گوێرەی توانا یارمەتی و پشتیوانی حیزب دەکا.

هەر دوو لا پێخۆشبوونی خۆیان سەبارەت بە پەرە پێدان و بە هێز کردنی پێوەندی نێوان رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی -و حیزبی دێموکرات لە رێگای ئاڵو گۆڕی بەر دەوامی دەستەی نوێنەرایەتی و ئاگاداریەوە دەربڕی.

هەر وەها دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سوپاسی ئەو میوانداریە گەرمەی کرد کە لێی کرابوو و رایگەیاند کە دڵنیایە ئەو چاو پێکەوتنە هەنگاوێکی تازەیە بۆ پەرە پێدانی پێوەندی هاو کاری داهاتووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و رێکخراوی سیاسی یەکگرتوو-بەرەی نەتەوایەتی- و کۆماری دێموکراتیک و گەلی یەمەن و هەر وەها لە بە هێزکردنی ێ پێوەندی دۆستایەتی لە نێوان گەلەکانی وڵات دا.

هەر دوو لا سیاسەتی دوژمنانەی هێزەکانی ئیمپریالیستی و کۆنە پەرستی ئێرانیان مەحکوم کرد کە دەیەوێ دەست بە سەر سەروەت و سامانی نەتەوایەتی گەلانی مەڵبەند دا بگرێ و بەر گری لە پەرەساندنی سەر بە خۆیی و ئازادی گەلانی مەڵبەند بکا. ئەویش بە دەست تێوەردان لە کار و باری ناو خۆی وڵاتەکان و دامەزراندنی بنکەی سەر بازی و پەیمانەکانی دوژمنانە لە چەشنی نەخشەی بە ناو ئەمنی خەلیج خۆ دەنوێنێ و دەبێتە مایەی تازە و هەڕەشە لە هێمنایەتی و سەقامگرتوویی مەڵبەند بە تێکرایی دەکا.

هەر دوو لا دەست تێوەردانی نیزامیی ئێران لە کار و باری عومانیان مەحکوم کرد کە بە مەبەستی لێدانی شۆڕشی گەلی عومانە و هەر وەها هەڕەشە و دەست درێژی پەیتا پەیتای هێزەکانی ئێرانیان بۆ سەرخاکی کۆماری یەمەنی دێموکراتیکی گەلی مەحکوم کرد و رایانگەیاند کە بە هەموو تواناوە پشتی خەباتی رزگاریخوازانەی رەوای گەلی عومان بە سەرۆکایەتی بەرەی رزگاریخوازی گەلی

عومان دەگرن.

لە توێی باسی وەزع و گۆڕانەکانی ڕۆژ هەڵاتی ناوە ڕاست دا، هەر دوو لا ڕایانگەیاند کە ئاشتی عادڵانە لە ڕۆژ هەڵاتی ناوە ڕاست بە بێ کشانەوەی سەهیونیستە دەست درێژ کەرەکان لە خاکە داگیر کراوەکانی عەرەبی و بە بێ دابینکردنی مافی ڕەوای گەلی عەرەبی فەلەستین سەقامگرتوو نابێ و هەر دوو لا ڕایانگەیاند کە پشتیوانی لە خەباتی گەلی عەرەبی فەلەستین دەکەن بۆ ئەوەی مافە ڕەوا کانی خۆی وە دەست بێنێتەوە.

لە لایەن ڕێکخراوی سیاسی یەککرتوو-بەرەی نەتەوایەتی - لە لایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران»

دوکتورقاسملو لە ئوروپا بۆ ئازادی تێکۆشەرانی حیزبی دیموکرات(عەزیزی یوسفی و غەنی بلوریان) کە ٢٥سال زیندانیان کێشابوو، بە حەبسی ئەبەد حوکم درابوون، تێکۆشانێکی شێلگیرانە دەست پێدەکات . لە ڕێکخراوی لێخۆشبوونی نێونەتەوەیی( ئەمنیستی ئینترناسیۆنال)دا مەسەلەی عەزیزی یوسفی دێنێتە گۆڕێ وپرۆفیسور(لوشار) لە زانستگای بروکسل ماندە دا کە لە تاران لە گەڵ کار بەدەستانی ئیران باسی عەزیزی یوسفی و غەنی بلوریان بکا. لە ئەنجامی ئەو تێکۆشانەدا ڕۆژنامە نووسی بە ناوبانگی بەلژیکی دەتوانێ لە زیندانی کومیتە چاوی بە عەزیزی یوسفی بکەوێ و وتووێژی لە گەڵ بکا ت و دەقی وتووێژەکە لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٤٦،مارسی ١٩٧٧ دا بڵاو دەکرێتەوە. تێکۆشانی دوکتورقاسملو لە گەڵ هێزەکانی ئوپوزیسیۆنی ئێرانی وئەمنیستی ئینترناسیۆنال، دەبێتە هۆ کە لە تاران ٩١ کەس لە زیندانیانی سیاسی ئازاد بکرێن کە کاک عەزیزی یوسفیش یەک لە وان دەبێ. پاشان هەوڵ دەدرێ کە کاک عەزیز بێتە دەر و لە ئوروپا معالجە بکرێ، بەڵام بە داخەوە پێڕاناگا و لە مانگی یونی ١٩٧٨ لە تاران دڵە گەورەکەی لە لێدان دەکەوێ و ئاواتی لە مێژینەی لە گەڵ خۆی دەباتە ژێر خاک. تێکۆشانی دوکتورقاسملو بۆ ئازادی غەنی بلوریانیش هەر بەر دەوام دەبێ و ناوی

له ریزی پێشەوەی لیستەی ئەمنیستی ئینترناسیۆنالدا تۆمار دەکرێ، کە رێژیمی پاشایەتی دەرووخێ و غەنی بلوریانیش پاش ٢٥سال لە زیندان دەێتەدەرێ.

دوکتور قاسملو لە ئوروپا لە گەڵ کوردەکانی کوردستانی ئێران - یش کە لە ئوروپا بوون و یا هاتوچۆیان دەکرد، پێوەندی دەگرێ و بۆ هاو کاری لە گەڵ حیزبی دێموکرات داوەتیان دەکات. لەوانە دوکتورسادق شەرەفکەندی و نەبی قادری کە لە دوا رۆژ دا هەر تکیان بوون بەئەندامی کومیتەی ناوەندی.

دوای سەفەری دەستەی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان بۆ یەمەنی دێموکراتی، کومیتەی ناوەندی دەکەس لە کادر وئەندامانی حیزب بۆ دەورەیەکی کورتی فێر بوون دەنێرێتە کۆماری یەمەنی دێموکراتی و پاش تەواو بوونی دەور بە سەرکەوتوویی دەگەرێنەوە.

لەم ماوەیەدا حکوومەتی عیراق داوا دەکات کە ناو وجێگای دانیشتنی هەموو ئەندامانی حیزبی دێموکراتی بدرێتێ. هەر لەو کاتەشدا کوتوپڕ ماڵ ومنداڵی هێندێ لە ئەندامانی حیزبی دێموکرات گە لە کۆیە دەژیان دەپێچنەوە و دەیانخەنە نێو کامیۆنی ئەرتەشی و دەیان بەن. دۆستانی حیزبی دێموکرات لە کۆیە بە دەفتەری سیاسی حیزب رادەگەیێن کە برادەرانتان راگوێزراون و دیار نیە بۆ کوێ یان بردوون. دەفتەری سیاسی دەکەوێتە شوێن و هەوڵ و تەقەلا. نوێنەری حیزبی بەعس حاشا دەکا و دەڵێ بێخەبەرین و( بیشەرمی) یشی لێ زیاد دەکات. پاش دوو رۆژ دڵە راوکە و بێخەبەری لە چارەنووسیان، یەک لە ئەندامانی حیزب لە رمادی یەوە تەلیفون دەکا و دەڵێ وا لە مەیدانێکی فوتباڵ لە رمادی هەڵیان رشتووین. کاتێ بە نوێنەری حیزبی بەعس دەگوترێ: برادەرانمان لە رمادین، بە سەر سوڕمانەوە دەڵێ: « من هیچ خەبەرم نیە، ئێوە چۆن دەزانن !!»

# هەڵوێستی هێزەسیاسی یەکانی کوردستانی عیراق.

راست لەو کاتەدا کە کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سەبارەت بە لە سەر نەنووسین دژی بارزانی و جەلال تاڵەبانی کەوتبوە ژێر فشار و پاڵپەستۆی حکوومەتی عیراقەوە و نەک هەر مل بۆ ویستی حکوومەتی عیراق راناکێشێ و نەک هەر ئامادە نابێ دژی بزووتنەوەی نەتەوەکەی شتێک بنووسێ و هەنگاوێک باوێژێ، بەڵکوو لە بیرلین بەیانی بزووتنەوەی سۆسیالیستی شیان بۆچاپ دەکاو بۆیان بڵاو دەکاتەوە، نامە و نووسراوەکانی نێوان رەسوڵ مامەند و برادەرانی بەغدایان پێک دەگەیێنێ و لە هیچ یارمەتی یەک بە بوژانەوەی ئەم بزووتنەوەیە درێخی ناکات، تەشکیلاتی تازە دامەزراوی حیزبی دێموکرات لەوڵات، کومیتەی ناوەندی لە گەرانەوەی مام جەلال بۆ کوردستان ئاگادار دەکات. لە نامەیەکدا کە تەشکیلاتی حیزبی دێموکرات لە ئێرانەوە بۆ کومیتەی ناوەندی ناردوە، نووسراوە :«...... جەماعەتی مام جەلال لە تورکیاوە بە رێگای ناوچەی شنۆ بە کوێستانەکانی پشتی جەلدیان و زێوکە و دەلاوان و مەرچیان و کۆنەلاجان و قەلاتەرەشیدا باری شەش ئێستر و بارگینیان چەک پێ بوە و گەیشتوونەوە ناوچەی سەردەشت. مام جەلال و سەرکردەکانیان لە گوندی موسالان لە ماڵی مەلا عەلی کوری مەلا خەلیلی گورۆمەری لە گەڵ ئەفسەرانی ئێرانی و سەرۆکی ساواکی ناوچە کۆبوونەوەیان هەبوە .»

کومیتەی ناوەندی ئەم هەواڵە بەخۆشی وەر دەگرێ بەو هیوایە کە بوژانەوەی بزوتنەوەی تێکشکاوی کوردستانی عیراق، ببێتە ئەڵقەیەکی پێوەندی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکرات لە گەڵ کوردستانی ئێران و هەر لەو کاتەشدا لە وانەیە

فشاری حکوومەتی عیراقشی لە سەر کەم بکرێتەوە. بە پێچەوانەی هیوا و چاوەروانیی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات دەر دەکەوێ کە مام جەلال بۆ کز کردنی حیزبی دیموکرات خەریکی داتاشین و سازکردنی تاقم و دەستەی جیاواز و بە هێزکردن و سازدانی کۆمەڵە لە ژێر ناوی جیاواز و جۆر بەجۆ ردایە. جگە لەوە هێندێ عەجەمی مائۆییستی ئێرانیشی بە سەرۆکایەتی سمایل عەجەم ناوێک لە گەڵ خۆی هێناوەتەوە کوردستان و بە ناوی سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات دەیانناسێنێ.

لە مانگی ئەپریلی ١٩٧٧ دوکتور تالیب ناوێک، نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ناوچەی پشدەر نامەیەک بە خەتو ئیمزای مام جەلال وبەمۆری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەدا بە مەلا عەزیزی ئەحمەدی بەرپرسی ڕێکخراوی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە قەلادزە کە بۆ دۆکتور تالیب خۆی نووسراوە و ناو براو بۆ بڕوا پێکردن نامەکە دەدا بە مەلا عەزیز و لێی وەر ناگرێتەوە. لە نامەکەدا مام جەلال بۆ دوکتور تالیب دەنووسێ: «..... بە برادەرانی حیزبی دیموکرات کە لە ناوچەی پشدەر دەژین، رابگەیێنە کە وا ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکرات لە گەڵ من گەراوەتەوە بۆ کوردستان. پێویستە ئەوان بێن لە ژێر ئەو ڕێبەرایەتیەدا لە کوردستانی ئێران شۆڕش بەر پا بکەن و دەست لە وانە هەلبگرن کە لە بەغدا دەژین». ئەوە لە کاتێکا کە حیزبی بەعس کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات بەوە تاوانبار دەکات کە دوکتور قاسملو سکرتێری حیزب لە ئوروپا لە گەل جەلال تاڵەبانی لە پێوەندی دایە

هاوکات لە گەڵ گەرانەوەی یەکێتی نیشتمانی بۆ کوردستان، پاشماوەی پارتی دێموکراتی کوردستانیش کە بە ناوی قیادەی موەقەتە خەبات زیندوو دەکەنەوە، ئەوانیش چەکداریان لەو سنوورانە لە سورانەوە دا دەبێ. رۆژی ١٩٧٧/٤/١٢ ئەندامێکی حیزبی دێموکرات بە ناوی(مەلا ئەحمەدی عەولا چاوشین) کە لە لایەن تەشکیلاتی وڵاتەوە دێتە قەلادزە و نامەیەکی تەشکیلاتی بۆ حیزبی دێموکرات دێنێ. لە ناوچەی (بازار) تووشی دەستەیەکی چەکداری سەر بە قیادەی موەقەتە

دەبێ. بە سەرۆکایەتی عادل ناوێک ، مەلا ئەحمەد دەگرن و باڵی دەبەستن و لە پاسکای  بازار دەیدەنە دەستی ژاندارمی حکوومەتی ئێران و تا روخانی رێژیمی پاشایەتی لە بەندیخانەدا دەناڵێنێ.

پاش راگوێزانی ماڵ و منداڵی ئەندامانی حیزبی دێموکرات بۆ رمادی و داوای ناو و جێگای دانیشتنی ئەندامانی حیزب. کومیتەی ناوەندی مەوجود لە عیراق، دێتە سەر ئەو باوەڕە کە دوور نیە حکوومەتی عیراق ئەندامانی حیزب بەگشتی بداتەوە بە ئێران و یان بۆ خوارووی عیراق لە کوردستان دووریان خاتەوە. بۆ لێکۆڵینەوە ئەم وەزعە کۆمیتەوی ناوەندی رۆژی ١٣/٥/١٩٧٧کۆبوونەومیەک بە بەشداری زۆریەی کادرەکانی حیزب پێک دێنێ و دەگاتە ئەم بریارە کە: ئەگەر حکوومەتی عیراق بیەوێ ئەندامانی حیزب بۆ خوارووی عیراق بگوێزێتەوە، هێندێ لە ئەندامانی حیزب بە گوێرەی بڕیار و دیاریکردنی کومیتەی ناوەندی خۆ بە دەستەوە نەدەن و خۆ بشارنەوە. کومیتەیەکیش لە ٧ ئەندامی کومیتەی ناوەندی و چەند کادرێکی حیزبی دیاری دەکرێن کە لە گەڵ ئەندامانی دیاریکراو، بگەرێنەوە کوردستانی ئێران و خەبات درێژە پێبدەن. توێنەرێک لە عیراق بەجێ بێڵن کە پێوەندی لە گەڵ حکوومەتی عیراق بپارێزێ. بۆ راپەراندنی ئەم بڕیارە، ئەندامانی بەرپرس و شوێن و ناوچەی تێکۆشان دیاری دەکرێن. چاوە روانی هەنگاوی دواتری حکوومەتی عیراق و بڕیاری سکرتێری گشتی دەبن.

کومیتەی ناوەندی لە نامەیەکدا بڕیاری کۆبوونەوە و بار و دۆخی پێشهاتوو بۆ دوکتور قاسملو سکرتێری گشتی دەنووسێ و داوای لێدەکا هەر چۆنێک بێ بگەرێتەوە بۆ عیراق و یا لە رێگای تورکیاوە خۆ بگەیێنیتەوە کوردستان و ئەو ناوچەیەی کە بۆ تێکۆشان دیاری کراوە.

دوکتور قاسملو لە وەڵامی نامەی کومیتەی ناوەندی دا، پێشنیار دەکات کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی لە فەرانسە پێک بێ.

رۆژی ٣/٦/١٩٧٧ مخابراتی عیراق داوای چاو پێکەوتنی بەر پرسی حیزبی دێموکرات دەکا. لەو چاو پێکەوتنەدا سەعدون شاکر دەست دەکا بە گاوێژ

کردنەوەی بەیت و باوی کۆن و دەڵێ: « ...ئێوە یارمەتی ئێمە نادەن و لە سەر بارزانی و تاڵەبانی نانووسن و پێویستە لە عیراق بچنەدەرێ.» لە وەڵامدا پێی دە گوترێ:« بڕیاردانی کوتو پڕ دژوارە. رێبەرایەتی حیزب دەتوانێ لە عیراق بچێتە دەر، بەلام نیزیکەی ۲۷۰ ئەندامی حیزب بە ماڵ و منداڵەوە لە عیراق دەژین. بۆ مانەوەی ئەوانە بڕیارتان چی یە؟ بۆ ئەوەی مەسەلەکە بە ئارامی کۆتایی بێت و نەبێتە قاو کە حیزبی دێموکرات لە عیراق دەرکراوە، رێگا بدەن دوکتور قاسملو بێتەوە بەغدا و لە کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندیدا بڕیاری نهایی بدرێت.

- قاسملو لە ئورووپا دژی ئێمە دەجوڵێتەوە، رێگای نادەین بێتەوە عیراق.

- مەسەلەیەکی گرنگە. پێوەندی بە چارەنووسی ئێمەوە هەیە. کە وابوو رێگا بدەن هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بچنە پاریس و لەوێ بڕیاری خۆیان بدەن. بۆ ئەم سەفەرەش داوا دەکەین لە هەموو بارێکەوە یارمەتیمان بدەن.

- پاشان وەڵامتان پێ رادەگەیێنن.

رۆژی ۱۹۷۷/۷/۲٤هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بەرەو پاریس دەفڕن. دوکتور قاسملو لە هوتێلێکی فەقیرانە جێگایان بۆدەگرێ و لە بازێری( شانیۆمۆن لیڤۆ) لە ماڵی رۆژنامە نووسێکی برادەری بە ناوی (پۆل) جێگای کۆبوونەوەش ئامادە دەکات. رۆژی۲۷/۷/ کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی لە هەوایەکی ناکۆکی و رەخنەو نا تەباییدا دەست بە کار دەکات.

سکرتێری حیزب بەرنامەی کاری کۆبوونەوە بەم چەشنە پێشنیار دەکات:

۱ - کەریمی حسامی وەک جێگری سکرتێر و بەر پرسی پێوەندی یەکانی دەرەوە راپۆرتی کاری خۆی پێشکێش بکات.

۲ - بەرپرسی گەلالە و بەرنامەی( سیا- می) راپۆرتی کاری خۆی پێشکێش بکات

۳ - سکرتێری حیزب راپۆرتی تێکۆشانی خۆی لە دەرەوە پێشکێش بکات

دوای پێشکێش کردنی ئەم راپۆرتانە و شیکردنەوەیان کە هیچ بەرهەمێکی روون و هەست پێکراویان بۆ بزاڤی رزگاریخوازی لێ بەدی ناکرێ، نامەی

کەریمی حسامی بۆ کۆبوونەوە بەم جۆرەی خوارەوە دەخوێنرێتەوە:

«... کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. سڵاوێکی برایانە. کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی ئەم دەرفەتەی پێکهێناوە کە بۆ چوون و لێکدانەوەی خۆم لە بارەی کار و تێکۆشانی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و وەزعی ئێستای حیزب بخەمە بەر بیرو رای برادەران. دەمێکە هەستکردن بە مەسئولیەت و عەزابی ویژدان ئازارم دەدەن. ناوێکی گەورەمان لە خۆ ناوە کە لە گەڵ کردەوە و تێکۆشان عەرز و عاسمانی فەرقە. لە سەر ئەو باوەڕەم ئەوەی ئێمە بە ناوی حیزبەوە دەیکەین، بۆ بەشی زۆری ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و ئەندامانی حیزب کە لە عیراق دەژین، تەنیا بۆ رابواردنی رۆژ و ساڵ و بۆ بەرێچوون و ناو و ناو بانگە. هەڵسوران و کردەوەی ئێمە بە هیچ جۆر لە گەڵ کردەوە و خەسڵەتی تێکۆشەرێکی شۆرشگێر نایەتەوە. ئەگەر بە ویژدانێکی حیزبی و شەرافەتی شۆرشگێری لە ساڵی ۱۹۷۳ وە، یانی لە پاش کۆنگرەوە سەرنجێکی کار و تێکۆشانی خۆمان بدەین، نەک هەر هەنگاوێک نە چووینە پێش، بەڵکوو بۆ دوایەش گەراوینەوە و لەسەر سوێی هەڵدێران و پەرش و بڵاوی راوەستاوین. رەنگە زۆربەی برادەران هەست بەو راستی یە بکەن. کە وا بوو با تۆزێک بیر لە کردەوەی ئەو چەند ساڵەی دواییمان بکەینەوە تۆزێک لەو ناوەی خۆمان و لە میللەتەکەمان شەرم بکەین. با بە روحێکی شۆرشگێری و شەرافەتی حیزبی چاوێک بە هەڵسوران و کردەوەی خۆماندا بخشێنین. ئەگەر دەزانین پیاوی ئەم مەیدانە نین. با وازبێنین و لانی کەم ئەو شەرەفە بۆ خۆمان بپارێزین کە سەودامان بە چارە نووسی گەل نە کردبێ و سیاسەتمان تەنیا نە کردبێتە وەسیلەی ژیان و بەرێچوون و ناو لە خۆنان............ »

دوای خوێندنەوەی نامەی کەریمی حسامی دوکتور قاسملوو دەڵێ :«... نووسینی ئەم نامەیە بە بێ دیاریکردنی رێگا چارە تێکدانی حیزبە. مەسەلەش هێندە پڕ لە مەترسی نیە کە یان دانیشین یا خۆ بە ئاگر د ابدەین. لە بارەی ئەم وەزعە کە پێکهاتوە من خۆم لە هەموان زیاتر بە تاوانبار دەزانم.»

کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی پاش ۳ رۆژ دم بەدمە ئەم بریارانەی خوارەوە دەدا کە هیچیان ئەنجام نادرێن.

۱ - پێکهێنانی کۆنفرانسێکی حیزبی لە ماوەی سالێکدا.

۲ - هەلبژاردنی کومیتەیەکی پێنج کەسی بە ناوی دەفتەری سیاسی بۆ بە جێهێنانی کۆنفرانس و راپەراندنی نەخشەی( سیا ـــمی ) درێژە پێدانی کاری چاپەمەنی و پێوەندی یەکانی دەرەوە.

۳ - لە ماوەی سالێکدا حیزب بەرە بەرە لە بەغدا بگوێزێتەوە.

ئەم کۆبوونەوە و بریارانە هیچ گۆرانێک بە سەر نا تەبایی نێو کومیتەی ناوەندی و تێکۆشانی حیزبدا ناهێنن. رۆژی ۱۹۷۷/۸/۲ ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بلاوەی دەکەن. لە مێژووی کۆبوونەوەکانی کومیتەی ناوەندي دا، ئەوە یەکەم جار بوو کەنەنووسرا:« **کۆبوونەوە بەسەرکەوتنەوە کۆتایی هات**

لە راستیشدا نەک هەر بە سەر کەوتنەوە کۆتایی نە هات، بەلکوو رێبەرایەتی حیزب بۆ راپەراندني کارو باری حیزبی ئیفلیج دەبێ. دەفتەری سیاسی لە ٥ کەس هەلدەبژێردرێ کە دوو کەسیان لە ئوروپا دەمێننەوەو سێ کەسیش لە عیراق دەبن. لە ئەنجامدا دوکتور قاسملو و ئەمیری قازی لە نامەیەکدا بۆ کومیتەی ناوەندی دەنووسن: « بۆرۆی سیاسی نە لە عیراقە و نە لە ئوروپا، ئەگەر هەموویان لە یەک جێ بن ئەو دەم بۆرۆی سیاسین.»!!

هەر چەند کۆبوونەوەی پاریس نا توانێ نا کۆکی نێو کومیتەی ناوەندی چارە سەر بکات، بەلام هەر تک بەشی دەفتەری سیاسی بۆ نەوەستانی تێکۆشانی حیزب ئەوەی لە دەستیان بێ دەیکەن، بێ ئەوەی گرێ کوێرەی ئەم قەیرانەیان کردبێتەوە.

کابرایەکی سیاسی ئێرانی بە ناوی حەسەنی ماسالی کە بە ناوی جبهەی میللی ئێران لە ئوروپا و عیراق و یەمەن و لیبی وهەموو دنیا دەسوراوە، پێشنیار بە دوکتور قاسملو دەکات کە سەرێکی لیبی بدا، چونکە ئەو لە لیبی بەخێری خۆی باسی حیزبی دیموکراتی کردوە.! لە پاریس دەفتەری سیاسی دێتە سەرئەم باوەرە

کە چوونی دوکتور قاسملو بۆ لیبی هیچ زیانێکی نابێ. لە سەر ئەم بۆ چوونە دوکتور قاسملو دەچێتە لیبی و سەفەرەکەی دەکەوێتە مانگی رەمەزان. دوای گەرانەوەی لە نامەی ۱۹۷۷/۹/۱٤دا بۆ کەریمی حسامی دەنووسێ :«... ولاتێکی زۆر موسوڵمانە. بە رۆژ خەڵک تا سەعاتی یەک دیار بوون، پاش نیوەرۆ کەس دیار نەبوو. بەر پرسە راستە خۆ یەکەم دیت. نیزیکەی دوو سەعات پێکەوە دواین. پاشان لە سەر رابردووی حیزب و داواکانمان شەش لاپەرەی تایپم نووسی. بریار وایە مانگێکی تر خەبەرمان بدەنێ. بە لە بەر چاوگرتنی وەزعی ولاتەکە پێم وایە دوو کەس بنێرین دەفتەری ئێمە لە وێ ئیدارە بکەن. چونکە عەرەبی زانین لەوێ زۆر مهیمە، پێشنیار دەکەم ماموستا مەلا عەولا و جەلال بچن بۆ ئەوێ. دیارە ئەگەر ماموستا قبوڵ بکا. پێم وایە دەبێ زۆر ئیسرار بکەین کە قبوڵ بکا. چونکە زۆر بە قازانجی ئێمە تەواو دەبێ. وەزعی لە وێ لە هەموو بارێکەوە لە عیراق باشتر دەبێ. خانوی دەدەنێ وماشێنیشی دەدەنێ چونکە عەرەبی دەزانێ زۆر بە کارمان دێ. دەتوانێ ماڵەکەشی بەرێتە وێ. بە کورتی دەبێ هەوڵ بدرێ ماموستا قبولی بکا. بە تایبەت کە وەزعی عیراق هیچ مەعلوم نیە چی لێ دێت و پێوەندی یان لەگەڵ ئێمە دەگاتە کوێ. بە کورتی چەند رۆژان بە رۆژو بووم، بزانم نەتیجەی دەبێتە چی.؟»

لە سەر پێشنیاری دوکتور قاسملو دەفتەری سیاسی داوا لە مەلا عەولا دەکات کە بۆ چوونی لیبی لە کاتی پێویست دا موافەقەت بکا. ناو براو کە ئەو دەم لە ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی ئیستعفای دابوو، ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی کوردستان و کۆڤاری تێکۆشەر بوو. لە جیاتی قبوڵی پێشنیاری دوکتور قاسملو ئەمجارە بە نووسینی ئەم نامەیەی خوارەوە واز لە ئەندامەتی دەستەی نووسەرانی چاپەمەنی حیزبیش دێنێ. چونکە لە رۆژنامەی هاوکاریدا جێگای خۆی خۆش کردبوو. *

---

*ئیستیعفانامەی مەلاعەولای حەیاکی

« بۆکومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستان (ئێران)

لەگەڵ ڕێزوحورمەت. لەبەر وەزعێکی روحی وجسمی کەتێیدادەژیم تکادەکەم ئیستیعفای من لەئەندامەتی دەستەی نووسەرانی (کوردستان وتێکۆشەر) قبوڵ بکەن. ئاواتەخوازی سەرکەوتنتانم. عبدالله حەسەن زادە . ١٠/١٠/ ١٩٧٧

دوکتور قاسملو لە نامەی ٢١/١٠/٩٧٧ بۆ دەفتەری سیاسی دەنووسێ :«....لە سەر ماموستا ئەگەر ئەوەی من پێشنیارم کردوە بۆ لای مام هۆمەر قبولی نەکا، ئەزەرم ئەوەیە سەر بەستە ئەگەر دەیەوێ لە مەسئولیەت بکشێتەوە، دیارە هۆی ئەساسی ئەو کارە نازانم چیە، بەڵام بە راستی حیزبایەتی بە زۆری نابێ.»

ناستەنگی و گیرو گرفتی کومیتەی ناوەندی لە عیراق تەنیا فشاری حکوومەتی عیراق نەبوو کە دەیویست بە گژ بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستانی عیراقیان دابکات. زیز بوونی نۆر بە نۆرە و جینگەنەیی مەلاعەولای حەیاکی، وەهەڵوێستی دژ بە کوردی دەستە و تاقمی سەر بەبزوتنەوەی کوردستانی عیراق و ئیعدامی ئەندامانی حیزب لە بەندیخانەکانی ڕێژیمی بەعس، دەبنە سەرباری ناکۆکی و تەنگ وچەڵەمەی سەررێگای تێکۆشانی کومیتەی ناوەندی.

رۆژی ٢١/٩/١٩٧٧ دوو ئەندامی حیزبی دێموکرات،( کەریم ئەستانی وئەحمەد ئەستانی) لە نیزیک سنووری ئێران لە ناوچەی پشدەر تووشی دەستەیەکی چەکداری یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەبن بە سەرۆکایەتی ساڵحی دەروێش قادر و فەقێ قادری گوری. ئەو دەست دەیانگرن ٥٠هەزار تمەنی پارەی ئێرانیان پێ دەبێ لێ یان دەستێنن و باڵیان دەبەستن و دەیانبەن لە پاسگای (بەردەپان) دەیاندەنەوە بە ژاندارمەری ئێران و تا روخانی ڕێژیمی پاشایەتی لە بەندیخانەدا دەمیننەوە، ئیتر ئاشکرا بوو ئەوانەی بۆ بوژاندنەوی بە قەولی خۆیان( شۆرشی نوێ) هاتبوونەوە کوردستان، یەکیش لە ئەرکی نا پیرۆزیان هاو کاری لە گەڵ ژاندارمی حکوومەتی تاران بوو. بۆ لێدانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ١/١٠/١٩٧٧ بەم بۆنەوە

ئەم ڕاگەیاندنەی خوارەوە بڵاو دەکاتەوە:

## ڕاگەیاندنێک لەلایەن بوروی سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە

لەساڵەکانی ڕابردوودا ،لەماوەی سەرۆکایەتی جوڵانەوەی گەلی کورد لەکوردستانی عیراق لەگەڵ ڕێژیمی شادا، بەرانبەربەخەباتکەرانی کوردی ئێران زۆرکاری نارەوا کران کەیەکێک لەوانە گرتن و تەسلیم کردنەوەیان بە جەلادانی ڕێژیمی شابوو. هێزە پێشکەوتوەکانی کوردستانی عیراق لە کاتی خۆیدا بە تێکڕایی ئەو کردەوەیان مەحکوم کرد. پاش هەرەس هێنانی سەرکردایەتی بارزانی ئەم کارە لە هەموو لایەکەوە بە یەکێک لە لاپەڕە ڕشەکانی مێژووی ئەم جوڵانەوەیە داندرا.بە داخەوە هێندێ کەس لە مێژوو تەجرویەیان وەر نەگرتوەو ئێستاش نۆکەرایەتی ڕێژیمی شایان بەئەرکی خۆیان داناوە.

شەوی ٣٠/٦/١٣٥٦– ٢١/٩/١٩٧٧چەند خۆفرۆشی چەکداری کوردستانی عیراق بە سەرۆکایەتی صالحی دەروێش قادر و فەقێ قادری کوری توشی دوو کوردی نیشتمانپەروەری کوردستانی ئێران بەناوی کەریم نەستانی و ئەحمەد نەستانی هاتون و پاش ئەوەی ڕوتیان کردوون، ٥٠هەزار تمەنیان لە ئەستاندوون، باڵیان بەستوون و بردوویاننە پاسگای بەردەپان و تەسلیمی حکومەتی ئێرانیان کردوون.

ئەم دوو نیشتمانپەروەرە کە پترلە دەساڵە لە سەرئازادیخوازی وخەباتی دژی ڕێژیمی شا دەربەدەر بوون و لە لایەن ڕێژیمی پۆلیسی و دیکتاتوری شا ڕاو نراون، بە دەستی چەند کوردی خاین و خۆفرۆش گیراون و بە دیاری دراونەوە بە حکومەتی کۆنەپەرستی ئێران و ئێستا گیانیان لە مەترسی دایە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە کاتێکا ئەو کردەوە بێشەرمانەیە بەتوندی مەحکووم دەکا، بە مافی خۆی دەزانێ کە لە دوا ڕۆژدا هاندەر و دەستکیسی ئەو تاوان و خۆفرۆشی یە بە گەلی کورد بناسێنێ و دڵنیایە کە گەلی کورد لە

کوردستانی ئێران لە کردەوەی خائینانەی ئەو تاوانبارانە خۆش نابێ و بەسزای خۆیان دەگەیێنێ.

**بوروی سیاسی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.... ١٣٥٦/٧/١٠» (١٦)**

سەیر ئەوەیە پاش ماوەیەک کە دوکتور قاسملو لە ئوروپا رەخنە لەیەکیتی نیشتمانی دەگرێ، رۆژنامەی «دەنگی یەکیتی» بڵاوکەرەوەی (یەکیتی نیشتمانی) لەدەرەوە سەبارەت بەم رووداوە دەنووسێ :« **تاوانبارانی ئەم رووداوەیە حوکمی جەماوەری زەحمەتکێش و شۆرشیان بە سەردا جێ بەجێ کراوە و گوللەباران کراون** » دوکتور قاسملو لە نامەیەکدا دەنووسێ: لە م مەسەلەیە بکۆڵنەوە، ئەگەر ئەو تاوانبارانە نە کوژرابن، لە سەر ئەو خەبەرەی «دەنگی یەکیتی» بەیانێک بڵاوبکەنەوە.

دوای لێکۆڵینەوەو وە دواکەوتن، دەردەکەوێ کە «دەنگی یەکیتی بە درۆ ئەم خەبەرەی بڵاو کردۆتەوە. دوو کەس لە تاوانبارەکان ساواک بردوونی بۆ خوارووی ئێران. سەر دەستەکەشیان سالحی دەرویش قادری لە نێو جەماعەتی یەکیتی نیشتمانی یە و نان بۆ (شۆرش) دەکا. دەفتەری سیاسی لەم بارەشەوە روونکردنەوەیەک بە تاریخی ١٩٧٨/٣/٢٥ لە رۆژنامەی کوردستاندا بڵاودەکاتەوە.

سەرەرای کردەوە و هەڵوێستی چەوتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ئاست **حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، دیسان دوکتور قاسملو لە ئوروپا لە گەڵ** نوێنەرانی یەکیتی نیشتمانی پێوەندی دۆستانە و هاوکاری دە پارێزێ و ئەوەش دەبێتە بیانووی حکوومەتی بەغدا بۆ فشاری زیاتر بۆ سەرکومیتەی ناوەندی. حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە عیراق دەژیا.

# هەنگاو بۆ هاوكاری حیزبە كوردستانی یەكان

لە ئوروپا دوكتور قاسملو لەگەڵ دووكتور مەحمودعوسمان (كە ئەودەم لیژنەی ئامادەیی پارتی) پێكهێنابوو، و یەكێتی نیشتمانی كوردستان دەگەنە ئەم بڕوایە كە لە گەڵ حیزبە كوردی یەكانی سوریا و یەک دوو حیزب یا ڕێكخراوی كوردی توركیا كۆبوونەوەیەک پێک بێنن لە سەر ستراتیژی یەكگرتووی كورد قسەبكەن وكاری بۆ بكەن. بۆ ئەو مەبەستە ئەمیری قازی بە بێ ئاگاداری كومیتەی ناوەندی وەک نوێنەری حیزبی دێموكرات دەچێتە بێروت و سوریا و لە گەڵ نوێنەرانی یەكێتی نیشتمانی كوردستان و لیژنەی ئامادەیی پارتی دێموكراتی كوردستان (دوكتورمەحمودعوسمان) و حیزبی دێموكراتی پێشكەوتووی كوردی لە سوریا و حیزبی دێموكراتی كوردستانی سوریا(الپارتی) و حیزبی دێموكراتی چەپی كورد لە سوریا كۆ دەبنەوەو دەگەنە ئەم بڕیارانەی خوارەوە:

«... ڕۆژی ٢ی دیسامبری ١٩٧٧ حیزبە پێشكەوتوەكانی كوردستان بە بەشداری ئەم حیزبانەی خوارەوە كۆبوونەوەیەكیان لە بێروت پێكهێنا: حیزبی دێموكراتی كوردستانی ئێران، یەكێتی نیشتمانی كوردستان ، پارتی دێموكراتی پێشكەوتووی كورد لەسوریا ، پارتی دێموكراتی كوردستان ( لیژنەی ئامادەیی) عیراق ، پارتی دێموكراتی كوردستانی سوریا، حیزبی دێموكراتی دەستەی چەپی كورد لەسوریا. نوێنەرانی ڕێكخراوی(هەورا) و پارتی شۆڕشی میللی كوردستان، بەهۆی هەل و مەرجی تایبەتی خۆیانەوە نەیانتوانیبوو بەشداری بكەن. كارو باری كۆبوونەوە بەسێ دەقیقە ڕاوەستان بە ئیحترامی گیانی شەهیدە نەمرەكانی گەلی كورد، كرایەوە. پاشان یەكێک لە هاوری یان سەرۆكایەتی كۆبوونەوە و دوو هاورێی تر

دارشتنی بڕیارەکانیان گرتە ئەستۆ. ئەمجارە هاوری یان نوێنەرانی حیزبەکان بە گیانێکی هاوری یانە و بە هەست کردن بەو مەسئولیەتە مێژوویەی کە لەم هەل ومەرجەدا کە گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان ، بە تایبەتێ لە کوردستانی عیراق پێیدا تێدەپەڕێ. دەکەوێتە سەرشانی ئەم حیزبانە، وتو وێژی خۆیان دەربارەی ئەو مەسەلانەی هاتبوونە گۆڕێ دەست پێکرد وئەم بڕیارانەی خوارەوەی دەرکرد:

١ - ئەم کۆبوونەوە و کارەکانی یەکجار نهێنێ دەبن

٢ - لە لایەن حیزبەکانی بەشداری کۆبوونەوە لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەسەر ئەم نوختانەی خوارەوە دەکرێ و دەدرێ بە کۆبوونەوەی داهاتوو:

ئەلف - هەڵسەنگاندنی بزووتنەوەی کورد لە قۆناخی رابردوودا بەگشتی و هی کوردستانی عیراق بە شێوەیەکی تایبەتی

ب - لێکدانەوەی وەزعی بزووتنەوەی کورد لە قۆناخی ئێستادا

ج - لێکدانەوەی وەزعی گشتی ئەم وڵاتانەی کوردستانیان لە نێو د بەشکراوە

د - لێکدانەوەی وەزعی جیهانی و بەتایبەتی وەزعی ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەراست

٣ - کۆبوونەوەی داهاتوو لە مانگی ئەوریلی ١٩٧٨ بەشێوەیەکی مەبدەئی لە کوردستانی عیراق دە بەسترێ.

٤ - لیژنەیەک لە هاورێ یانی نوێنەرانی ئەم حیزبانەی خوارەوە پێکهات

ئەلف - یەکێتی نیشتمانی کوردستان

ب - پارتی دیموکراتی پێشکەوتوی کورد لەسوریا

ج - پارتی دیموکراتی کوردستان( لیژنەی ئامادەیی عیراق)

ئەرکی ئەم لیژنەیە چاوەدێری جێ بەجێ کردنی بڕیار و راسپاردەکانی ئەم کۆبوونەوەیە دەکا تا کاتی کۆبوونەوەی داهاتوو، هەروەها پێوەندی گرتنە بە پارتی شۆڕشی میللی کوردستان و رێکخراوی (هەورا) بۆ پێراگەیاندنی بڕیارو راسپاردەکانی کۆبوونەوە.

٥ - هەموو لایەنێک دەستەیەکی نوێنەرایەتی لە پلەی بەڕێوەبەریدا دەنێرێ بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو کە لە دوو ئەندام زیاتر نەبێ.

٦ - پشتگیری شۆڕشی کورد کە ئێستا لە کوردستانی عیراق هەڵگیرساوە بە هەموو ئیمکاناتێک هەروەها کۆبوونەوە ئەم راسپاردانەی خوارەوەی بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو دەرکرد:

١ - قبول کردنی ئەو بەرنامە کارەی کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەربارەی ستراتێژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد پێشکێشی کردوە.

٢ - دامەزراندنی لیژنەیەک بە ناوی (لیژنەی خەباتی نیشتمانی کوردستان) بۆ رێکخستنی خەباتی ستراتێژی هاو بەش لە نێو حیزب و رێکخراوە پێشکەوتوەکانی کوردستاندا.

٣ - ئەگەر بریارێکی گرنگ دەربارەی دوارۆژ و چارەنووسی شۆڕشی کورد لە کوردستانی عیراق بدرێ. کۆبوونەوە بە پێویستی دادەنێ کە پێش دەرکردنی بریارەکە رای هەموو حیزبە کوردستانیەکان وەربگیرێ.

هەموو لایەنەکانی بەشداری ئەم کۆبوونەوەیە نوسخەیەکی ئەم سورەتە جەلەسە و پاشکۆیەکانیان وەرگرت.»

**برنامەی کار کە دوکتو رقاسملو دایرشتوە و پێشکێشی کردوە:**

« .. بۆ کۆبوونەوەی رێکخراوە کوردستانیەکان :

سەرەتا : شەرتەکانی هاوکاری :

١ - نهێنێ راگرتنی کۆبوونەوە ــ بایەخدان بە باری هاوکاری راستەقینە نەک باری پروپاگاندە

٢ - بە ئیخلاس و بە دڵەوە و راست و رەوان هاوکاری کردن.

٣ - وەلا نە نانی هیچ هێزێکی پێشکەوتوو لە هیچ پارچەیەکی کوردستان

٤ - روونکردنەوەی ناوەرۆکی « یەکێتی نیشتمانی» ئایا هی هەموو کوردستانە؟ ئەگەر نا بۆ چی کوردی ئێران و سوریای تێدایە؟ بردنی ئێرانی بۆ کوردستانی عیراق بۆ ناو پێشمەرگە بۆ چی یە؟

٥ - روونکردنەوەی پێوەندی یەکێتی نیشتمانی لە گەڵ رێژیمی ئێران و مەترسی پێکهێنانی ئەو پێوەندی یە. تەحویلدانەوەی دوو برادەری ئێمە ــ مەسەلەی برایم ئەحمەد.

ئامادەکردنی کۆبوونەوەی داهاتوو

١ - لە بەهار زوو ترنەبێ.

٢ - موافەقەت کردن لە سەر پێشنیارەکانی ئێمە و ئەساسی پێشنیارەکان

٣ - ئەوەی لە کۆبوونەوەدا بریاری لە سەردەدرێ دەبێ لە لایەن بەرێوەبەری رێکخراوەکانەوە پەسند بکرێ.

٤ - جێگاو وەختی کۆبوونەوە بە تەواوی تهێنی بێ

پێویستی دانانی یەک ستراتێژی

مەبەست لە ستراتێژی گشتی چی یە؟

١ - رێککەوتن لە سەر سیاسەتێکی گشتی درێژ خایەن.

٢ - لێک گرێدانی تێکۆشان لە دەرەوەی کوردستان.

٣ - دامەزراندنی پێوەندی یەکی رێک وپێک

٤ - لە هەل و مەرجی ئێستا دا هەڵبژاردنی لە بارترین پارچەی کوردستان بۆ زەبر وەشاندن و یارمەتی بەو بەشە.

٥ - چونکە هەل و مەرجی سیاسی لە هەر کام لەو وڵاتانەدا کە کوردی تێدا نیشتەجێ یە جیاوازە، مومکین نیە یەک تاکتیک و یا یەک سیاسەتی رۆژ بۆهەموو جوڵانەوەی کورد دیاری بکرێ، بۆیە هەر رێکخراو و حیزبێک تاکتیکی سەربەخۆی خۆی و سیاسەتی رۆژی خۆی هەیە.

سیاسەتی درێژ خایەن دەبێ چلۆن بێ.

١ - پشت بەستن بە کۆمەڵانی گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان.

٢ - رێکخستنی جوڵانەوەی گەلی کورد بەگشتی لە سەربارێکی پێشکەوتو و دیاریکردنی دۆست و دوژمن.

٣ - سیاسەتی زووڕەوەی جوڵانەوەی کورد.

ئەلف- لە کوردستان جوڵانەوەی پێشکەوتوو - جوڵانەوەی زەحمەتکێشانە و بۆ جێ بەجێکردنی داخوزەکانی ئەوان خەبات دەکا.

ب - پێوەندی ئورگانیک لە نێوان گیرو گرفتی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی.

ج - دامەزراندنی پێوەندی هاوکاری و یەکێتی و کردەوە لە گەڵ هێزە پێشکەوتوەکانی ئەم وڵاتانەی کە کوردی تێشتە جێ یە.

**لە بارەی سیاسەتی دەرەوە**

دۆستایەتی و هاوکاری لە گەڵ وڵاتانی سوسیالیستی و هەموو هێزە پێشکەوتوەکانی جیهان لەمبارەوە سێ ئەرکی گرنگ پێویستن:

١ - راکێشانی سرنج و پشتیوانی یەکێتی سۆفێتی بۆ گیرو گرفتی کورد بە گشتی نەک هەر لە یەک پارچەی کوردستان.

٢ - دامەزرانی پێوەندی وراکێشانی سرنج وپشتیوانی هەموو رێکخراوەکانی سوسیالیستی و دیموکرات و حیزبە کۆمونیستەکان و سۆسیالیستەکان و سۆسیال دیموکراتەکان.

**٣ - دابەزاندنی ستراتیژی لە هەل و مەرجی ئێستادا.**

ئەلف - خەبات بۆ زاڵکردنی رێبازی پێشکەوتوو لە جوڵانەوەی گەلی کورد دا

١ - رەدکردنەوەی بە تەواوی رێبازی بارزانی نە وەک رێبازی شەخسێک، بەڵام وەک رێبازی ناسیونالیستی کۆنە پەرست و هاو کاری رێژیمی شاو ئیمپریالیزم.

٢ - کوردستانی عیراق بۆ بنکەی جوڵانەوەی کورد لە باری سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە لە بارە، بەڵام لە باری جوغرافیایی یەوە نالەبارە.

بێجگە لەوە حکوومەتی عیراق تەنیا حکوومەتێکە کە ئیعترافی بە خودموختاری گەلی کورد کردوە و لە دەرەوەش لە لای وڵاتانی سۆسیالیستی وحیزبە سۆسیالیست و کۆمونیستەکان بە حکوومەتی پێشکەوتوو ناسراوە. لە دەرەوە زۆر جار لە لایەن دۆستانی گەلی کوردەوە ئەم پرسیارە دێتە پێش کە بۆچی جوڵانەوەی چەکداری گەلی کورد هەرلە عیراق کۆ کراوەتەوە.؟

٣ - به بیرو رای ئێمه کوردستانی ئێران له هەل و مەرجی ئێستادا پارچەیەکه له کوردستان که نوختەی زەعفی دوژمنه.

٤ - رێژیمی ئێران به کۆنەپەرستترین رێژیمی ناوچه ناسراوه. دۆستانی ئێمه (ولأتانی سۆسیالیستی و هێزه پێشکەوتوەکانی جیهان) لێی بێزارن .»(١٧)

ئەم هەنگاوەی دوکتورقاسملو له ئوروپا. جگه لەوەی هیچ بەرهەمێکی هەست پێکراو و له باری به دوادا نەهات، له عیراق گێروگرفتی تازه بۆ کومیتەی ناوەندی ساز دەکات. کومیتەی ناوەندی لەم هەنگاوه و لەسەفەری ئەمیری قازی بۆ بێروت وسوریا بێ ئاگا دەبێ. بەلأم دیار بوه سەرەرای ئەوەی فره له سەرنهێنێی کاری پێداگیراوه، حکوومەتی عیراق ئاگاداری ئەم کۆبوونەوەیه دەبێ. رۆژی ١٩٧٧/١٢/٢٥ له لایەن مخابەراتی عیراقەوه سەفەری ئەمیری قازی و کۆبوونەوەی حیزبه کوردی یەکان له بێروت به نوێنەری حیزبی دێموکرات رادەگەیێنرێ و پێی دەگوترێ: «... سکرتێری حیزبی ئێوه له ئوروپا دژی ئێمه دەجولێتەوه. ئێوه ناتوانن له عیراق بژین و دژی ئێمەش کار بکەن . به توندی داوا دەکات ودەڵێ: دەبێ له عیراق وه دەرکەون »

رۆژی ١٩٧٨/٨/١ کومیتەی ناوەندی مەوجود له عیراق کۆ دەبێتەوه و به تێکرایی دەنگ جگه له یەک کەس، دەگاته ئەم بریاره که نه چێته ژێر باری فشاری حکومەتی عیراق و بگەرێتەوه بۆ کوردستانی ئێران و خەباتی خۆی درێژه پێ بدات. نامەیەکیش بۆ دوکتورقاسملو دەنووسرێ و بریار دەدەن کەریمی حسامی بچێته پاریس و له گەڵ دوو ئەندامی دیکەی دەفتەری سیاسی له مەسەلەکان بکۆڵنەوه. حکومەتی عیراق و یا بڵێین مخابراتی عیراق جارێکی تر داوا دەکات که حیزبی دێموکرات هەڵوێستی خۆی روون کاتەوه وەلأمی بدرێتەوه. لەوەلأم دا پێی دەگوترێ :« کومیتەی ناوەندی بریاری خۆی داوه. تەنیا ماوەتەوه له گەڵ سکرتێری گشتی باس بکرێ. بۆ ئەم کارەش کەریمی حسامی دەچێته پاریس و له گەرانەوەدا پێتان رادەگەیێنین.

رۆژی ١٩٧٨/٢/٥ دوو ئەندامی دەفتەری سیاسی له گەڵ سکرتێری حیزب بۆ

باس و لێکۆڵینەوە لە پاریس کۆدەبنەوە.

لە پلینۆمی کومیتەی ناوەندی لەپاریس، پێشتر بریارێکی وا دەدرێ کە دوکتورقاسملو و ئەمیری قازی بە نۆرە سەرێکی تورکیا بدەن و بۆ جێ پێیەک و یا دۆزینەوەی رێگایەک بۆ کوردستانی ئێران سۆنداژێک بکەن. دوکتور قاسملوو لە راپۆرتی سەفەرەکەیدا دەڵێ :« لەم سەفەرە دا بۆم دەرکەوتوە کە دەگرێ لە تورکیا جێ پێیەک خۆش بکەین و رێگای پێوەندی وهاتوو چۆ بۆ کوردستانی ئێران بدۆزینەوە.»

کاک ئەمیری قازی لە راپۆرتی سەفەرەکەیدا بۆ چوونێکی دیکەی هەیەودەڵێ :
«... حیزبە سیاسی یەکانی کوردی تورکیا لە سەر سنوور نفوزیان نیە. لە نێو عەشیرەتە کوردەکاندا ناکۆکی هەیە. سازمانی ئەمنیەتی تورکیا دەستی خستۆتە نێو عەشیرەتە کوردەکانی تورکیا. کوردەکانی تورکیا هاتوو چۆی ئێرانیان زۆرە، بەڵام پتر قاچاغی دەکەن. مەسەلەی زمانیش بۆ ئێمە دژوارە. لەم ناوچەیە شرمخۆر زۆرن و جاسوسی دەکەن. لە حاڵی حازردا لە بەر نە بوونی شارەزایی نابێ حسابی زۆری لە سەر بکەین کار کردن لە تورکیا دژوارە.»

بۆچوونی ئەمیری قازی پتر لە گەڵ واقعیەت وبارودۆخی کوردستانی تورکیا دەهاتەوە. هەربۆیەش کاتێ داوا لەدوکتور قاسملودەکرێ کە بۆ ئامادەکردنی هەل ومەرجی تێکۆشان لە تورکیا بۆ ماوەیەک بچێتە ئەوێ، مەسەلەکە دەخاتە پشت گوێ وئەم گەلاڵەی خوارەوە ئامادە دەکات.

پاش باسێکی دوو رۆژە، دوکتور قاسملو بۆ چارەسەری گیروگرفت و دەر بازبوون لەناستەنگی وقەیرانی کومیتەی ناوەندی ئەم گەلاڵەی خوارەوە ئامادە دەکات ودەڵێ:«... پێویستە برادەرانی کومیتەی ناوەندی تەماشای بکەن و بەنەزەری من تاقە رێگای عیلاجە.

**دەقی گەلاڵەی دوکتور قاسملو:**

• لەسەر هەڵوێستی تازەی حکوومەتی عیراق.

١ - بە لە بەر چاو خستنی سیاسەت و هەڵوێستی رابردووی حکوومەتی عیراق

ئەم وەزعە چاوەروان دەکراو شتێک نی یە کە ئێمەی غافڵگیر کردبێ.

**٢ - هۆیەکانی ئەم هەڵوێستە ئەمانەن:**

ئەلف - ئەم هەڵوێستە لە پێشدا نەتیجەی مەنتیقی سیاسەتی گشتی عیراقە کە بریتی یە لە خۆ نیزیک کردنەوە لە ئێران و وڵاتەکانی رۆژئاوا.

ب - چارە سەرنەکردنی گیرو گرفتی کورد لە عیراق و بەرێوە بردنی سیاسەتێکی شۆڤێنیستی بەرانبەر بە گەلی کورد لە عیراق و تەنانەت ترس لەوە کە خەباتی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان پەرەبستێنێ.

ج - ئەم هۆیانە کە نوێنەرانی حکومەتی عیراق باسی دەکەن بیانوە و تەنیا دەتوانین بە هۆی جەنبی دابنێین کە هەڵوێستی حکومەتی عیراقی وەپێش ختسوە.

**٣ - بۆ چوونی ئێمە ب ۆچارە سەرکردنی وەزعی خۆمان :**

ئەلف - دەبێ هەموو گیرو گرفتەکان بە شێوەیەکی ژیرانە و لە سەر خۆو بێ خۆدۆڕاندن چارە سەر بکرێن.

ب - هەموو هەوڵێک بەکار بهێنرێ بۆ ئەوە تێکۆشانی حیزبیمان نەک هەر پاش نەکەوێ بەڵکوو لە مەودوا زیاتر پەرە بستێنێ.

ج - بۆ جێ بەجێکردنی بڕیاری کۆنگرەی ٣ کە شێوەی خەباتی چەکداری بە شێوەی ئەسڵی هەڵبژاردوە و هەر وەها دابەزاندنی تەرحی سیاسی و خستنە بەرچاوی نەزەری زۆربەی برادەران کە لە بەغدا کۆ بوونەتەوە باشترین ڕێگای حەل ئەوەیە کە ئەندامانی حیزب لە دەرەوە بە سێ بەش دابەش بکرێن.

بەشی یەکەم : ئەو ئەندامانەی کە لە بەر وەزعی تایبەتی خۆیان و لە بەر زۆری ماڵ و منداڵ ئیمکانی جوڵانەوەیان نیە، لە عیراق داوای پەنابەری سیاسی دەکەن.

بەشی دووهەم : ـــ پێنج هەتا شەش کەس جارێ لە دەرەوەی وڵات دەمێننەوە وسێ ئەرکیان لە پێش دەبێ::

ئەلف - دابینکردنی یارمەتی بە خەباتی ژوورەوە ماددی وسیاسی.

ب - پێوەندی لە گەڵ هێزە پێشکەوتوەکان بۆ راکێشانی پشتیوانیان.

ج - هەڵسوراندنی کارو باری پڕوپاگاندەو بڵاو کردنەوەی رۆژنامە.

د – دایر کردنی پێوەندی لە گەڵ ژوورەوە.

**بەشی سێ یەم :**

کە نیزیکەی ٣٠ تا ٤٠ کەس لە مەسئولەکان و ئەندامان دەگرێتەوە دەبن بە چەند دەستە بە چەکداری دەچنەوە وڵات بۆ دابەزاندنی تەرحی سیا ـــ می:

ئەلف – لە پێشدا دەبێ بگوترێ کە چوونەوە بەمجۆرە مانای شۆڕش نیە، تەنانەت ڕاپەڕینێکی چەکداریش نیە. مەسەل تەنیا بەکار هێنانی شێوەیەکی خەباتە کە کۆنگرەی سێ یەمی حیزب پەسندی کردوە.

ب – ئە ئەندامانە کە لە گەڵ موسئولەکانیان دەچنەوە دابەش دەکرێن بەچەند دەستەی گەڕۆک کە لە چەند ناوچەی هەڵبژاردراو دەست بە تێکۆشانی حیزبی دەکەن.

ج – لە قۆناخی یەکەمدا ئەوەندەی کە مومکین بێ دەستە گەڕۆکەکان خۆیان لەوە دەپارێزن کە بەرەنگاری دوژمن بن و ئەرکیان بریتی دەبێ لە:

– بڵاو کردنەوەی بیرو بڕوای حیزب لەناو دانیشتوانی کوردستانی ئێران

– پێکهێنانی بنکەی حیزبی لەو ناوچانەدا.

– دامەزراندنی پێوەندی لە گەڵ شارەکانی کوردستان.

– دامەزراندنی پێوەندی لە گەڵ دەرەوە

د – مەبەست دەبێ خۆڕاگرتن و سازکردنی بنکەی حیزبی بێ بە چەشنێک بەرە بەرە هەموو بەڕێوە بەرانی حیزب بۆ ژوورەوە بگوێزرێتەوە.

هـ – لە حاڵەتی مەترسیدا ئەم دەستە گەڕۆکانە بۆ خۆ پاراستن دەتوانن لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی عیراق و تورکیا کەلک وەربگرن. زۆربەی زۆری ئیمکاناتی ماددی حیزب بۆکارکردن لە ئێران تەرخان دەکرێت

ز – چوونەوەب ۆ وڵات دڵخوازە، هیچ کەس لە ئەندامان دژی ویستی خۆی نابێ بە ئەندامی دەستەی گەڕۆک

ح – ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بەم شێوەیە دابەش دەبن: هێندێ لەو ئەندامانە کە وەزعی تایبەتیان هەیە، یا لە بەر ماڵ ومنداڵ بەویستی خۆیان

دەتوانن ببن بە پەنابەری سیاسی. جارێ ٣ ئەندامی کومیتەی ناوەندی ( دوکتور قاسملو، حەمەدەمینی سراجی، حەسەنی شەتەوی) لە دەرەوە دەمێننەوە بۆ ئەم کارانەی کە لە پێشدا دیاری کراون. قاسملو کاری رۆژنامە و پێوەندی بەڕێوە دەبا. سراجی لە بێروت دەبێ و بەرپرسی گەیاندنی یارمەتی بۆ ژوورەوە دەبێ شەتەوی لە پاش پێکهاتنی بنکە لە کوردستان و جێگیر بوونی سیاسی لەوڵات دەچێتەوە. هەروەها کە بەڕێوە بەرایەتی گوێزرایەوە بۆ ژوورەوە قاسملو وسراجیش دەچنەوە. برادەرانی تری کومیتەی ناوەندی ئێستا لە گەڵ ئەندامانی حیزب بۆ بەڕێوە بردنی دەستە گەڕۆکەکان دەچنەوە وڵات.» (١٨)

کاک ئەمیری قازی لە گەڵ گەلالە و بۆ چوونی دوکتورقاسملو ناکۆکە. ئەویش لە گەڵ گەڕانەوەی کومیتەی ناوەندی بۆ کوردستانی ئێران ودرێژەی خەبات ئەم شەرت ومەرجانە پێشنیار دەکات :

١ - بۆ ئەم کارە لانی کەم دەبێ رێبەرایەتیەکی یەکگرتوو هەبێ لە سەر بەجێگەیاندنی ئەو گەلاڵەیە. ئەو بەڕێوەبەری یە لە باری فیکری بەوە یەک بێ بۆ دەستپێکردنی ئەو کارە

٢ - لانی کەمی چەک کە بریتی بێ لە: ١٥٠ چەکی مودرنی دژی هێلیکۆپتەر. یەک میلیۆن تمەن پوڵ. لانی کەمی تەشکیلات. پێگە لەتاران وبۆکان وسەقز ومەهاباد.»(١٩)

دوای کۆبوونەوەی سکرتێری حیزب و دوو ئەندامی دەفتەری سیاسی کە بێجگە لە گەلاڵەی دوکتورقاسملو وپێشنیاری کاک ئەمیری قازی بەرهەمیک نادا!! بەدەستەوە ، ئەمجار پێشنیار دەکەن کە کەریمی حسامی بچێتە لوبنان وچاوی بەرێبەرانی فەلەستینی بکەوێ و سیاسەت و هەڵوێستی حکومەتی بەعسیان بۆ رون کاتەوە.

رۆژی ٧٨/٣/١٤ کابرای مخابەراتی عیراق بە کاوێژ کردنەوەی بەیت وباوی پێشوو داوای وەڵامی نهایی دەکات. لە وەڵامدا پێی دەگوترێ چەند رۆژی دیکە کومیتەی ناوەندی کۆ دەبێتەوە و بریاری نهایی تان پێ رادەگەیێنێ.

دەفتەری سیاسی مەوجود لە بەغدا دێتە سەر ئەو باوەرە کە کۆبوونەوەیەک بە بەشداری ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و کادرەکانی حیزب پێک بێنێ.

رۆژی ۷۸/۲/۱٦ بە بەشداری ۲۱کەس کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی وکادرەکان پێک دێت. دوای لێکدانەوەی نامەو گەڵاڵە و پێشنیاری دوکتور قاسملو کاک ئەمیری قازی، بە تێکرایی دەنگ، جگە لە یەک کەس دەگەنە ئەم بریارە کە نەچنە ژێر باڵپەستۆی حکوومەتی عیراق. ئەوکەسانەی کەدەفتەری سیاسی دیاریان دەکات، بگەرێنەوە بۆ کوردستانی ئێران. ۱٥٤ کەس ژن و منداڵ و چەند کەسی دیکە بکرێنە پەنابەری سیاسی و لە عیراق بمێننەوە.

۷٦کەس کادرو ئەندامەی کارا بۆ گەرانەوە و یاهەر کارێکی دیکە ئامادەو چاوەروانی بریاری کومیتەی ناوەندی دەبن و ئەگەر پێویست بوو، خۆ بەدەستەوە نادەن وخۆ دەشارنەوە.

دوای کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی لە نامەیەکدا بۆ دوکتور قاسملو دەنووسێ:«.. لە بارەی گەڵاڵەی نەزەری خۆت لەسەر وەزعی ئێستامان پێمان خۆشترە لە نیزیکەوە بۆ پیادە کردنی ئەم گەڵاڵەیە وەک رێبەری حیزب بەسەر ئیجرای بریارەکاندا چاوە دێرێت هەبێ...»

رۆژی ۹۷۸/٥/۱٥ لە سەر داوای مخابەراتی عیراق کەریمی حسامی و حەمەدەمینی سراجی چاویان بە سەعدون شاکر مودیری مخابەرات دەکەوێ. ئیتر ئەمجار بێ روو دەروایسی دەڵێ ؛« ئێوە دەبێ لە عیراق بچنە دەرێ. ئێوە هاوکاریمان ناکەن. سکرتێری حیزب لە ئوریا دژی ئێمە کار دەکا. ئێوە بوونە کۆسپی سەر رێگای پێوەندیی نێوان ئێمە و دەوڵەتی ئێران. قاسم دێتە لاتان و لە سەر چوونەدەرو کاتی رۆیشتنتان لە گەڵتان دەدوێ.»

رۆژی ۹۷۸/٥/۲۲ کابرای مخابەرات دەچێتە لای دەفتەری سیاسی ولە سەرئەوە رێک دەکەون کە۱۱کەس ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە عیراق بچنە دەرێ. حکوومەتی عیراق پاسپۆرتی ئێرانیان بداتێ و بلیتی فرۆکەشیان بداتێ و برۆن. ئەندامانی دیکە کەلە عیراق دەمێننەوە بکرێنە پەنابەری سیاسی.

رۆژی ۹۷۸/٦/۹ دوکتور قاسملو بە تەلیفون بەئەندامانی کومیتەی ناوەندی رادەگەیێنێ کە بۆ گەرانەوە بۆ ئێران و یا هاتنەدەر تالۆکەی مەکەن، لەوانەیە بتوانم سەرێکی بەغدا بدەمەوە.

لە ئوروپا دوکتور قاسملو لە ئەنجامی دانیشتن و وتوویژ لەگەڵ دوکتور مەحمودعوسمان، دێنە سەر ئەو باوەڕە کە دوکتور بۆ گەرانەوەی دوکتور مەحمودعوسمان لە گەڵ حکوومەتی عیراق قسە بکات. لە سەر ئەم بۆچوونە لەپاریس دەچێتە باڵیۆزخانەی عیراق ودەڵێ:

بۆئەوەی دوکتور مەحمودعوسمان بگەرێتەوە بۆ عیراق، پێویستە لەگەڵ رێبەرایەتی حیزبی بەعس قسە بکەم و پێشنیارەکانی دوکتورمەحمودیان پێ رابگەیێنم.»

دیارە حکوومەتی عیراق ئەوەی لە خوادەوێ. لە پێشدا کە رێگایان نەدەدا بەسەفەریش دوکتور قاسملو بێتەوە بەغدا ، ئەمجارە گورج لە گەڵ گەرانەوەی بێ ڤیزا موافەقەت دەکرێ. رۆژی ۹۸۷/۹/۱۵ دوکتور قاسملو دەگاتەوە بەغدا. لە بەغدا کاتێ باسی ئەوە دەکات کە دەیەوێ بۆگەرانەوەی دوکتور مەحمودعوسمان لە گەڵ رێبەرایەتی حیزبی بەعس وتو وێژبکا، لەلایەن ماموستاهێمنی رەحمەتی وحەمەدەمینی سراجی یەو بەتوندی دەکەوێتە بەر رەخنەو سەرکۆنە و پێی دەڵێن : ئێستا ئێمە هیچ کاری دیکەمان نەماوە، ئەوە نەبێ کە دەلالّی بۆبەعس بکەین وکوردەکانی عیراقی بۆ بێنینەوە و دەستەمۆ بکەین.؟ گەرانەوەی دوکتورقاسملو بۆبەغدا نەک هەر قەیرانی نێو کومیتەی ناوەندی چارە سەر ناکا، بەڵکوو قوڵتریش دەکات. لە سەروبەندی راپەرینی گەلانی ئێراندا هێندێ لەئەندامانی کومیتەی ناوەندی دەگەرێنەوە بۆ کوردستانی ئێران و قۆناخێکی تازە لەخەبات وتێکۆشانی حیزبی دێموکرات لە کەش و هەوایەکی تازە و هەل ومەرجێکی تەواو جیاوازدا دەست پێدەکات. لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و روونکردنەوەی خەباتی ئەم قۆناخە وساخکردنەوەی راست و چەوتی کردەوە وسیاسەتی رێبەرایەتی حیزبی دێموکرات و بەرهەمی خەباتی لەم قۆناخەدا. پێویستی بەکارێکی تایبەتی وبە تێکۆشانێکی

بەردەوام هەیە. بەو هیوایە لەبەرگی سێ یەمی پێداچوونەوەمدا، ئەوەندەی بکرێ توانای خۆم بۆ یارمەتی بە مێژوونووسانی مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی ئێران و بۆ روونکردنەوەی رووداوەکانی ئەم قۆناخە پڕلە کەندو کۆسپەی خەباتی نیشتمانی بەکار بێنم وبەڵکوو لەم رێگایەوە خزمەتێکم بە وریا بوونەوەی بەرەی تازە پێگەیشتووی گەلەکەمان کردبێ.

## سەرچاوەکان


١ – نامەی دوکتور قاسملو بۆ نووسەر
٢ – عبدالله حسن زادە، نیوسەدەتێکۆشان، ١٩٩٥ ، ل ، ٦٢
٣ – کەریمی حسامی لە بیرەوەری یەکانم، بەرگی سێ یەم ١٩٨٨ ل١٨٨ – ١٨٩
٤ – ر. کوردستان ، ژمارە ١، ژانویە، ١٩٧٠
٥ – عبدالله حسن زادە هەمان جێ ، ل ، ٦٣
٧ – سورە تجەلسەی کومیتەی سەرکردایەتی کاتی ح.د.ک. ١٩٧٠/٣/٣٠
٨ – هەمان سەرچاوە ، ١٩٧١/٥/١٣
٩ – ع. حسن ازدە ، هەمان جێ ، ل ، ٧١ ، ٧٢
١٠ – سەعید کاوە ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ، ٦٤ ، ٦٧ ، ٦٨
١١ – هەمان سەرچاوە ، ل ، ٨٢
١٢ – ع. حسن زادە ، ل ، ٣١
١٣ – نامەی نووسەر بۆ ئەمیری قازی ، ١٩٧٤/٥/٢١
١٤ – ع. قاسملو، تێکۆشەر، ژمارە ٢٧، ١٣٦٨ ، ل١٥
١٥ – ر. کوردستان، ژمارە ٣٤ ، ئوت وسپتامبر ، ١٩٧٤
١٦ – ر. کوردستان ، ژمارە ٥٠ نوامبر ١٩٧٧
١٧ – کەریمی حسامی، لە بیرەوەریەکانم، بەرگی ٥ ، ١٩٩١ ل ، ١٨٦ – ١٩٣
١٨ – هەر ئەوجێ یە ، ل ،٢٠٥ – ٢٠٨
١٩ – هەر ئەوجێ یە ، ل ٢٠٩

# ئـــەنجـــام

**فره گرنگه و واجبی ئەخلاقی یە کە لە بەرانبەر خەڵکدا راست و بێ خوارە پێچە بجولێ یەوە. جەوهەری ئەم راست ودروستی یەش لەوە دایە کە ئەگەر لە رابردوودا سەبارەت بە نە ناسینی بارو دۆخی خۆجێیی و دەرەکی، یا لە بەر لێکدانەوەی چەوت وبەر چاوتەنگی سیاسی، یا سەبارەت بە هێندێ بەرژەوەندی شەخسی ودەستەیی، یا لە بەر فیزو لە خۆ بایی بوونی بێجێ، تووشی هەڵە و هەڵدێران ونشست بووبی، زاتی ئەوەت هەبێ دان بە هەڵە و چەوتییەکاندا بنێی، راستی بە خەڵک بڵێی. کەم وکووڕی و ناتەواوی یەکان دانەپۆشی و لەم رێگایەوە قەرەبۆی هەڵەو ناتەواوییەکان بکەیەوە و رێگای راست و گونجاو بۆ چارە سەرکردنی مەسەلەکان بدۆزی یەوە.**

لێرەدا دەمەوێ بەگوێرەی بۆچوون وتێگەیشتنی خۆم بە چاوێکی رەخنەگرانە سەیرێکی پێرەو وپرۆگرامی پەسند کراوی کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دێموکرات بکەم و بە سەریدا بچمەوە. کە تێکۆشانی ئەم قۆناخە باسکراوەی حیزبی دێموکرات لە ژێر تیشک و رێنوێنی ئەم پرۆگرامە و بڕیارە پەسندکراوەکانیدا بەرێوە چوو.

لەگەڵ نووسینی بەرگی دووەمی پێداچوونەوە، بە پێچەوانەی ئەم بوچوون وبیرو رایەی کەبۆ داپۆشینی هەڵەو کەم وکووڕی یەکان لە نێو حیزبەکاندا کراوەتە باو، وەدەڵێن: «**نابێ هەموو شت بگوترێ، کاتی ئەوە نەهاتوە رەخنە بگیرێ چونکە دوژمن کەڵکی لێ وەردەگرێ و ئەم جۆرە بەهەت وپاوانە**، بەپێویستم زانی بەلێکۆڵینەوەی بابەتی بەسەرئەم باسەدا بچمەوەو لەروانگەی خۆمەوە

کەموکورییەکان بخەمەروو. زۆر بە راشکاوی وبەراستی دەڵێم کە ئەم نووسینە بەرلە هەموو کەس رەخنە لە خۆمە. چونکە تا کۆنگرەی چوارەمی حیزب بەشداری سیاسەت و کردەوەکانی حیزبی دێموکرات بووم و تاساڵی ١٩٧٨شەخسی دووەمی حیزب و جێگری سکرتێر بووم. ئەوەی کە ئێستا رەخنەی لێدەگرم و دەیخەمە بەرنەشتەری خامە، ئەو دەم لە گەڵ زۆریان موافیق بووم رەخنەم لە زۆرانیشیان گرتوە. ئەزموونی ئەو چەند ساڵەی دوایی و ئەنجامی ئەو سیاسەتە و لێکۆڵینەوەی رووداوەکان و دەر بازبوون لە قالبگرتوویی حیزبیی، گەیاندوومیە ئەم نەتیجەیە کە دارشتنی پێرەو وپرۆگرامی پەسند کراوی کۆنفرانس و کۆنگرەی سێ یەم وەلامدەری بەرژەوەندیی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران نەبون و لەگەڵ هەل ومەرجی خۆجێیی ودەرەکی کۆمەڵگای کوردستانی ئێران یەکیان نەگرتۆتەوە.. لەو ماوەیەشدا ئاورێک لە رابردوو نەدراوەتەوە و ناتەواویەکان سەنگ وسوکی یان لە گەڵ نەکراوە. رەنگە مەلا عەولای حەیاکی ئەم جارەش بڵێ:« ئەم نووسینە بۆبەد ناوکردنی من وقاسملوە » وەک لەسەر بیرەوەری یەکانم فەرموویەتی. بەلام با مەلاعەولا خۆی بە بەنساەۆتەی بارگینی دوکتورقاسملو وە هەڵناوەسێ. لام وایە بۆ هێنانە خواری شەخسیەتی دوکتورقاسملووی شەهید ئەوەندە بەسبێ کە مەلاعەولا بەدرۆ ئەسرینی بۆ هەڵبرێژێ و بوتی لێدروست بکات. کورد بەخۆڕایی نەیگوتوە: (پێم بڵێ دۆستت کێ یە، تا پێت بێژم خۆت کێی؟) نووسین وبۆچوونی من بە گشتی لە سەر سیاسەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانە کە خۆشم تێیدا بەشدار بووم و ئەوەی دەشینووسم چاوە روان نیم بەدڵی هەموو کەس بێت و دوور بێ لە رەخنەو کەم وکوری. بەوهیوایە بەشدارانی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستانی ئێران لەم قۆناخەی باسکراودا بەراستکردنەوەی هەڵەو ناتەواویەکانی ئەم نووسینە و بە خستنەرووی هێندێ کەلێن وقوژبنی باس نەکراو، بەرەی تازەپێگەیشتووی نەتەوەکەمان لە رووداوەکانی خەبات و تێکۆشان شارەزابکەن.

بابەربلاوتر مەسەلەکان شی بکەینەوە :

**یەکەم : ئامانجی نهایی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران.**

ئامانجی نهایی حیزب سۆسیالیزمی داد پەروەرانەیە.

جاری هەر لە سەرە تاوە گونجاندنی ئەو زاراوەیە مشکی تێدا کوژراوە و فێڵ لە خەڵک کراوە. چونکە سۆسیالیزم ئەگەر هەبێ، ئەوە داد پەروەرانەیە. ئەگەر نەشبێ هەروەک ئەزموونی وڵاتانی بەناو سۆسیالیستی نیشانیاندا، ئەوە دادپەروەرانە نیە و ناشتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدا. هەروەک ئێمەش لاسای ئەوانمان کردبۆوەو چونکە لە سەریشی ساخ نەببووینەوە، لەکۆنگرەکاندا جێگۆرکێمان بەم وشەوزاراوە دەکرد. ئێستا رەنگە بیر لەوە بکرێتەوە، حیزبێکی نەتەوەیی و نیشتمانی داخوا پێویستی بەوە هەیە بە لاسا کردنەوەو بۆ سیاسەت و بە خەیاڵ خۆی بەوشەی « سۆسیالیزم»ەوە ببەستێتەوە؟ چونکە بەرنامەی سۆسیالیستی بێ ئەملاو لا، بەرنامەی حیزبی چینایەتی یە و ئەگەر دەسەڵاتیشی گرتە دەست ئەوا دایدە مەزرێنێ. چەندەش سەر دەکەوێ ئەوە ئیتر مەسەلەیەکی دیکەیە. حیزبی دێموکرات نە حیزبێکی چینایەتی بوە و نە بڕوای بە خەباتی چینایەتی هەبوە. نە بڕواشی بە سۆسیالیزمەکە هەبوە، تەنیا بۆ راکێشانی خەڵک وبۆ سیاسەت سۆسیالیزمی کردۆتە(ئامانجی نهایی) کە سەردەمێک لە جیهاندا باو بوە. ئەوەتا دوکتور قاسملوی شەهید لە(کورتە باسدا) لاپەرەی دووەم دەنووسێ :«... ئەگەر بێتو گیروگرفتی کۆمەڵایەتی لەبیر بەرینەوە، بە ناچار حیزبێکی دیکە پێک دێ کە ئەم گیرو گرفتانە چارە سەربکا و بەشێکی زۆر لە زەحمەتکێشانی کوردستان بۆلای خۆی رادەکێشێ .» کەوابوو سەپاندنی سۆسیالیزم لە بەرنامەی حیزبی دێموکرات داهەر بۆسیاسەت و لاساکردنەوەی حیزبە کۆموونیستەکان بوە، بۆئەوەی (حیزبێکی دیکە لەکوردستان دروست نەبێ و زەحمەتکێشان بۆلای خۆ رانەکێشێ ) یان بۆ ئەوە بوە کە بە ناسیۆنالیست وبە لیبرالیست تاوانبار نەکرێ. هەر بۆیەش سۆسیالیزمی کردۆتە ئامانجی نهایی. لام وایە ئەم لاساکردنەوەش بۆ بزووتنەوەی ئێمە هیچ کەلکی نەبوەو بزووتنەوەی کوردیش لەکوردستانی ئێران خێری لێ نەدیوە.

**دووهم : دنیا بینی .**

• تیئۆری زانستی پێکەیشتنی کۆمەڵ» واتە( مارکسیزم ) کراوەتە ڕێنوێنی تێکۆشانی حیزبی دێموکرات. بەگونجاندنی ئەم دوو زاراوەیە لە پێڕەو وبەرنامەدا، حیزبی دێموکرات دەکەوێتە سەر ڕێبازی حیزبگەلی «کۆمونیست وسۆسیالیست». ئەوەش نەک حیزبە سۆسیالیستەکانی وڵاتانی سەرمایەداری کە حوکمیان بەدەستە، یا بۆدەسەڵات خەبات دەکەن. چونکە ئەوان هەر چەند کە ناوی (سۆسیالیستی)یان لە سەر خۆ داناوە، لە «تیئۆری زانستی پێکەیشتنی کۆمەڵ » پێڕەوی ناکەن و « سۆسیالیزمی دادپەروەرانە » شیان نەکردۆتە ئامانجی نهایی خۆیان.

حیزبی دێموکرات بە پەسندکردنی ئەم دوو بەندە لە پێڕەو وبەرنامەدا، خۆی لەریزی حیزبگەلی« نیشتمانی ونەتەوەیی» جیادەکاتەوەو دەکەوێتە ریزی حیزبە کۆمونیست وسۆسیالیستەکانی سەربەکەمپی( سۆسیالیزمی واقیعەن مەوجود )

وەک دەزانین لە کردەوەشدا حیزبی دێموکرات هەمیشە هەوڵی داوە لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی پێشوو و حیزبە کۆمونیستەکان پێوەندی بگرێ وخۆی بەلای ئەواندا بشکێنێتەوە. لەکن ئەندامانی حیزبیش هەمیشە تەبلیغات کراوە کەلەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی پێوەندی هەیە وشانازیشی پێوەکردوە. لەنووسین وئەدەبیاتیشدا بۆ دیفاع لە وڵاتانی سۆسیالیستی و دژ بەئیمپریالیزم هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە.

سەیرێکی سەروتاری دوو ژمارەی رۆژنامەی «کوردستان » کە لە ژێر سەرخەتی «یادی شۆرشی مەزنی ئۆکتۆبر » و« دامەزرانی یەکیێتی سوێتی سوسیالیستی نمونەیەکی نوێ لەپێوەندی ناونەتەوەکاندا »(١) بەقەڵەمی سکرتێری حیزب نووسراون. هیچ کۆمونیستێک ئاوا بەبەژن وباڵای شۆرشی ئۆکتۆبرو سیاسەتی سۆڤێتی لەمەڕ چارە سەرکردنی مەسەلەی نەتەوەیی ، هەڵا نەگوتوە.

لێرەدا وەنەبێ رەخنە لە نێوەرۆکی ئەم وتارانە وبۆ چوونی دوکتورقاسملو بگرم. نەک هەرئەوە بەڵکوو نووسینەکانم زۆر بەدڵ بوە وخۆشم لەم بوارەدا زۆرم

نووسیوە. لێکدانەوەی ئێستام ئەوەیە کە حیزبێکی نیشتمانی ونەتەوەیی بۆچی دەبێ خۆ بەوڵاتانی سۆسیالیستی یەوە هەڵاوەسێ، بێ ئەوەی هیچ دەسکەوتێکی لەم سیاسەتەدا هەبێ ویا بێ ئەوەی لە لای ئەم وڵاتانەوە پشتیوانی لێ بکرێ.؟

ئەم دارشتن و سیاسەتە لە نێو ریزەکانی حیزبیشدا نارەحەتی پێکهێناوە، ئەندامانی چەپ وخاوەن بیرو باوەری مارکسیستی وپێشکەوتوخواز ئەم رێبازەیان بەدڵ بوە. ئەندامانی دواکەوتوو وکۆنەپەرستیش کە بەبیستنی وشەی مارکسیزم وکۆمونیزم هەڵبەزیونەوە، لە بەر بێدرەتانی وبێ هەڵوێستی ، خۆیان بەحیزبەوە هەڵاوەسیوەو بەخەیالیش حیزبی دیموکراتیان بەحیزبێکی ناسیۆنالیست داناوە. بەم پێ یە حیزبی دیموکرات، مارکسیست و مائۆییست و کۆنەپەرست و ئەندامی سادەو ساکاری لەخۆدا کۆکردۆتەوە، بەڵام بەداخەوە لەم سیاسەتەدا سەرکەوتنی وەدەست نەهیناوە.

سەیر ئەوەیە سەرەرای ئەم خۆ بەلادا خستنەو هەوڵ وتەقەلای زۆر وخۆ قالب کردن بە مارکسیزم وسۆسیالیزم، وڵاتانی سۆسیالیستی نەپێوەندی یان لەگەڵ گرتوەو نەیارمەتی یان پێکردوە و نە بە حیزبی مارکسیستیشیان ناسیوە. ئەوەتا دوکتور قاسملوی شەهید لە نامەیەکدا بۆ نووسەری ئەم دێرانە دەنووسێ: « ... لە هەموو لایەکیش هەر بە ناسیۆنالیستمان دەزانن، بەتایبەت من، جا دەڵێم با کۆبوونەوە ساز بێ ئەو شتانە حەل دەکەین.» (٢ ). (مەبەستی کۆبوونەوەیە لەگەڵ رێبەرایەتی حیزبی تودە.)

باشە ئەگەر پیاوبزانێ لەهەموو لایەک هەر بەناسیۆنالیستی دەزانن، هیچ وڵاتێکی سۆسیالیستیش بەرەسمی ناناسێ و پێوەندیشی لە گەڵ ناگرێ، بۆچی ئەم وشەو زاراوانە دەخاتە نێو پێرەو وپرۆگرام وخۆیان پێدەبەستیەوە و لە لای ئەندامانی حیزبیش شانازی پێوە دەکات. ئەم پرو پاگاندە ناراستە وەها ریشە دا دەکوتێ کە تەنانەت مەلا عەولای حەیاکیش بۆ ئەندامانی حیزب دەیکاتە مێژوو ودەنووسێ:« ...حیزب هەم لە باری سیاسی و دیپلۆماسی... لە رادەی جیهانی داچەند هەنگاوێک بەرە وپێش چوو. بە تایبەتی پێوەندی لە گەڵ وڵاتانی

سۆسیالیستی کە ئەو دەم(بە هەق یا بە نا هەق)بایەخێکی زۆری پێدەدرا زۆر چوو بوە پێش و کەمتر جەژن و موناسەبەتێک لە سەفارەتخانەکانی ئەو وڵاتانە لە بەغدا پێک دەهات کە نوێنەرانی ئێمەی بۆ بانگهێشتن نەکرێن.(٣)

ئەوانەی کە(بانگهێشتنی موناسەبات بۆ سەفارەتخانە)بەپێوەندی سیاسی ودیپلۆماتی دەرخواردی ئەندامانی حیزب دەدەن، نە لە سیاسەت حاڵین ونەدەتوانن راستی بە ئەندامان و بە کۆمەڵانی خەڵک بڵێن، مەلاعەولا قەت ناڵێ ماوەی چەندین ساڵ حیزبی دیموکرات هەوڵی دا کە سکرتێری حیزب بۆ مۆسکۆ داوەت بکرێ و وتووێژی لە گەڵ بکەن، ئەم ناسۆسیالیستانە وەریان نەگرت، ئێستە بەودرۆیانە دەیەوێ چ بەئەندامانی حیزب بڵێ.؟

بە لێکدانەوەی ئێستام ریشەی ئەو کەم وکوری و سەر نەکەوتنانە دەگەڕێتەوە سەر رساخ نە بوونەوەی رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەسەر بیرو باوەر وسیاسەت و ستراتیژی یەکی روون، دارشتنی ئەو بیرەو وبەرنامەو بەرنامەو سیاسەتە، لاسا کردنەوەیەکی بێ ئەزموون و لێکدانەوەی خەڵکی تربوە. رێبەرایەتی حیزب ویستوویەتی بە گوێرەی کەش و هەوای زەمان خۆ بە مارکسیست وسۆسیالیست نیشان بدا تا لە خەڵکی دیکە وەدوا نەکەوێ، ئەگینا حیزبێکی نیشتمانی و نەتەوەیی کوردستانی ئێران، ئەگەر لەبەرخاتری حکوومەتی بەعس نەبێ، چکاری بەوەیداوە لە ئەدەبیاتی خۆیدا بەگژ صەهیونیەت دابچێ. بێ ئەوەی ئەو سیاسەت و بەگژداچوونە یارمەتیەک بە پەرەگرتنی بزووتنەوەی نیشتمانی بکا.

ئێستا من ئەم مەسەلەیە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و حیزبی دیموکرات و لە ئەنجامی ئەزموون وشیکردنەوەی رووداوەکاندا باس دەکەم، ئەگینا لە بواری بیرو باوەری شەخسی نەک هەر دژی بۆچوون وسیاسەت وهەڵوێستی ئەودەمی رێبەرایەتی حیزب نەبووم، بەڵکوو نووسین ولەقاودانی ئیمپریالیزم وئیستعمارم پێ ئەرکێکی پیرۆزو خەباتێکی شۆرشگێرانە بوە. ئێستاش کە ئەو هەموو گۆرانکاری یە لە پێوەندی نێونەتەوەیی ونەزمی جیهانیدا پێکهاتوە وزۆر کەسیش کیسەیان بۆ هەڵدروە و یا بۆی هەڵدەدرون، من لە سەر

ئەوباوەرەم کەخەسلەتی شەرخوزانە و داگیرکەرانە و ملهورانەی ئیمپریالیزم نەگۆڕاوە، تەنیا شێوەی بە کار هێنانی سیاسەتی ملهوری گوڕانی بە سەر داهاتوە. بە نەمانی کەمپی بەناو سۆسیالیزمی پێشوو هارتریش بوەو بۆتە کەڵەگای گەلانی جیهان. ئەو هەموو بەیت وباوەی بەناوی « دیموکراسی ومافی مرۆڤ » کە لە دەزگای تەبلیغاتی تەزمی نوێی جیهانیدا بلاو دەکرێتەوە، تەنیا و تەنیا بۆ پاراستن و پەرە پێدانی دەسەلات و بەرژەوەندی مۆنۆپۆلە چەوسێنەرەکانی سەرمایەداری یە.

ئێستا هەر بەشی ئەوەندە دەگرێ دانی بە خێر بە ئیمپریالیزم دابنرێ کە وا چەند ساڵە کوردستانی خواروی لەچنگ پەلاماری درندانەی لەشکری سەددام پاراستوەو بەشێکی نەتەوەکەمیانی لە راوتان و قەلاچۆ کردن نەجات داوە. هەرچەندە ئەوەش هەر لە چوارچێوەی بەرژەوەندی خۆیدا ئەنجامی دەداو لە بەرانبەر ئەو هەموو تاوانەی کە دژی نەتەوەی کورد لە مێژوودا کردویانە هەر هیچە ودەشبینین لەگەل ئەم پاراستنە بۆ قەلاچۆکردنی بەشێکی دیکەی نەتەوەکەمان لە باکوری کوردستان بەئاشکرا پشتی شۆڤینیستی تورک دەگرن و لە ئاست ئەو هەموو کوشتار و جینایەتە ی حکوومەتی تورکیا چاودەپۆشن.

لێرەدا ناکرێ ئەوەش بخرێتە پشت گوێ کە ئەوەی ئیمپریالیزمیش بۆ کوردی دەرێسێ، رێبەرانی کورد دەیکەنەوە خوری و بەلایەکی دیکەدا فیداکاری وخەباتی کۆمەلانی خەلک فیدای بەرژەوەندی دوژمنانی کورد دەکەن.( ئەمە خۆی باسێکی داخداری تایبەتی یە ، لەم بەستێنەدا جێگای نیە و رایدەگرم بۆ باسێکی دیکە.)

هەرلەسەر ئەم بنەمایەی خۆیە چەپ نیشاندانە کە تائێستا هەرکەسێ بۆتە سکرتێری حیزبی دیموکرات بەپێشکەوتوخوازوکۆنەپەرستەو(جگە لەئەحمەدتوفیقی رەحمەتی) هەوەلکاری شێواندنی مێژووی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردبوە لەکوردستانی ئێران و ویستوویە کۆمەلەی ژ .ک بە( ناسیونالیست و بەرچاو تەنگ و نەتەوە خوازو نادیموکرات و...) تاوانبار بکات. لەبەرگی یەکەمی پێداچوونەوەدا ئەم باسەم روون کردۆتەوە و بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە چەوتانە، نەخشی کۆمەلەی ژ.ک -م لەبوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد دا نیشان داوە.

## سێ یەم: قەوارە و دامەزراوەی حیزب

**مادەی حەوتەم - بناخەو بنچینەی دامەزراوەی حیزب سانترالیزمی دیموکراتیکە.**

خۆ ئەگەر ئەندامی ساکار و فیداکاری حیزبیش هەست پێ نەکەن. ئەمە حاشای لێ ناکرێ کە ئەم سیستەمە دامەزراوەیە قەوارە وساختمانی حیزبە گۆمونیستەکانە و داهێنەرەکەشی لینینە کەدوای شۆرشی ١٩٠٥ی روسیا بۆ بەربەرەکانی لە گەڵ مەنشەویک و کۆتای پێهێنان بە فراکسیونبازی نێوحیزبی هێنایە گایە و پاشان بوو بە کوتەکی دەستی ستالین بۆ پێشێلکردنی دیموکراسی نێو حیزب و دەرکردن وکوشتن و لە ژێر پێنانی هەموو چەشنە ئازادی یەکی حیزبی. حیزبە کۆمونیستەکانیش هەر بۆ ئەو مەبەست و بە لاسا کردنەوە کردیانە باو و ئامرازی دەستی رێبەرایەتی. دانانی ئەم قەوارەیە بۆ حیزبێکی نیشتمانی ونەتەوەیی نەک هەر لاسا کەردنەوەی حیزبە کۆمونیستەکانە( کە ئێستە زۆریشیان دەستیان لێ هەڵگرتوە) بەڵکوو بۆ خنکاندنی دەنگ و بیرو باوەری جیاوازە لە نێو حیزبدا. پێشگری یە لە هەڵدان وپشکوتنی بیری نوێ ودەربرینی رەخنەو بیری جیاواز وەک لە حیزبی دیموکرات دا خۆی نواندوە. مراندنی هەستی خۆ بە زات و شت زانینە لە بیرو مێشکی ئەندامانی حیزبدا.

سەیری ١٠٠ ژمارە رۆژنامەی کوردستان(ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) بکەین. یەک وتار ونووسینی جیاواز لە سیستەمی لەقالب دراوی حیزبی نایەتە بەرچاو. مناقەشەی دۆستانە و بابەتیانەی فیکری وسیاسی وئەدەبی تێدا نابینرێ. هەمووی بەبۆ چوونی لە قالبدراوی حیزبی رەشکراوەتەوە. لەکاتێکا حیزبی دیموکراتی قالب نەگرتوو دەبێ بکرێتە مەیدانی بەرفرەوانی دەربرین و بلاو

کردنەوەی بیرو رای سیاسی و بۆ چوونی جیاوازی ئەندامانی حیزبی. دەکری بلێین بەشێکی لە کەمدان و بادانەوەی ئەندامانی حیزبە کۆموونیستەکان، نەبوونی دەرفەتانی دەربڕینی بیرورای جیاواز و دم بە دمەی ئازادی نێو رۆژنامەکانی حیزب و قالب گرتویی هزر و مێشکی ئەندامانی حیزب بوە.

رۆژنامەی حیزبێکی نیشتمانی و نەتەوەیی و خۆ بە دیموکرات زان، دەبێ رۆژنامەیەکی گەلیی، جەماوەریی و دیموکرات بێ. هەموو شتێکی تێدا بنووسرێ، روشەنبیر و خوێندەوار بیرورای خۆیانی تێدا دەربڕن. ئەوە نەک هەر پایەو کەسایەتی رێبەرانی حیزب نایەنێتە خوار، بەڵکوو دەبێتە هۆی پشکوتن و پێگەیشتنی بیرو بۆچوونی جیاوازو حیزب کەڵکیان لێ وەردەگرێ. رێبەرایەتی حیزبێکی خاوەن پێشمەرگە و چەک و بەندیخانە و دەسەلات، بۆدەبێ لە وشە و بیر و هزر و نووسین بترسێ و بەتاوانی دەربڕینی بیرو را و نووسین بە پێچەوانەی بۆ چوونی رێبەرایەتی حیزب، ئەندام لەحیزب دەربکا.؟» ... لەدەورانی ئەحمەدتوفیقدا بە نێوی پێوەندی لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و برایم ئەحمەد وجەلال تاڵەبانی، کادری سیاسی حیزب چەک دەکران و دەردەکران، لە دەورانی دوکتورقاسملوی رەحمەتیشدا سەرێک بە نێوی بیرو بۆچوونی تودەیی وسەرێکیش بە نێوی دژی کورتەبڕس. کادری تێکەیشتوو، و پێشکەوتوو پاڵیان پێوە دەنراو دەردەکران و بریاری حیزبیان لە سەر دەدرا کە کوردستان بە جێ بێلن.»(٤)

## چوارەم : ستراتیژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

پرۆگرامی حیزبی دیموکرات، پەسند کراوی کۆنگرەی سێ یەم، مەسەلەی بنگەهی نەتەوایەتی خستۆتە پشت گوێ. ستراتیژی نەتەوەیی کورد. ئەگەر بارودۆخی خۆجێی وهەندەریش لەبەر چاوبگیرێ، دیسان ناکرێ لەهەل ومەرجی ئیمرۆی جیهاندا لە حکوومەتی فیدراڵی وفیدرالیزم کەمتربێ. دیارە ئەوە لانی کەمی مافی نەتەوایەتی یە. ئاشکرایە حیزبێکی سیاسی مافی ئەوەی هەیە لەبدە

وبستینەی سیاسیدا بە گوێرەی  بارو دۆخی رەخساو و بەرژەوەندی گشتی نەتەوەیی لە گەڵ مەسەلەکان مامڵە بکات. لە حیزبی دیموکراتدا، لەکاتی هەڵگرتنی دروشمی خود موختاری بیر لەوە نەکراوەتەوە لە ڕێژیمێکی دیکتاتۆری وەک حکوومەتی شاو ئاخوندی دا، خود موختاری نە وەر دەگیرێت و نە دەستەبەری پاراستن و مانەوەشی هەیە. خود موختاری راستەو راست پێوەندی بە بوونی ڕێژیمێکی دیموکرات  و پارێزەری مافی مرۆڤ و ئینسانییەوە هەیە. راستەکە حیزبی دیموکرات لە پرۆگرامی خۆیدا (مافی دیاری کردنی چارەنووسی) وەک ئامانجە گشتی یەکان گونجاندوە. بەڵام ئەم زاراوەیە ئەوەندە بەکێش وئاو هەڵگرە، بە زەحمەت ساغ دەبێتەوە. دوکتور قاسملوی شەهید لە وتارێکی خۆیدا دەنووسی :      « خود موختاریش جۆرێکە لە دیاریکردنی مافی چارە نووس». جگە لەوە پرۆگرامی خود موختاریشی گرێداوە بە(خەباتی دژی ئیمپریالیستی وڕێژیمی پاشایەتی شان بەشانی هەموو هێزە پێشکەوتوەکانی ئێران.) ئەگەر ئەودەم ئەم ستراتیژی یەمان پێ راست بوە و بە قولی بیرمان لێ نەکردۆتەوە ودوکتور قاسملوش لەسەر راوێژی ئیرەجی ئەسکەندەری هیناویەتە نێو حیزب وئێمەش رەخنەمان لێ نەگرتوە، ئەزموونی ٢٥سال خەبات وتێکۆشانی ئەم دواییە نیشانی داوە ئەم دروشمە هەرلەسەر کاغەز ماوەتەوەو هەزاران لاوی کورد لە پێناو ئەم دروشمە بێ ئایندەیەدا کراونەتە قوربانی. رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتیش وەک ئایەتی قورئان پێیەوە نووساوە وزاتی گۆرین وئاڵوگۆری تێدانیە. دنیا بەجارێک گۆڕاوە وتیئۆری وبیروراو بۆچوون گۆرانیان بەسەردا هاتوە، ڕێژیمی شاروخاوە وئیمپریالیزمیش لەئێراندا دەوری نەماوە، بەڵام گەلی کورد هەروا لەجێی خۆی چاوی بریوەتە خودموختاری. هێزە(دیموکرات وپێشکەوتو خوازەکانی )ئێرانیش شان بەشانی حیزبی دیموکرات بۆ وەدەست هێنانی ئەو مافە سەرەتاییەی کورد و ویستی حیزبی دیموکرات، هاوکاری یان نەکردوە. پتر لە ٢٥سال بەودروشمەوە نووساین وناکامی نەبوو. دنیا گۆرانی بەسەداهات وەک باسکرا، بەڵام رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات جارێک لەئاکام وبەرهەمی ئەودروشمەی نەکۆڵیەوە. مێشکی

خەڵكمان پڕكرد كە گۆیا(زارۆكی كوردیش خودموختاری دەخوازێ) لەجیاتی پێكهێنانی كۆبوونەوە وكۆنفرانسی میللی. نەك ( حیزبی) پلینۆم وكۆنگرەی حیزبی) بەستران ودوای هەموو كۆبوونەوەیەكیش نووسیمان(كۆبوونەوە بەسەركەوتنەوەتەواوبوو.) قەتیش ئەم سەر كەوتنەمان بەچاو نەدیت.

شانازیمان بەوەكردوە كەبەبۆنەی بەستنی كۆنگرە پیرۆزباییمان بۆدەنێرن ویا بۆ كۆنگرەی فلان حیزب داوەت كراوین. یا لاپەڕەی رۆژنامەمان بەهەواڵی سەفەرو سوڕانەوەی بێ نەتیجەی ڕێبەرانی حیزب رەش كردۆتەوە ویا شانازیمان بەبوونی ٤٠هەزار شەهید كردوە.

بەكورتی لەساڵی ١٩٧١وە، گونجاندنی(سۆسیالیزمی عادلانە)، پێرەوی لە(تیئۆری زانستیی پێگەیشتنی كۆمەڵ) ودانانی قەوارە و ساختمانی حیزب بە(سانترالیزمی دیموكراتیك) تەنیا لاساكردنەوەیەك بوەو حیزبی دیموكراتی لەگێژاوی نە(راست، نەچەپ )دالول داوە و جگە لە پاراستنی ناوی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران. هیچ دەسكەوتێكی بۆگەلی كورد بەدیاری نەهێناوە. دیارە ئەم بۆچوونەم بەومانایەنی یە لەفیداكاری وگیانفیدایی كۆمەلانی خەڵكی كوردستان وقارەمانەتی پێشمەرگەكانی حیزب وتێكۆشانی ئەندام وكادرەكانی حیزب كەم بكرێتەوە. بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردیش پاوان ومارە بڕانەی هیچ حیزب وكەسێك نیە، روناك بیرو نیشتمانپەروەرانی كورد لەهەرشوێن ولەهەر بارودۆخێكدا بن، نەك هەر مافی رەوای خۆیانە بەڵكوو ئەركی نیشتمانی وویژدانیانە كە بیروڕای خۆیان لەسەر هەموو مەسەلەكانی بزووتنەوە دەرببڕن وبنووسن ورەخنەبگرن وبەدڵسۆزی بەمەبەستی پێشكەوتن وروونكردنەوەی رووداوەكان خامەو هزریان بەكاربێنن.

## پێنجەم : خەباتی چەکداری وەک شێوەی ئەسڵی خەباتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دێموکرات،(خەباتی چەکداری) بەشێوەی سەرەکی خەبات دانا لە کوردستانی ئێراندا. ئەزموونی دوای کۆنگرە و بابەتیی باروودۆخی ڕووداوەکان بەجوانی نیشانیاندا کە ئەم ڕێبازە بنچینەیەکی پتەوی تیئۆری زانستی وکردەوەیی وبابەتی نیە. لە سەر بناغەی زرە شۆڕشگێڕی وتەوژمی مائۆییستی وبەبێ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندی بابەتیی وهەل ومەرجی خۆجێیی وجیهانی وبەراوردکردنی هێزو توانای خۆیی ودوژمن هاتە نێو ڕاپۆرتی کومیتەی ناوەندی ولە کۆنگرەشدا پەسندکرا..

بابەلێکدانەوەیەکی بابەتی و دوورلە دەمارگیری حیزبایەتی ئەم دروشم وڕێبازەی خەباتی چەکداری لێکدەینەوە. ڕەنگە زۆرکەسیش لای وابێ کەتازە ڕابردوو کورد گوتەنی نابێ وەدوای چووان بکەوی. بەڵام لەسیاسەت دائەم ڕایە لەوانەیەنەک هەرڕاست نەبێ، بەڵکوو دوورنیە زیانیش بەجوڵانەوە بگەیێنێ. خەباتی ڕزگاریخوازی و سیاسی و کۆمەڵایەتی وانیە کۆتایی بێ و پێویستی بە پێداچوونە وە شیکردنەوە و لێکدانەوەی چەندجارە نەبێ. ئەگەر ڕابردوو شی نەکرێتەوەو ڕاستی وچەوتی یەکان تەتەڵە نەکرێن ولێک جیا نەکرێنەوە و هەر بەسەر هەڵەو چەوتی یەکاندا بازبدرێ، ئەم کاروانە هەرلەڕێگای خۆیدا حاسیەدەبێ و دەوەستێ وناتوانێ بەرەو پێش بچێ وەک لە سەرجەم بزووتنەوەی کوردیدا بەگشتی دێتە بەرچاو. پتر لە٧٠ساڵە کورد هەر چیاو خەباتی چەکداری زانیوە وهەرتێنشکاوە.

کۆنگرەی سێ یەم لەکات وهەل ومەرجێکدا خەباتی چەکداری بە(شێوەی سەرەکی خەبات) دانا کە لە ئێراندا دەوڵەتی شاهەنشاهی لەو پەڕی هێزوتوانای ئەرتەشی دابوو، نەک هەرلە ئێران، بەڵکوو ببوە ژاندارمی ناوچەو بە ئاشکرا

کەڵەگایی لەو لاتانی دراوسێش دەکرد. ئیمپریالیزمی ئەمریکا نەک هەرپشتی حکوومەتی ئێرانی دەگرت، بەڵکوو ئێرانی کردبوە پێگەیەکی نیزامی پنتاگون . لە ئێران ئیسلاحاتی نیوەتدی زەوی کرابوو. دەستی زوڵم وزۆرداری دەرەبەگان تارادەیەک لە سەر وەرزێر ودیهاتیان کورت کرابۆوە. ئابووری بۆرژوازی خۆی خزاندبوە نێو دێهات ودەهات پەرەی دەگرت وتارادەیەکی زۆر خەڵکی پاسیف دەکرد بەتایبەت لەکوردستانی ئێراندا.

لەهیچ یەک لەناوچەکانی تری ئێران، نەحیزب ورێکخراوەی چەکدار هەبوون ونە خەباتی چەکداری لەگۆڕێدابوو. دەست وەشاندنی چاروباری فیداییانی خەڵک وموجاهیدین نە بەراپەڕینی چەکدار حیساب دەکراو نە بارودۆخی خەباتی چەکداری دەخوڵقاند. تەنیا بیری زرەشۆرشگێڕی مائۆییستی کەش وهەوای ناوچەی داگرتبوو.

راپەڕینی ٦٧و٦٨ی کوردستانی ئێران کە زۆر لەتوانای کاتی کۆنگرەی سێ یەمی حیزبی دیموکرات بە هێزتربوو، تووشی شکان هاتبوو، گەلێک لەرۆڵەکانی شۆرشگێڕی حیزبی دیموکرات شەهید کرابوون. لە ژێر تەئسیری راپەڕینی کومیتەی شۆرشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستانداو سەبارەت بە ناکۆکی لە گەڵ حکوومەتی بەعسی عیراق. کوردستانی ئێران کرابوە مەڵبەندێکی نیزامی وسەرانسەری کوردستان بە ئەرتەش و ژاندارم و جاشی چڵکاوخۆر ئاخنرابوو. جگە لەوە بزووتنەوەی چەکداریی کوردستانی عیراق ببوە پارێزەری سنوورەکانی دەوڵەتی شاهەنشاهی( ئەوەی بەدرێژایی مێژوو دەسەلاتداران ومێژوونووسانی شوڤینیزمی فارس وەک لەقەب ونازناز داویانە بەکورد« مرزدارانی غیورکرد» ونەوەی کەئێستا لەئاخری سەدەی بیستەمدایەکەتی نیشتمانی کوردستان بەئەرکی خۆی دادەنێ و سنوور بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران دەپارێزێ و تێکۆشەرانی حیزبی دیموکرات چەک دەکا و دەگرێ و رێگای هاتووچۆیان بۆوڵاتی خۆیان لێ دەبەستێ و سوپای پاسدارانیان لە نیزیک هەولێر دێنێتەسەر و...هتد) ئەندامانی حیزبی دیموکراتی دەگرت ودەیدانەوە بەحکوومەتی ئێران وبەم

حالەکوردستانی عیراق دەبوە پشتی جەبهە بۆ (شێوەی ئەسڵی خەباتی حیزبی دیموکرات )!!

لەمەیدانی جیهانیداحیزبی دیموکرات نەک هەربۆپشتیوانی خەباتی چەکدار، بەڵکو بۆ پشتیوانی ئەخلاقی ومەعنەویش لایەنگرو داشدارێکی نەبوو. بەلێکدانەوەی بارودۆخی باسکراو وگەلێک هۆکاری دیکە، داتانی خەباتی چەکداری بەشێوەی سەرەکی خەبات، بەبێ لێکدانەوەی بابەتی. بۆ(خودموختاری)هەرشتێک بوو بۆ رابواردنی کات هاتبوە سەرکاغەز وبنچینەیەکی زانستی وشۆرشگێرانەی نەبوو، ئاشکرابوو کەحیزبی دیموکرات ئەو هێزە نەبوو کەبتوانێ ئازادی بۆ سەرانسەری ئێران دابێن بکاو خودموختاری بۆکورد وەدەست بێنێ. ئەوەندە بوو بەقسەو بەنووسین خۆی دەگردە کەوا سووری بەرلەشکری وەدەیویست لە تەوژمی لافاوی مائوییستی زرەشۆرشگێری لە ناوچەدا دوا نەکەوێ. ئەوەش لە کردەوەو سیاسەتی رێبەرانی حیزبی دیموکرات دوای کۆنگرەی سێ یەمدا بەجوانی خۆی دەرخست وەک لە ناوئاخنی ئەم نووسراوەیەدا زۆرشت روون کراوەتەوە وکومیتەی ناوەندی چاوی لێقوچاندوە. حیزبی دیموکرات لە کۆنگرەی سێ یەمەوە تاراپەڕینی گشتی گەلانی ئێران نەیتوانی بۆلانی کەمی راپەراندنی ئەم دروشم وشێوەسەرەکی یە خەباتە هەنگاوێک هەڵێنێ.

دیارەکومیتەی ناوەندی لە سەر سەپاندنی ئەم دروشم و رێبازە یەکدەست نەبوو، هەبوون لە نێوکومیتەی ناوەندیدا کە ئەم دروشم وشێوە سەرەکی یان بە ئیحساساتی و لە جێی خۆنەبوو دادەنا وەک:( حەمەدەمینی سراجی) ناوبراو ئەزموونی راپەرینی ٦٧و٦٨ی بەدەستەوەبوو، هیچ ئالوگۆڕی سیاسی وکۆمەلایەتی ئەوتۆشی نەدەهاتە بەرچاو کە رێگا بدات حیزبی دیموکرات خەباتی چەکداری بکاتە (شێوەی سەرەکی خەبات). جگەلەوە سەیرکردنی دوو وتارو دوو بۆچوونی جیاواز لە رۆژنامەی کورد ستاندا، یەکەمیان بەناوی( رێگای شۆرشی ئێران) نووسینی کەریمی حسامی، ژمارە٧ ئوتی ١٩٧١، دووەمیان بەناوی( دیسان لە سەر رێگای شۆرشی ئێران) نووسینی دوکتورقاسملو ژمارە ٨ سپتامبری ١٩٧١بە

جوانی دوو بۆچوونی جیاواز لە سەر دروشم و شێوەی خەباتی چەکدارانەی حیزبی دیموکرات نیشان دەدەن. زۆربەی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لایەنگرانی شۆرشی چەکدار بەسکرتێریشەوە، یان خۆیان خزاندبوە ئورووپاو لە وێوە نەخشەی شۆرشیان دەکێشا، یان لە کاتی دەنگداندا بۆگەرانەوەی کوردستان بۆخەباتی چەکداری، جگە (لە رەسولی پێشنمازو هێمنی شاعیرو کەریمی حسامی) لە هەڵوێستی خۆیان پاشگەز دەبوونەوە.

رووداوەکانیش لەبەرچاومانن کەدیاری کردنی ئەم شێوە رێبازە بێ هەڵسەنگاندن وشیکردنەوەی زانستی، تەنیا راوی سەرکاغەزو خۆبە شۆرشگێر نیشاندان بوە. ئەگینا بەکردەوە هیچ دەسکەوتێکی بەرچاوی بۆ نەتەوەکەمان بەدی نەهیناوە. دوکتور قاسملوی شەهید لەنووسینێکی خۆیدا دەڵێ: (... پێشرەو بوون ورادەی شۆرشگێر بوونی هەموو حیزبێکی سیاسی لەوەدا دەردەکەوێ کە چۆن سەیری رابردووی خۆی وبە تایبەت هەڵەکانی خۆی دەکا. حیزبی شۆرشگێر نابێ لەوە بترسێ کە گۆیابە باسی هەڵەی رابردوو دوژمنی شاد دەبێ، یالە ئیعتیباری حیزبە کە کەم دەبێتەوە. بەپێچەوانە پێلێنان و راستکردنەوەی هەڵە و چەوتیەکانی رابردووی تێکۆشان ناو وناوبانگی حیزب لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا دەباتە سەرێ وجێدی بوون وبەر پرسی بوونی حیزبەکە نیشان دەدا...» (د)

دوکتور قاسملو دەربرینی ئەم بۆچوونە راستەی تەنیا بۆ رەخنە گرتن لە تێکۆشانی پێش پەنجا ساڵی رێبەرانی حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان هێناوەتە سەر کاغەز. ئەگینا قەت جارێک لەجاران لە سەر هەڵەو کەموو کورتیەکانی حیزبی دیموکرات لە سەردەمی رێبەرایەتی خۆیدا باسی نەکردوەو بە شەهامەتەوە خەڵکی کوردو ئەندامانی حیزبی روون نەکردۆتەوە، تۆ بڵێی لەم ماوەیەدا رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات توشی هیچ نسکۆو هەڵەو کەم وکوریەک نەهاتبێ.؟ وەڵامی ئەم پرسیارە با بۆ ئەندامانی ژیر وتێکۆشەر بە جێ بێڵین.

ئەم نووسین و پێداچوونەوەی من دەبێ لەبواری تیئۆری وبۆ چوونی بیروباوەرو ئەزموونی سیاسی یەوە چاو لێبکرێ. ئەگینا لەبواری ئەمەگداری ئەندامانی

کومیتەی ناوەندی و کادر وئەندامانی سادەوفیداکاری ئەوسای باسکراو لەم نووسینەدا، کە لەبارودۆخێکی دژواری مادی ومەعنەویدا لەعیراق دەژیان. سەری رێزونیحترام دادەنوێنم. هەموو ئەندامانی حیزبی دیموکرات لەم هەل ومەرجە دژوارەدا بەگیان ودڵ بۆ هەموو کارو فەرمانێکی رێبەرایەتی حیزبی ئامادە بوون. زۆریان چ ئەندامانی رێبەرایەتی و چ کادرو ئەندامانی ساکار. کارو فەرمانی پێویستیان راپەراندوە. بۆ پێوەندی وکاری حیزبی چوونەوە کوردستانی ئێران و لەم رێگایەدا توشی ئاستەنگی و نارەحەتی وچەرمە سەری بوون. سەبارەت بە پاراستنی رێ وشوێنی حیزبی و سەر دانەنواندنیان بۆ دەزگا شەیتانیەکانی حکوومەتی بەعسی عیراق توشی برسیەتی و دوور خستنەوەو بەندیخانەش هاتوون.

ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیە رەنگە بەدڵی زۆر کەس نەبێ. بەڵام ئەگەر راستی نەگوترێ وهۆی هەڵەو ناتەواویەکان شی نەکرێنەوە، دەرس لەرابردوو وەرنەگیرێ و تەنیا بە پێهەڵاگوتن و بە خۆ هەڵکێشان کاغەز رەشکرێتەوە، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەر بە سەر ئەم رەقە رێیەدا دەیکوتێ وجگە لە ماڵوێرانی زەحمەتکێشانی کوردستان و لە بەینچوونی نیشتمانپەروەران و ئاوارەیی و دەربەدەری کۆمەڵانی خەڵک و سەفەر و وتەردانی رێبەرانی حیزب چیدیکەی لێ پەیدانابێ. پێداچوونەوە ۱۹۹٦/۱۰/۱۰

لەکۆتاییدا پر بەدڵ سوپاسی کاک حەمەدەمینی سیراجی وکاک قەرەنی قادری وکاک ناسری ئیبراهیمی کاک ئالان دەرسیم وکاک ئاسۆس وکاک خەبات عارف وبرادەرانی دیکە دەکەم کە لەبواری رێنوێنی وراستکردنەوە وبۆچوونی بابەتی دڵسۆزانە وئامادەکردنی ئەم نووسراوەیە یارمەتیان داوم. باچاو لەم راستیەش نەقوچێنم کە بەشێکی زۆری نێوەرۆکی ئەم بەرهەمە لە بیرەوەریەکانیشمدا هاتوە و رووداوەکان لە وێدا ورد تر باس کراون. جا بە قەولی برادەرێک ئەگەر (وەرد) دانەوەش بێ، دیسان بۆ خۆم بە کارێکی بێجێی نازانم. هێندێ زەوی ئەوتۆ هەن ئەگەر دوو گاستەو سێ گاسنە بکرێن باشترە و بەرهەمیشی بەنرختر دەبێ،

تاخوینەرانی بەریز چۆنی لێک بدەنەوە ؟

سەرچاوەکان

١ - رۆژنامەی کوردستان. ژمارە ٢١ و٢٢ ، خەزەڵوەر وسەرماوەزی ١٩٧٢
٢ - نامەی دوکتورقاسملو بۆ نووسەر. کەریمی حسامی. لەبیرەوەری یەکانم بەرگی ٣ ل.٧٠
٣ - عبدالله حسن زادە ، نیوسەدە خەبات، ١٩٩٥، ل ، ٨٥
٤ - سەعید کاوە، سەرچاوەی پێشوو ، ل ، ٧٢
٥- عبدالرحمان قاسملو. چل ساڵ خەبات، ١٩٨٥، ل ، ٨٢

# پێڕستی ناوەکان

## پێرست ناوەکان

## پێرست ناوەکان

# پێرست ناوەکان

## پێرست ناوەکان

## پێرست ناوەکان

## پێرست ناوەکان

# ناوەرۆک

بەشی پێنجەم :



بەشی شەشەم:

## بەرهەمە نووسراوەکانی نووسەر

١- کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢- وەڵامێک، کوردی و فارسی
٣- ڕێنوێنی شەڕی پارتیزانی
٤- ل دەوری ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات کۆبینەوە
٥- رەخنە ولێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٦-چەن قسەیەک لە گەڵ خەبات
٧- کوردو فەرهەنگی بێگانە
٨- لێکۆڵینەوەی (کورتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم) کوردی وفارسی
٩- تایبەتی کۆنگرەی شەشەم
١٠- کۆماری دیموکراتی کوردستان یاخود موختاری
١١- یادی هێمن
١٢- لە پێناو چی دا؟
١٣- یادانەوە
١٤- کروکاش
١٥- سەفەر بۆ کوردستان
١٦- لەبیرەوەری یەکانم بەرگی: ١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩-١٠
١٧- پێداچوونەوە(مێژووی بزووتبەوەی نیشتمونیی لە کوردستانی ئێران)
١٨- حکایەت کردن یا نووسینی مێژوو
١٩- پێداچوونەوە بەرگی دووەم

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بەکوردی

١- دایک - ماکسیم گۆرکی
٢- ژیان و کردەوەکانی لینین
٣- یەفسانە کوردی یەکان - رۆدینکۆ
٤- زەوی پچوک - برێژنێڤ

٥- گۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە
٦- مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید
٧- پسای بنچینەیی ئابوری سۆسیالیستی
٨-حەمە چکۆل - ئینجە مەمەدی یاشار کەمال
٩- ئوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە- ژۆرژ پۆلیستەر
١٠- نامەی گوللە بارانکراوەکان
١١- رەوشی کوردون - مێژووی ئەردەلان و بابان
١٢- ئازادی یامەرگ- کازانتزاکیس
١٣- مەسەلەو زارگۆتنی لوری
١٤- رۆژەکانی ئێران - ئارچیبالد رۆزڤێلت.

ئەوانەی لە بەر دەست دان بۆ نووسین:

١- گەشتێک بەنێو بیرەوەری یەکانی نووسراودا
٢- کورد لەگەمەی دەوڵەتانی داگیرکەر وزلهێزەکانی ئیستیعماریدا.

## پەیڕەوی ناوخۆی

## حزبی دیموکراتی کوردستان

### بەندی یەکەم "چۆنیەتی حزب"

ماددەی یەکەم ـ

حزبی دیموکراتی کوردستان حزبێکی پێشڕەوی پێکهاتووە بەسەر ڕێبازی دیموکراتی وشۆڕشگێڕی ولە سەر هەڵوێستی چەپەکانی جیهانی لە بەرەی نەتەوەکانی سەربەخۆ وسەربەستدا قەراری گرتووە •

ماددەی دووەم ـ

ح • د • ك • لەو ئەندامانە پێکهاتووە کەهاوبیر وهاوڕێ وهاو ئامانجی خەباتی نەتەوایەتیین بۆ ئازادی کورد ورزگاری کوردستان لە ژێر دروشمی پەسندی "یەکیەتی • خەبات • سەربەخۆیی ردیموکراتی" وپرۆگرامی حزبکە پێکهاتووە لەهەمو چین وکۆمەڵی کورد بەتایبەتی وەرزێران ـ کرێکاران ـ پیشەوەران ـ ڕوناك بیران ـ بازرگانان وسەرمایەدارەکانی نیشتمانی دەتوانن بەشداری ڕیزی خەباتی حزبایەتی حزبی دیموکراتی کوردستان بن بەمەرجی قبوڵی پرۆگرامی حزب وگونجانیان لەناو چوارچێوەی مەرجەکانی ئەندامیەتی وبی وەفاداریان بە پێ ڕەوی ناوخۆی حزب •

ماددەی سێیەم ـ

بیر وباوەری ح • د • ك • جیهان بینی ( تئوری ـ ئیدئۆلۆژیە ) زانستی پێشکەوتوانەیە لەناو چوارچێوەی سوود و مەسڵەحەتی نەتەوایەتی ونیشتمانی دا وبی باوەری گۆڕین وگۆرانە لەناو شێوەی کۆمەڵایەتی وئابوری وسیاسی وە کە واتە ڕابەرین وشۆڕش بە ڕێبازێکی ئازادی ورزگاری نەتەوەی کورد یدەزانێن •

## ئەم ئاگاداریە ئەحمەد توفیق داویە بە مەلا مستەفا

ناوی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی
«حزبی دیموکراتی کوردستان»
(ئیران)

١- عزیز یوسفی — محکوم بە ئیعدام چاوەروانی حکم — ئەندامی کومیتەی مەرکەزی
٢- رحمت الله شریعتی 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃
٣- سید عبدالله اسحاقی — کادری مخفی و حرفەی کومیتە 〃 〃 〃 〃
٤- غنی بلوریان — محکوم بە ئیعدام چاوەروانی حکم — مشاوری کومیتەی مەرکەزی
٥- هاشم اقل الطلاب — کادری مخفی و حرفەی حزب 〃 〃 〃
٦- هاشم حسین زادە 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃 〃
کتر علی مولوی — محکوم بە حبسی ئەبەد 〃 〃
٨- قاسم سلطانیان — کادری مخفی و حرفەی حزب 〃 〃

---

ژمارەی ئەندامەکانی حزب ولایەنگرەکانی
جرست هەزار ئەندامە (۷۰۰ ئەندام)

---

## نامەی ئەحمەد توفیق بۆ ک.ن. حیزبی کۆمونیستی شورەوی

رفقای عزیز

کمیته مرکزی حزب کمونیست اتحاد شوروی ..

بدینوسیله سلامهای رفیقانه خود را تقدیم میداریم.

بدنبال نامه قبلی خود که بوسیله رفقای شما در اینجا (          ) درباره مسافرت هیئت نمایندگی حزب ما به اتحاد جماهیر شوروی سوسیالیستی تقدیم گردید، توضیح چند نکته را لازم میدانیم:

الف - اعضاء هیئت نمایندگی نامبرده بدین ترتیب است:

١ - قاسم سعید نیال -- (در ایران ملقب به کمال احمد)

٢ - سلیمان معینی

٣ - عبدالله اسحاقی (در ایران ملقب به احمد توفیق)

خواهشمندست در صحت ترتیب و صدور ویزا، بنامهای بالا باشند.

ب - خیلی بهتر و فرصت میدانیم ترتیب سفر هیئت همراه با استقبال رفیق ملا مصطفی بارزانی در اتحاد شوروی باشد.

ج - نسبت تنگی در مالی حزب محتاج به ترتیب رفع حوائج مالی برای این سفر و دیدار هستیم.

باسلام واحترام، از طرف
کمیته مرکزی حزب دمکرات کردستان.

(ناگروس)

٥٩٢ / ١/١١/١٩٦٠

# نامەی ئەحمەد توفیق بۆ ک.ن، حیزبی کۆمونیستی شورەوی

رفقای عزیز

کمیته مرکزی حزب کمونیست اتحاد شوروی.

صمیمانه تقدیم سلامهای رفیقانه.

بهترین تبریکات کمیته مرکزی حزب دمکرات کوردستان را بمناسبت جشن کبیر انقلاب -
اکتبر سرفصل تازه و بهترین زندگی زحمتکشان جهان و پیروزی و مظهر قدرت و عظمت شوراها
در دستگاه پوسیده تزاریسم و بورژوازی، بشما و بوسیله شما به همه ملل اتحاد جماهیر شوروی سوسیالیستی
تقدیم میداریم.

ملت کورد که ملت ستمدیده و محرومی است خیلی خوب عظمت و اهمیت انقلاب کبیر
آزادی و نجات ملل قهرمان شوروی را درک میکند. و بهمین مناسبت لازم میدانیم که شعف
و سرور ملت کورد در کوردستان ایران و بویژه اعضاء حزب دمکرات کوردستان را
بمناسبت حلول جشن کبیر انقلاب اکتبر منعکس و تقدیم داریم.

شادیم که اینک رهبر سازمان ملت کورد رفیق مصطفی بارزانی بنام ملت کورد در
جشن کبیر ملل شوروی شرکت میکند.

فرخنده باد جشن انقلاب کبیر اکتبر.

پیروزمند باد رژیم جماهیر شوروی سوسیالیستی دژ مستحکم و خلل ناپذیر.

درود ملت کورد به ملل اتحاد شوروی دوست باوفای همه ملل.

زنده باد صلح پایدار.

با تقدیم تبریکات و احترام: از طرف
کمیته مرکزی حزب دمکرات کوردستان.

[signature]

وزاگردس ٥

٣ ٩١ /١٠/١١/١٩٦٠

## رۆژنامەی کوردستان کە لە باکۆ چاپکراوە


# کوردستان

ئورگانی حزبی دیموکراتی کوردستان

ژمارەی ٢٣٦
چوارشەممو
١٧ رەشەمە ١٣٢٨

لە لایەن دەستەی نووسەران دەر دەچی


## وظیفەی ئەو لاوانەی کە پەیمانی گیان بازی و فیداکاریان دەگەل نەتەوەی کورد بەستووە

نەتەوەی کورد کوت و زنجیری دیلی و بەخسیرایەتی دە دەست و ملی کراوە. داگیرکەران بەهۆی هۆردو، سیاسەت، تبلیغاتی خرافات و موهومات، بەکرێ گرتنی خائنین و نهایەت بەهۆی عوامفریبی و ظاهرسازی لە هەزار لاوە جنگوریکیان لە کوردستان هەلچەقاندووە. بۆ کوژت کردنەوەی ئەو چنگورە کە ورزگار کردنی نەتەوەی کورد بەر لە هەموو شتێك زانست و تێگەیشتن و دنیابینیێکی زۆر لووك پێویستە.

بۆ بەرەبەرەکانی بە پیچەوانەی هۆردو و سیاسەتی داگیرکەران، زانستی شەر و سیاسەت و بۆ باندنی داری خرافات و موهومات، زانستی فلسفەی روناکی پێشکەوتوو و بۆ بەرەبەرەکانی بە پیچەوانەی ظاهرسازی و بۆ وەروخستنی خیانەتکارانی دوورو، زانستی منطقی بەبرشت و هێزی استدلال و توانایی فکر پێویستە. و نهایەت بۆ سەرکەوتن بە سەر دوژمنانی نەتەوەی کورد دا پێویستە رابطەیێکی صمیمانە و بێ لایەن دەگەڵ کۆمەڵی مەزنی کوردستان دامەزری.

کوردستانی کردووە. لە پاش سەدها و هەزاران ساڵ بەربەرەکانی، ئەوروو مێژوو حوکمان لێ دەکا کە دەبێ وریا بین و تێبکوشین و بە نرخی زیان و گیانی خۆمان، نەتەوەی کورد رزگار بکەین.

بۆ رزگار کردنی کوردستان و هەر وەها بۆ پاراستن و راگرتنی رزگاری کوردستان، حزبی دیموکراتی کوردستان پێداویستی بە بوو و کادر و افرادی زانا و زیرە، تەنا بە دەستی بەتاڵ و بێشکی هەتاڵ بەرەنگاربوون دەگەڵ دوژمن زۆرجار نتیجەی پیچەوانە دەدا.

**دە شرائطی ئەوروکەی کوردستان دا نەتەوەی کورد چاوی هەویا و هومێدی لە حزبی سەربەرزی دیموکراتی کوردستان و بە تایەتی لەو لاوانەیە کە لە وەلاتی شوروی خەریکی خوێندن و فێربوونی زانستن. ئەو لاوانە لە گەنجینەی رزگاری کوردستان دا هەریەك گەوهەریکی بە نرخ و بێ وێنەن..**

## بەختەوەری

(ماوەی ژمارەی پێشوو)

لە پاش شەری دوەمی دنیا تالە دەولەتێك کە توانیی برینەکانی کاتی شەری سارێژ بکاتەوە و ژیانی خۆش بۆ کۆمەڵی خەڵك دابین بکا، دەولەتی سوسیالیستی شوروی و اصولی حاکمیتی کۆمەڵایەتی بوو. تەنیا دەولەتی سوسیالیستی شوروی و دەولەتە کۆمەڵایەتیەکان کە بە سەر ریی و شوێنی سوسیالیزم دا دەروون، بە چاکی ژیانی خەڵکیان بۆ دابین کراوە.

لەو وەلاتانە دا اصولی جیرەبەندی بە جارێك لابردراوە، شتومەکی خواردەمەنی و صنعتی سیت بە دەوەری شەری چەندین بەرانبەر هەرزان کراوەتەوە و دە بەرانبەر دا حقوق و مانگانەی زحمتکێشان و کارکەران تابت ماوەتەوە.

لە پاش شەری تا ئێستا لە وەلاتی شوروی دا سێ جاران نرخی شتومەك شکاوە و هەموو جارێك نیزیکەی صد میلیارد روبل قازانج بە خەڵکی گەیشتووە. آخرین تێشکانی نرخ روژی هەوەڵی مانگی مارسی ساڵی ١٩٥٠ جێبەجێ کرا. دە نتیجە دا لە سەریك نرخی ژیانی روژانە نیزیکەی صدی ٢٥ بەرەوخوار هات. یانی اگر کەسێك دە پێش تێشکانی نرخ دا روژی بە صد روبل بەری دەچوو، ایستا بە حەفتا و پێنج روبل دابین دەبی.

اگر بە تایەتی لە مەبەستی تێشکانی نرخ ورد بینەوە، دەبینین کە واقعاً سوسیالیزم بانی بەختەوەری کۆمەڵی خەڵك. لە دامەزرانی سوسیالیستی دا تەواوی زەوی، صنایع، تجارت، سیاست و اقتصاد دە ژێر اختیاری دەولەت دایە و ملکیتی تایەتی دە گۆری دا نیە.

لە دامەزرانی سوسیالیستی دا محتکر و تاجری سودخور وسفە.





پێشەوا سەرکۆماری کۆماری کوردستان - ٣١-٣-١٩٤٧

محەممەد حوسێنخانی سەیفی قازی، وەزیری بەرگری کوردستان

بەداخەوە رەسمەکەمان وەگیر نەکەوت

سەدری قازی نوێنەری مەهاباد لەپارلمانی ئێران



سەرۆک بارزانی لەگەڵ میرحاج وعیزەت عەبدولعەزیزو سەرهەنگ غەفاری لەتاران



کابینان قادری ( کاحەمەدی سەروکانی: چەندرۆژ پێش وەفات – ١٩٨٠



رتبەرانی حیزب وحکوومەتی میللی کوردستان لەزیندانی ورمێ - ١١-٤-١٣٢٧



له راسته‌وه‌بۆ چه‌پ:

قادر شه‌ریف،ئه‌حمه‌د توفیق،سمایلی قاسملو، قاله‌ته‌گه‌رانی،که‌ریمی حسامی، مه‌لاباقی، ١٩٥٨



بارزانی ئەمر لە یەکێتی سۆڤیێتی



**لەراستەوە بۆچەپ: عبدولرەحمانی زەبیحی، محەممەدی شاپەسندی، حەسەنی قازلجی**



له راستەوە بۆ چەپ: مامۆستا هێمن، محەمەد مەولود، کەریمی حسامی
لە ئاهەنگی کردنەوەی پێکەری حاجی قادردا، ١٩٧٢



قادری ویردی ئەندامی کومیتەی ناوەندی ح.د.ک.ا. ١٩٧٣



کادروئەندامانی ح.د.ک.ا لە کلاسی کادر ١٩٧٢

# لە بڵاو کراوەکانی کتێبی ئەرزان

* دیوانی شێخ رەزا تاڵەبانی ئامادەکردنی: ئاسر ئیبراهیمی
* ژیان بەدەم زریانەوە (رۆمان) ئەیفور
* مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست گ. م. دنسکوی و نو. دنسکوی \ د. حوسێنی خەلیقی
* چەند نامەیەک بۆ تاراتنا بابو ناظم حیکمەت \ ئەژاد عەزیز سورمی
* دیوانی عبداللە میرزا پێنجوێنی
* تۆماری شێخ شەرزین (فیلمنامە) بەهرام بەیزایی \ ئەیفور
* ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا حوسێن محەمەد عەزیز
* کوردەکان حەسەن ئەرفەع \ حامید گەوهەری
* کوردایەتی و حیزبایەتی ..... حامید گەوهەری
* فۆنێمەکانی زمانی کوردی کەمال فوئاد
* هێمن و من هێرش
* کۆمەڵەشاخی بەرز ... (رۆمان) کوردان
* ئامانجی ئەدەبیات ماکسیم گورکی \ رحمان سۆفی
* قەفەسی زێڕین (چیرۆک بۆ منداڵان) \ یاسین قادر بەرزنجی
* خۆشکۆڵە نان فرۆشەکەم یوسف ئەحمەد
* نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی (کۆمەڵەی سێ وتار) \ ئەنوەری سوڵتانی
* بیرۆکەی ژین کاوە خوسرەوی
* نیاکان باستانی کرد در تاریخ و اسورەها ۲ جلد فارسی ج. مقرد
* زندەگی در باد (ژیان بەدەم زریانەوە) ئەیفور \ ژیلا فرجی
* سێکستن (چیرۆک بۆ منداڵان) ئولف ستارک \ د. حەمیدی ئەیموری
* فەلسەفە بە زمانی ساکار \ د. حوسێنی خەلیقی
* بناخەکانی رێبازی شۆڕشگێڕی \ د. حوسێنی خەلیقی
* سکاندیناڤیا، دوورگەیەکی تر لە بخوور هەلدرێن

* ٢١ دەستنووسی کوردی و فارسی سەبارەت بە کورد لە کتێبخانەی بەریتانیا \ تەنوەری سوڵتانی
* لەپەرۆشەکانی ژیان    مەسعود محەمەد
* پێدا چوونەوە بەرگی ٢    کەریمی حسامی
* کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی    دوکتۆر جەلیلی جەلیل

## لە لایەن (کتێبی ئەرزان)ەوە چاپ دەکرێ

* دستەودامانی نالی    مەسعود محەمەد
* کوردەکان، تورکەکان وعەرەبەکان    \حامید گەوهەری
* بنیاتی چێکەری (کۆنترین کتێبی زەردەشت)    \تەیفور
* دیوانی گۆران
* ئەوان مردن بۆ ئەوەی ئیمە بژین (کۆمەڵێک کورتەچیرۆک)    \بەدران ئەحمد حەبیب
* نامەکانی روانییوانێك و نامەکانی مەرگ ئارتور رامبو    \هەندرێن وعەبدالله رحیم
* فەرهەنگی منداڵ    \سیاوش گودرزی
* پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی    کەمال جەلال غەریب
* کەلەفەرهەنگی رووەکە ئابوورییەکان    کەمال جەلال غەریب
* فەرهەنگی وێنەداری گیانداره کان (کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی) کەمال جەلال غەریب
* ئەفسانەی ئەفراندن (شانۆ)    سادق هیدایەت    \سیمان
* ناوچەی کەرکووك و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە دوکتۆر نووری تاڵەبانی
* پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستانی عیراق    دوکتۆر نووری تاڵەبانی
* سی ساڵ خەبات ووڵاتێکی وێران    کرمانج گوندی
* برایانی شێردڵ    ئەسترید لیندگرێن \ ئاسی رەبلی
* دراسە عن اعمال کوران الادبیە    د. کمال معروف